# پوختەی بنەماکانی
# گوتاری سیاسی ئیسلامی

..........................................

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی هزیی و ڕۆشنبیریی خاڵ (٦)

- نووسینی: دکتۆر حاتەم ئەلمەتیری
- وەرگێڕانی: ئاسۆ هەورامی
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- نۆبەی چاپ: یەکەم، ساڵی ٢٠١٧ کوردستان
- چاپخانە:

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (        )ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

# پێڕست

# بەشی یەکەم
# بنەماکانی گوتاری سیاسی قورئانی

پێناسەی گوتاری سیاسی ئیسلامی: بریتیە لەو کۆمەڵە بنەماو وپرانسیپ و ئەحکامەی کە سیستمی حوکمی ئیسلامی لەسەر دادەمەزرێت. کاروباری پەیوەندیەکانی نێوان دەسەڵات و نەتەوە رێکدەخات، بەرپرسیارێتی و ماف و ئەرکەکان وەك ئەوەی لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەو رێڕەوی جێنشینی راشیدین هاتووە دیاریدەکات.

پێناسەی بنەماکانی گوتاری سیاسی

مەبەست لە بنەمای گوتاری قورئانی بەتایبەت لێرەدا بنەمای بیروباوەڕی و ئیمانییە، کە سیستمی سیاسی دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر دەوەستێت، کە ناتوانرێت لە بنەمای کردارەکی یاسادانانی تێبگەین، بەبێ تێگەیشتنی ئەو بنەما ئیمانییە بیروباوەڕیانە نەبێت، کە گوتاری قورئانی قۆناغی (مەککی) بانگەوازی بۆ دەکرد، پێش ئەوەی دەوڵەتی پێغەمبەری لە قۆناغی (مەدەنی) یان مەینەییدا درووست بێت.

بە (استقرا) و شوێنپێ هەڵگرتن ئەوەمان دەستدەکەوێت کە گرنگترین بنەما گوتاریە قورئانییە کان لەم دەروازەدا، گرفتێکی زۆری چارەسەرکردوە، وەڵامی کۆمەڵێك پرسیاری مەترسیداری داوەتەوە، ئەوەی کە مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو لە هەوڵی زانینی ئەو راستیانە بوە تیایاندا، لە هەوڵی گەیشتن بوە پێییان ئەوانیش:

ڕیشەو بنجی ئەم بوونە کامەیە؟ ئەی بنج و ڕیشەی مرۆڤ کامەیە؟ ئەی سروشتی پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کامەیە؟ چ مافێك هی ئەوانەو بەوان ڕەوایە؟ ئەی کامەیە ئەرکی ئەوان؟ ئەی بەکێ رەوایە ئەوەیان لە نێواندا بۆ دیاری بکات؟ بەچ مافێك حوکمیان دەکات؟ ئەی لەسەر چ بنەمایەك ملکەچ دەکەن بۆی و گوێڕایەڵی دەبن؟ ئایا لە جیاوازی بیروباوەڕی خەڵك و نەتەوەکان هەڵوێست چۆن بێت؟ کە بەدرێژایی مێژوو هەردەم جیاوازی لە نێوانیاندا هەبووە هۆکاربوە بۆ شەڕو توندوتیژی). ئایا هەڵوێست لەلایەن دەسەڵاتەوە چۆن بێت کە هەردەم ململانێ لەنێو کۆمەڵگەکاندا گوزەراوە لە بۆ پێگەیشتن بەودەسەڵاتەو کۆنترۆڵکردنی؟ ئایا هەڵوێست سەبارەت بەماڵو سەروەت و سامان چۆنچۆنی بنوێنرێت؟ کێ شایستەیەتی و مافیەتی کە دابەشی بکاتەوە؟ ئەی چۆن ببەشرێتەوە بەسەر مرۆڤەکاندا؟ ئەی مافە کۆمەڵایەتیەکان کامانەن لەمانەی هێنامانن؟

ئەمانە پرس و بابەتی سەرەکین (مرۆڤ– ئاین – دەسەڵات – داهات و دارایی)، کە هەردەم شەڕ لەسەر ئەمانە کراوەو ململانێکان لە دەورو خولی ئەمانەدا بوون و هۆکار و کێشەبوون بۆ کۆمەڵگەکان. بە هۆی هەڵوێست

وەرگرتن بۆ ئەمانە، تا بەئیمڕۆش ململانێی مرۆڤەکان بەردەوامە، بیری کۆمۆنیستی و سەرمایەداری و سۆسیالیستی و لیبراڵی و نەتەوەیی و فاشیی و نازیی..هەموو ئەو فەلسەفە سیاسیانەی تری دانراوی دەست و بیری مرۆڤ، هەموویان بەرهەمی جۆری وەڵامی ئەو پرسیارە مەترسیدارانە بوون، کێشە گەورەکانی مرۆڤایەتی، کاتێك هەوڵدراوە چارەسەری پرس و بابەتەکانی مرۆڤ، دەسەڵات، ئاین، داهات و سامان بکەن، پێشبینی ناکرێت ئەگەر رێنماییە ئاسمانییە کانی قورئان لەم پرسە سەرەکیانە نەبوونایە، پێشبینی ناکرێت ئەگەر پەرتوکێکی رێنماییکار بۆ درووستکراوەکان بەگشتی نەبوایە، پەرتووکی بەزەیی و میهر و رۆشنایی، وەك خوای پەروەردگار وەصفی دەکات (الر كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ)[١] هەروەها دەفەرموێت: (وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ)[٢] هەروەها ئایەتی (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ)[٣] پاشان سیستمێك بۆ ژیانتێدا ئەبێت، بۆ مرۆڤایەتی لە داد و ئازادی و یەکسانی، پاشان رێنمووی بکات بۆ سەر راستی لەهەموو ئەو کێشانەی کە مرۆڤایەتی بەدەستیانەوە دەناڵێنێت.

لەم دەروازەیەدا...رێنموونییە گوتاریە قورئانییە کان، بەم بنەمایانانەی خوارەوە بەرچاو دەخەین:

---

1 – ابراهيم، الاية (١)

2 – النحل ،الآية (٨٩)

3 – الانبياءالأية (١٠٧)

## بنەمای یەکەم: تاقانەزانینی خوا بە باڵادەست و یەکتا پەرستی

ئەمە بنچینەو بنەمای یەکەمی گوتاری قورئانییە، دەستەواژەی (لا اله الا الله)ی کردوەتە دروشم، ئەوەش بە باوەڕهێنان بە تاقانەیی خوای پەروەردگار، کە هیچ هاوبەشێکی نییە لە خولقاندن و موڵك و دەسەڵات و حوکم و ملکەچی و پەرستشدا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ)[1]

یەکتاپەرستی خوای گەورە کە هاوشان و هاوبەشێکی نییە لە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بەتاك بزانرێت، وەك ئەوەی کە یەکەم و تاکە دروستکەرو بەدیهێنەری سەرپاك دروستکراوەکانە، وەك پێغەمبەری خوا بە مەعازی کوڕی جەبەلی فەرموو لەکاتی ناردنی بۆ یەمەن– کە ئەوکات جولەکەو فەلەی تیادا دەژیا– (تۆ دەچیتە لای گەلێك کە خاوەنی کتێبی ئاسمانین، ئەوەی یەکەم شت لەسەرتە بیکەیت بانگکردنی ئەوانە بۆی یەکتاپەرستی و بەتاقانەزانینی خوای باڵادەستە– کە ئەمەیان ناسی– لە ریوایەتێکدا کە گوێرایەلی ئەمەیان بوون–پێیان بڵێ کە خوای گەورە لەهەر شەوورۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون، ئەگەر ئەم نوێژەشیان بەجێهێنا، پاشان پێیان بڵێ کە خوای پەروەردگار زەکاتی لەسەر فەرزکردوون ساڵانە لە ماڵ و سامانی دەوڵەمەندەکانتان وەردەگیرێت و دەدرێتەوە بە هەژارەکانتان، ئەگەر گوێڕایەڵی ئەوەش

---

[1]– محمد، الاية (١٩)

بوون، لێیان وەربگرەو خۆت دوور بگرە لە بردنی باشترینی داهاتیان، خۆت بپارێزە لە داوا و نزای ستەملێکراو، چونکە لە نێوان ئەوو خوادا پەردەیەك بوونی نییە)[1].

ئەو پەیوەندییە تۆکمەیەی نێوان یەکتاپەرستی و دەرکردنی زەکاتی ماڵ و پێدانی بەهەژاران و دوورکەوتنەوە لەستەم، بەڵگەیەکە بۆ ناسین و تێگەیشتن لە یەکتاپەرستی و لە ئامانج و خواستی یەکتاپەرستی، کاتێك لەماڵ و سامان زەکات و باج وەردەگیرێت ئەمە بەگوترە ناکرێت مەگەر پاش ئەوەی بڕیار بە ملکەچی دان بەو لایەنەی کە فەرمانی کردوە بە دەرکردن و دانی، کە دیارە پاشاو سەرکردەکان ئەم بریارە دەردەکەن، کە پێویستە یەکەم شتێ کە داوای ئەوان بێ و بانگەوازی بۆ بکەن دروشمی یەکتاپەرستی و یەکلابوونەوە بۆ ملکەچیکردن بۆ ئەو بەتەنها– کە ئەمە دیارترینی ڕوکاری پەرستشە– بۆ خوای پەروەردگار کە هیچ هاوەڵ و هاوەبەشێکی نییە، لێرەوە ملکەچی بۆ هیچ (قەشە– راهیبێك) و نەبۆ هیچ پاشایەکی وەها کەخۆی وەك خوا یان لە جیاتی خوا داناوە، و حوکمی بەندەکانی خوا دەکات و ئەوانیش ملکەچی بۆ دەنوێنن، ماڵ و سامانەکانیان پیدەدەن، لەمەشەوە پاشا و سەرمایەدارەکان بەو ماڵ و سامانە زیادەرەوی و ملهوڕی لەسەر حیسابی هەژارو نەدارەکان و چەوساوەکان دەکەن.

---

[1]– رواه البخاري، ج ٧٣٧٢و ١٣٩٥و ١٤٩٦، ومسلم، ج١٩.

دیاره هێنانی بابەتی دەرکردنی زەکات لە ماڵ وسامانی دەوڵەمەندەکان و دانی بەهەژارەکان و هەڵگرتنی ستەم لەسەر چەوساوەکان پاش یەکتاپەرستی، ئەمە بۆخۆی مەبەست و ئامانجی کۆتایی یەکتاپەرستی بەیان دەکات. کە بریتیە لە ئازادکردنی خەڵك و بەدیهێنانی دادگەری، سەرخستنی چەوساوەکان، هەڵگرتنی ستەم و چەوسانەوە، کە کردەو پیشەی دیکتاتۆر و ستەمکارەکان بووە هەردەم، بەردەوام کێشمەکێشیان لەگەڵ خوادا کردووە لەوەی کە ئەوەی پەیوەستەو تایبەتە بە خوای گەورە و لەموڵك و دروستکراو بەندەکانی، بۆ دەست بەسەراگرتنی و هەوڵی دانە پاڵ خۆیانیان داوە. پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) دەفەرموێت: ئەوەی یەکتاپەرستی خوای ئەنجامدا و کافر بوو بەوەی کە بەندایەتی جگە بۆ ئەو بۆ کەسی تری نەکات، ئەوە ئیتر گەردن و خوێنی حەرامە و حیسابی لەسەر خوای باڵادەستە) لە ریوایەتێکی تر (ئەوەی بڵێت لا اله الا الله و کافر بێت بە هەر پەرستراوێك غەیری خوای گەورە....)[(١)]

هەروەها دەفەرموێت (وکفر بما یعبد...) ئەمە کوفر بەهەموو پەرستراوێك بێجگە لەخوا دەگرێتەوە، جا ئەگەر پاشاکان بن یان بتەکان، یان (قەشە و راهیبەکان) بن گەر ئەو ملکەچییەیان چوبێتە کەستەکی هاوەڵ دانانەوە بۆ خوای گەورە وەك ئەوەی ئێمە لەدواییدا ڕوونی دەکەینەوە،

---

[1]– رواه البخاري و مسلم ج٢٣.

**– راستەقینەی یەکتاپەرستی بەتاقانەراگرتنی پەروەردگارو هاوەڵدانەنانە بۆی، لە هەموو ئەو شتانەی کە خۆش دەویسترێن و هی ئەوە، ئەوەش بە باوەڕبوون بە تاقانەبوونی لە:**

**١– لە بابەتی خالقیەتی خوای پەروەردگار (أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالأمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ)[١] واتە هیچ کەس لە پرسی خولقاندن و فەرماندا نییە، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: (ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ.)[٢].**

**٢– پەروەردگارێتی، کە دەفەرموێت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)[٣]یان دەفەرموێت: (رب الناس)[4]، یاخود دەفەرموێت: (قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ)[٥].**

**٣–لە ئولوهیەت وەك دەفەرموێت: (الله لا اله الا هو)[٦].**

**٤– لە صیفاتی کەماڵی و تەواوی ناوەپیرۆزەکانیدا کە دەفەرموێت: (وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)[٧]**

---

[1]– الأعراف ٥٤.

[2]–الأنعام ١٠٢، غافر ٦٢.

[3]– فاتحة، ٢.

[4]– الناس، ١

[5]– انعام ، ٦٤

[6]– البقرة ، ٢٥٥

[7]– الأعراف، ١٨٠

٥- لەموڵكداری، كە دەفەرموێت (ذلكم الله ربكم له ملك لا إله إلا هو فأنى تصرفون).[١] هەروەها دەفەرموێت: (مَلك الناس)[٢]، وەك چۆن هیچ پەرستراوێك بۆ مرۆڤەكان شایەن بەپەرستش نییە بێجگە لە (الله)، بەهەمانشێوەش موڵكدارێكی راستەقینە بێجگە لەو بوونێكی نییە.

٦- فەرمانڕەوایی، كە دەفەرموێت: (ان الحكم الا لله)[٣]، هەروەها دەفەرموێت: (وله الحكم)[٤] واتە فەرمانرەوایی راستەقینەو هەمیشەیی بۆ كەسێكی تر بوونی نییە.

٧- ملكەچی و گوێڕایەڵی، كە دەفەرموێت (وما ارسلنا من رسول الا ليطاع بإذن الله)[٥] واتە تەنها بە فەرمانی ئەو هیچ هاوبەشێك لەو نێوەندەدا بوونی نابێت.

٨- پەرستش، كە دەفەرموێت: (وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ)[٦]، هەروەها دەفەرموێت: (فإياي فاعبدون)[٧].

---

1 - الزمر، ٦

2 - الناس، ٢-٣

3 - الانعام ٥٧ ، يوسف ٦٧

4 - النساء ٦٤

5 - القصص، ٧٠

6 - الأنبياء، ٢٥

7 - الغنكبوت ،٥٦

٩- ترس و بیم و خەشیە وەك دەفەرمویت: (وإياي فارهبون)[١]، پێشخستنی بەرکار لێرەدا بەسەر کارو بکەر لەزمانی عەرەبیدا بۆ (قەتیسکردنە، واتە بێجگە بۆ ترس و بیمیان بۆ کەسی تر نەبێت، هەروەها دەفەرموێت: (إنما هو اله واحد فإياي فارهبون)[٢]، وەدەفەرموێت (فلا تخشو الناس واخشوني)[٣]. هەروەها لە ئایەتێکی تر کە دیارترین خەصڵەتەکانی یەکتاپەرستانی بڕوادار دەستنیشان دەکات دەفەرموێت: (ولا يخشون أحدا الا الله)[٤].

هەروەها لە دیاریکردنی خەصڵەتی خەڵکانی بڕواداردا دەفەرموێت: (من آمن بالله واليوم الآخر واقام الصلاة وآتى الزكاة ولم يخش إلا الله)[5].

چەند شتی تریش لە وێنەی یەکتاپەرستی و ماناکانی کە خوای پەروەردگار واجبی کردوە لە سەر بەندەکانی کە بەیەکتایی لەو بوارەو پەرستشەدا بیهێڵنەوە هاوبەشی بۆ پەیدانەکەن و هاوبەشی بەبنبڕی تیایاندا حەرامکردوە، کە دەفەرموێت: (ولا يشرك بعبادة ربه أحد)[٦]، هەروەها لە بابەتی فەرمانبەرداریدا فەرمویەتی: (ولا يشرك في حكمه أحدا)[٧]، هەروەها لە بواری یاسادانانیدا (أم لهم شركاء شرعوا لهم من

---

[1]-البقرة، ٤٠

[2]- النحل، ٥١

[3]- المائدة ٤٤

[4]- الاحزاب ، ٣٩

[5]- التوبة ،١٨

[6]- الكهف ، ١١٠

[7]- الكهف ، ٢٦

الدين مالم يأذن به الله)[1]، هەروەها سەبارەت بە موڵکداریێتی دا دەفەرموێت: (وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ)[2]، هەروەها سەبارەت بە گوێڕایەڵ بوون و ملکەچی بۆ ئەرێ و نەرێکان دەفەرموێت: (وان اطعتموهم انكم لمشركون)[3].

لێرەوە ئەوەمان بۆ رۆشندەبێتەوە کە خوای گەورە لەهەموو ئەوانەی هێنامانن و واتای یەکتاپەرستی و راستەقینەیی یەکتاپەرستیان تێداهەیە، یەکتاپەرستی زاتی خۆی تیایاندا بەواجب زانیوە لە سەر بەندەکانی، وەك چۆن حەرامیشی کردوە هاوبەشی دانان لەو مانایانەی کە ئاماژەیان پێکراوە.

واتای (اله- پەرستراو) لەگوتاری قورئانیدا:

دیارە لە بەیانی ئەو گوتەیەی کە وشەی یەکتاپەرستی تیادا خول دەخوات بە رێژەی نەهی (لا إله) و بە ئەرێنی و جێگیربوون بە (إلا الله) لە چەندین ئایەتدا کە لە ڕووی ئاماژەو دەلالەتەوە بڕاوەن، لەوانەش بەم مانایانە دێت:

١- پەرستراوی بێجگە لە خوای پەروەردگار: جا ئەگەر ئەو پەرستراوە بەردێك بێت یان مرۆڤێك بێت، کە دەفەرموێت: (قال ياقوم اعبدوالله مالكم من اله غيره)[4]، هەروەها دەفەرموێت: (ذلكم الله ربكم لا

---

1- شوراء ،٢١

2- اسراء ١١١، الفرقان ،٢

3- الأنعام ، ١٢١

4- الأعراف٥٩ و ٦٥و ٧٣ و ٨٥.

اله الا هو خالق كل شيء فاعبدوه)[١]، هەروەها دەفەرموێت: (مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ)[٢]، هەروەها هاوبەشیکارانی عەرەبی کاتیێ دەبوونە بەربەست لەبەردەم بانگەوازی یەکتاپەرستیدا دەیانوت: (أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ)[3].

٢- شوێنکەوتنی مرۆڤ بێجگە لەخوا: جائەگەر ئەو شوێنکەوتراوە پاشایەك بێت یان زانایەك بێت یان هەواو ئارەزوو بێت، وەك خوای گەورە لەوبارەوە دەفەرموێت: (اتبع ما أوحي اليك من ربك لاإله إلا هو وأعرض عن المشركين)[٤]، واتە شوێنکەوتراوەکانی بێجگە لەخوا.. وەك لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: (اتبعوا ما انزل اليكم من ربك ولاتتبعوا من دونه أولياء)[٥]، هەروەها دەفەرموێت: (وَمَا يَتَّبِعُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ شُرَكَاءَ ۚ)[٦].

خوای پەروەردگار هەموو شوێنکەوتراوێکی بێجگە لەزاتی خۆی بە هاوڵ و هاوبەش هەژمار کردووە و ئەوەی شوێنی کەوتووە بە هاوەڵدانەرو هاوبەشیکار لەپەرستشدا داوەتە قەڵەم. کە دەفەرموێت: (إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا وَرَأَوُا الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ

---

[1]- الأنعام ١٠٢.

[2]- الأنبياء ٢٥.

[3]- ق ٥.

[4]- لأنعام ١٠٦.

[5]- الأعراف ٣.

[6]- يونس ٦٦.

الآسْبَابُ)[١]، هەروەها دەفەرموێت: (وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا رُسُلَهُ وَاتَّبَعُوا أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ) [٢]، دیارە وشەی (جبار) لە زمانی عەرەبیدا بەواتای پاشای ستەمکاردێت، وەك لەم ئایەتەدا هاتبوو، هەروەها دەفەرموێت: (فَاتَّبَعُواْ أَمْرَ فِرْعَوْنَ وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ)[٣] هەروەها دەفەرموێت (وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ)[٤].هەروەها دەفەرموێـت: (وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا)[٥]. دیارە قورئانی پیرۆز ئەوەی رایگەیاندوە کە شوێنکەوتراو ی جگە لەخوا بە پەرستراو لە لایەن شوێنکەوتەوە هەژمارکراوە، وەك هاتوە (أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا)[٦] وەهەوەرها هاتووە: (أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ) [٧]، قورئان تەنانەت هەواو ئارەزووی بە پەرستراو ناوهێناوە کاتێك مرۆڤ دەکەوێتە شوێن هەواو ئارەزووی بێجگە لەخوای گەورە شوێنی ئەو دەکەوێت.

٣- گۆێڕایەڵیکراوی بێجگە لەخوا: وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ

---

[1] - البقرة ١١٦.

[2] - هود ٥٩.

[3] - هود ٩٧.

[4] - القصص ٥٠.

[5] - مريم ٥٩.

[6] - الفرقان ٤٣.

[7] - الجاثية ٢٣.

لَمُشْرِكُونَ)[١]. هاوەڵدانان بۆ خوا پێچەوانە و دژی یەکتاپەرستیە، شەیاتین لەم ئایەتەدا شەیاتینی مرۆڤە، ئەوانەی (مجادەلە–چەلەحانێ) دەکەن لەسەر ناهەقی و لەوانە سەرکردەو زاناکان، ئەمە بەڵگەیە لە سەر واجب بوونی بەتەنها گرتنی خوا لە هەرجۆرە ملکەچیەك، خوای گەورە دەفەرموێت(وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا)[٢]،

هەروەها سەبارەت بە ئامانجی سەرەکی ناردنی پێغەمبەران ئەوەبووە کە لەلایەن مرۆڤەکانەوە گوێڕایەڵی و ملکەچی تەنها بۆ ئەو ئەنجامبدرێت و فەرمانبەرداری تەنها فەرمانەکانی ئەو بکەن.کە دەفەرموێت: (وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّهِ)[٣].

لێرەوە گوێڕایەڵ بوون بۆ پێغەمبەر کاتێ بەواجب هاتوە بەو پێیەی واتای گوێڕایەڵی خوای گەورە دەدات، چونکە پێغەمبەر بانگەشەکارە بۆ دینەکەی خواو لەلایەن خوای گەورەوە دەست نیشانکراوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت(مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ)[٤]، جیاوازی نێوان گوێڕایەڵ بوون و شوێنکەوتەبوون ئەوەیە کە گوێڕایەڵ بوون هەردەم لە پێگەی نزمەوە بۆ پێگەی باڵا دێت، وەك چۆن فەرمانی بکەو مەکە لە سەرەوە بۆ خوارەوە لەخۆ دەگرێت، وەك گوێڕایەڵبوونی

---

[1]– الأنعام ١٢١.

[2]– الأحزاب ٦٧.

[3]– النساء ٦٤.

[4]– النساء ٨٠.

خەڵکان بۆ پاشاکان، کەچی بابەتی شوێنکەوتەیی جۆرێك گشتی بوونی لەمە زیاتر تیادەردەکەوێت، کەدەکرێت بە بێ هەبوونی فەرمانداری راستەوخۆیی یان هەبوونی دەسەڵاتێکی دیار، وەك شوێنکەوتنی پیاوانی ئاینی، یان شوێنکەوتەیی هەواو ئارەزوو، یان شوێنکەوتەبوون بۆ هەنگاوەکانی شەیتان.

٤- بەحاکمزانین و ملکەچبوون بۆ حوکمی غەیری خوا: وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا ۚ)[١]، هەروەها دەفەرموێت (إن الحكم إلالله)[2]، هەروەها دەفەرموێت (يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا)[٣] هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: (ولا يشرك في حكمه أحدا)[٤] هەروەها لە خوێندنەوەی حەوتینەدا (قراءة سبعية): (ولاتشرك في حكمه أحدا) هاتووە.

ئەمانە هەمووی جەختکردنەوەن لەسەر ئەوەی کە (پەرستراو- اله) بەرەهایی بەمانە دەوترێت، هەرجۆرە بەخەرجدانێکی گوێڕایەڵی بۆ بێجگە لەخوا دەگرێتەوە، وەك خوای گەورە لە چیرۆکی فیرعەون دا دەفەرموێت: (وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي)[٥]،

---

1- الأنعام ١١٤.

2- يوسف ٤٠.

3- النساء ٦٠.

4- الكهف ٢٦.

5- القصص ٣٨.

هەروەها بە موسای وت (قال لئن اتخذت إلها غيري لأجعلنك من المسجونين)[1]، دیارە ئەوەی فیرعەون دەیوست لە موسا و نەوەکانی ئیسرائیل بەتەنها بریتی بوو لە گوێرایەڵبوونی ئەوان بۆی و دەرنەچوون لە فەرمان و دەسەڵاتی ئەو، ئەوەش بۆ خۆی بریتی بوو لە بابەتی پەرستراوێتی و فیرعەون دەیویست بۆ خۆی ئەنجام بدرێت، دیارە ئەوەش ئەو پەروەردگاربوونییە بوو کە فیرعەون بۆ خۆی بانگەشەی بۆ دەکرد و دەیوت (أنا ربكم الأعلى) واتە گەورەو پاشایەکی وەها کە پێویستە لەسەر هەموان گوێرایەڵو ملکەچی فەرمانەکانم بن، ئەوە ئەو جۆرە پەرستراوێتیە بوو کە نەوەکانی ئیسرائیل تێیکەوتبوون، وەك ئەوەی کە پیاوە خاوەن پێگەکانی خێڵەکەی فیرعەون دەیانوت: (فقالوا أنؤمن لبشرين مثلنا وقومهما لنا عابدون)[2]. واتە ملکەچ بوون وگوێرایەڵی کردن و دەرنەچوون لە هەرفەرمان و دەسەڵاتێکی ئەوان.

ئەوەی پشتگیری ئەمە دەکات خوێندنەوەی (وَقَالَ الْمَلأُ مِنْ قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَى وَقَوْمَهُ لِيُفْسِدُوا فِي الآرْضِ وَيَذَرَكَ وَآلِهَتَكَ )[3]، دیارە پێشتر فیرعەون و گەلەکەی خوایەکیان هەبوو دەیانپەرست، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە ئەو پەرستشەی کە فیرعەون بۆ خۆی بانگەشەی بۆ دەکرد و ئەو پەروەرێنییە ی کەبۆخۆی داتاشیبوو بریتی

---

[1]– الشعراء ٢٩.

[2]– المؤمنون ٤٩.

[3]– الأعراف ١٢٧.

بوو لە شوێنکەوتنی فەرمانەکانی، ملکەچبوون و گوێڕایەڵیکردنی فیرعەون و دەرنەچوونە لە سنووری دەسەڵاتی ئەو.

ئیبنو جەریری تەبەری لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەڵێت: (خوای گەورە دەفەرموێت: فیرعەون و دارودەستەکەی دەیانوت: (ئێمە بڕوا بە مرۆڤێکی هاوچەشنی خۆمان بهێنین) و ببینە شوێنکەوتەی ئەو کاتێك (گەلەکانی ئەوان) لە نەوەکانی ئیسرائیل، (بۆ ئێمە بەندایەتی دەکەن)، بەمانا ئەوان ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەوانن، فەرمانەکانی ئەوان بێ مشتومڕ جێبەجێدەکەن، و ئەوان منەتبارو سەرنەوی ئەوانبوون، عەرەب بۆ هەرکەسێك کە ملکەچی پاشا بێت بەبەندایەتی ناوی دەبات، هەرلێرەوەیە وتراوە بە گەلو دانیشتوانی حیرە (بەندەکان– العباد) چونکە ئەوان سەرنەویو ملکەچی پاشاکانی عەجەم بوون). ئەمەش دەقێکی ڕۆشنە کە واتای بەندایەتی و بەندایەتیکردن لە زمانی عەرەبیدا ئاشکرا دەکات، هەرکەسێك سەرنەوی پاشاو سەرۆکەکان بێت و ملکەچی و گوێڕایەڵیان بۆ بنوێنێت ئەوە بەندایەتی و بەندایەتی بۆ دەکات. ئیسلام بۆ خۆی بۆ یەکتاپەرستی هاتووە، بۆ ئەوەی بەندایەتی تەنها بۆ خوا بکرێت، پاشان مرۆڤ بەدووربگرێت لەهەموو جۆرە بەندایەتیەك بۆ غەیری خوا، لەوانەش ملکەچی و گوێڕایەڵبوونی سەروك و پاشاو پیاوانی ئاینی.

## جیاوازی له نێوان بیژەی (اله-خودا) و(رب- پەروەرێن)

گوتەی: (اله–خودا) و(رب– پەروەرێن) دیارە دەبین لە ڕووی سیاقەوە جیان و جیادەبنەوە، بەڵام لە ڕووی واتای گشتیەوە یەکدەگرنەوە، هەرچەندە لەسیاقدا جیان و بۆ هەریەکەیان واتاو مانایەکی تایبەت بەخۆی هەیە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (قل اعوذ برب الناس..) لێرەداپەروەرێن بریتیە لە سەردار ئەوەی کە فەرمانداری و سەرکردایەتی کردنی لایە، بەڵام خاوەن موڵك و پاشا بە موڵکبوون و دەسەلات و ملکەچی و گوێڕایەڵی پێکردنی ئەوانی تری بۆ ئەوە، پاشان (اله–خوا) ئەوەیە کە نزاو وپارانەوە لێدەکریٚ وپەرستشی بۆ دەکرێت ئەوە پەروەرێن و هەم خوداشە لای ئەوانەی کە ملکەچ وگوێڕایەڵی بۆ دەکەن. وە ئەوەش لەو ئایەتەی خوای گەورە کەدەفەرموێت سەبارەت چۆنییە تی گوێڕایەڵبوونی شوێنکەوتوانی ئاینی فەلەو جولەکە بۆ پیاوە ئاینییە کانیان (اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أربابا من دون الله)[1]، هەروەها خوای گەورە لەسەر زاری پێغەمبەر یوسف دەفەرموێت: (أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ)[2]، هەروەها دەفەرموێت: (قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ)[3]، هەروەها دەفەرموێت: (وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا الْمَلَائِكَةَ

---

[1]– التوبة ٣١.

[2]– يوسف ٣٩.

[3]– آل عمران ٦٤.

وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ)[1]. خوای گەورە هەموو ئەوەی کە دەپەرسترێت لەبری ئەو، یان نزاو پارانەوەی لێدەکریٚ بیجگە لەو، یان ملکەچی و گوێرایەڵی بۆ دەنوێنرێت بیجگە لەو، یان شوێنی دەکەون فەرمانبەرداری دەکەن بێجگە لەو بە پەروەرێن و خودا ناوی دەهێنێت، ئەوەش لەم شێوازانە پەیڕەو دەکات ئەوە بەهاوەڵدانەرو هاوبەشیکاری خوای گەورە لە پەروەرێنی و پەرستشدا دێتە هەژمار.

بەم پێیەش چەمکی یەکتاپەرستی هەموو جۆر و شێوازێکی پەرستراوێتی رەتدەکاتەوە، هەروەها هەموو جۆرە پەرستش و پەروەردگاریەك بۆ غەیری خوا جا ئەگەر بۆ مرۆڤ بێت یان بۆ بەردێك بێت یان بتێك بێت یان هەرچی تر.. رەتدەکاتەوە. پاشان یەکتاپەرستی هەموو شێوازێکی کاری پەرستش بۆ غەیری خوا لە پەرستشی وەك کڕنوش و یان ملکەچبوون و یان شوێنکەوتەیی یان فەرمانبەرداری، پووچەڵدەکاتەوە، خوای پەروەردگار بە تاقانە دەگرێت بەوەش هەموو پەرستراوەکان بەرکەناردەخات و هیچ پەرستراوێك بە راستەقینە نازانێت بێجگە لە خوا(الله)، پاشان هەموو ئەو خەصڵەت و صیفاتە جوان و باڵاو شایانەنەی کە پەیوەستن بە زاتی ئەوە ناوە پیرۆزەکانی ئەوەوە، لەهەموو پەرستراوێکی تر خاڵیان دەکاتەوەو تەنها بە شایانی زاتی پەروەردگاریان دەزانێت. – وەك دواتر بە درێژی باسیان

---

[1]– آل عمران ٨٠.

لێوەدەکەین– بۆ ئەوەی رێگری بکرێت لەهەرجۆرو شێوازێکی هاوەڵدانان و بتپەرستی و نەفامیەك.

دیارە زۆرترینی قورئانی پیرۆز باسی یەکتاپەرستی و تاقانەراگرتنی خوای گەورە لە بابەتی خولقاندن و موڵکدارێتی راستەقینەو فەرمانداری و گوێڕایەڵیکاری، سەرداری و پەرستش، دەکات.. بۆ ئەوەی بەرەنگاریی پاشاو ستەمکارەکانی پێبکرێت کە لەو شتەی لەخەلق و درووستکراوەکانی لەبەردەستیانەو خەریکی بڵاوکردنەوە جۆرەکانی هاوەڵدانان و پەرەدانن پێی لەکۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتیدا. لەدیارترینی ئەو شێوازی هاوەڵدانانەو ئەو جۆرە بڵاوەی لە نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیە بریتیە لەو خۆسەپاندنەی دەسەڵاتدارو پاشایانی سەر ئەم زەمینە بەوەی خۆیان بەپەروەرێن و خۆیان بەخاوەنی ئەو سەرزەمینە دەزانن، کە دەسەڵاتێکی ڕووکارو کاتیان بەسەریدا شکاوەو خەریکی بە بەندەکردن و چەوساندنەوەی درووستکراوەکانی خوان. لەبەر ئەوە قورئان یەکەم پەڕەی خۆی بە ئایەتی (الحمد لله رب العالمين. الرحمن الرحيم. ملك اليوم الدين. إياك نعبد وأياك نستعين)[1]، بەسەر ئەوان و هەموو مرۆڤایەتیدا دەکاتەوە. کە ئەم ئایەتە پیرۆزانە جەخت لەو تاقانەیی و یەکخواناسین و کردەی یەکتاپەرستیە بۆ خوا دەکاتەوە لەکاری پەروەرێنی خوای گەورە بۆ هەموو جیهانیان، جەخت لەسەر ئەوەدەکاتەوە کە زاتی پەروەردگار بەتەنها ئەو خواو سەردارو

---

[1]– الفاتحة ٢–٥.

پەروەرێنی مرۆڤایەتیە بەحەق.و هیچ پەروەرێنێکی تر جگە لەو بەراستەقینەیی بوونێکی نییە، وەك چۆن هیچ خاوەنێکی راستەقینە جگە لەو بۆ دروستکراوەکانی بونێکی نییە بەوەی کە زاتی ئەو خولقێنەری دروستکراوەکانە، و لەهەمانکاتدا رۆزیدەرو بژێوی پێبەخشی راستەقینەیانە، هەربۆیە زاتی بێگەردی خۆی بەتەنها لیپێچینەوەکاری ئەوانە بەوەی کە لەرۆژی پاداشتدانەوەو دواییدا پاداشتیان بداتەوە لە سەر ئەو کارو کردەوانەی ئەنجامیانداوە. نەوەك کەسێکی تر خۆی بکاتە بریکاری ئەو، چونکە هەموو بریکارە ساختەکان لە پاشاو خاوەن موڵکە ڕوکاریەکان بەندەی ئەون و هیچ شایستەی هاوبەشیەك نین لەگەڵ زاتی ئەوپەروەردگارە.بۆیە رەوانییە هیچ ملکەچیەکیان بۆ ئەنجام بدرێت چونکە ئەوانیش مرۆڤن وەکو ئەو، هیچ سودو قازانجێکی راستەقینەییان لەدەستدا نییە وەك چۆن بەهەمانشێوەش لە پرسی چاکەو خراپەدا مەگەر ئەوەی خوای گەورە ویستی لەسەر بێت.

وەك چۆن خوای پەروەردگار کۆتایی قورئانی بە وتەی پیرۆزی خۆی لە سورەتی (الناس) هێناوە دەفەرموێت: (قل أعوذ برب الناس. ملك الناس. اله الناس)[1] تا ئەو راستەقینەیە کە دەستی پێکرد لەیەکەم ئایەت و پەرەی قورئاندا کە راگەیاندنی پەروەرێنی راستەقینەی زاتی پاکی خۆی بوو، هەروەها راگەیاندنی سەرداری و خاوەنداری

---

[1]– الناس ١–٣.

راستەقینەیی خۆی بوو بەوەی کە ئیتر تەنها زاتی خۆی شایەن بەملکەچی و فەرمانبەرداری و شوێنکەوتنە بەتەنها.. لەهەمانکاتدا هەر ئەو پەرستراوی راستەقینەی مرۆڤەکانە و شایەن بەپەرستشە دووپات بکاتەوە.

بۆیە ئەمە وەڵامدەرەوەی ئەو پرسیارە یە کە هەڵگری کێشەیەکی سەرەکیە و ڕووبەڕووی کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی لەو ڕۆژەوەی درووستبوون بوەتەوە:

ئایا دەبێت کێ پەروەرێن و کێ سەرداری راستەقینەی مرۆڤەکان بێت شایەنی ملکەچکردن بن بۆی؟

ئایا خوا خاوەن و پاشای راستەقینەی مرۆڤەکانەو شایەنی فەرمانڕەوایی کردنی راستەقینەیە بەسەریاندا؟

ئایا کێیە ئەو خواو پەرستراوەی خەڵکان کە شایستە بەپەرستشەو شایەنی ملکەچی و ترس و بیم و خەشیەو خواست بەوە؟

بۆیە قورئان جەخت لە سەر ئەو سێ راستیەی کە هاوەڵدانانی تیادا بەدەردەکەوێت کردوەتەوە، پاشان لەو سێیەدا زیاتر کەخلیسکان تیایدا باوەو کاریگەری لەسەر مرۆڤەکان توند و ترسناکە، بەتایبەتی لە سەردەمی نەزانی نەتەوەکانی تری غەیرە عەرەب بەتایبەتی فارس و رۆم. لەوانەیە دەستپێوەگرتنی لایەنگرانی گوتاری سوڵتانی بۆ بەرپەرچدانەوەی گوتاری قورئانی بە ئایەتە هاوشێوەو فرەواتاکانی قورئان کەدەفەرموێت: (قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ

الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء)[١]، ئەوە بەیانی ڕێپێدراوبوونی هەبوونی پاشاکان دەکات، و خوای گەورە خۆی ئەو موڵك و پایەیەی پێبەخشیون.

دیارە ئەوە هیچ ئاماژەو بەڵگەیەك لەوەدا نییە بۆ ڕەواییدان بەو بانگەشەو پروپاکەندەیەی پاشاکان بۆ موڵك و دەسەڵاتەکەیان دەیکەن. بەڵکو ئەوە وەك ئەو وتەیەی تری خوای گەورەیە کە دەفەرموێت: (یبسط الرزق لمن یشاء ویقدر)[2]، هەروەها دەفەرموێت: (ویرزق من یشاء وهو القوي العزیز)[٣]

دیارە خوای پەروەردگار ڕۆزی بەهەموان دەبەخشێت، جائیتر ئەوانە کەسانی چاکەکاربن یان خرابەکار، ئیماندار بن یان کافر، هەروەها ئەگەر بەشێوەیەکی حەڵاڵ یان حەرام بەدەستی بخەن یان نا، لەبەرئەوە خوای گەورە ڕۆزی خۆی بۆ بەندەکانی مسۆگەر دەکات بەپێی ئەوەی دەیەوێت، ئەمەش بەڵگەو حوججە نییە لەسەر زەواییدان بەوەی کە ستەمکارێك ڕۆزیەکەی چۆن وەدەستدەخات و ئەوماڵەی دەستی دەکەوێت بە ئەو حەڵاڵ نییە.. بەڵکو ئەوە جۆرێکە لە ئیبتیلاو بەڵا لەلایەن خوداوە بۆ ئەو، جۆرێك لە پایەدان و بڵندکردنەوەیەتی بۆ بەندەکەی، خوای گەورە هەر لەوبارەوە سەبارەت بە قارون دەفەرموێت: (إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِنْ قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لَا تَفْرَحْ

---

[1]– آل عمران ٢٦.

[2]– الإسراء ٣٠.

[3]– الشورى ٤٢.

إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ، وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الآخِرَةَ وَلَا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الآَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ، قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِنْدِي أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِنْ قَبْلِهِ مِنَ الْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا وَلَا يُسْأَلُ عَنْ ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ، فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ، وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا وَلَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الصَّابِرُونَ، فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الآَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُ مِنْ فِئَةٍ يَنْصُرُونَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُنْتَصِرِينَ)[١].

ئاشكرایه ئه‌وه خوای گه‌وره خۆی ئه‌و موڵك و ماڵ و سامانه‌ی پێبه‌خشیوه، دیاره قارونیش ئه‌و ماڵ و سامانی به‌شێوه‌یه‌كی حه‌رام و هۆكاری ناشه‌رعی ده‌ستیكه‌وتبوو، بۆیه به‌وشێوه‌یه‌ش موڵك و ماڵ ده‌به‌خشێته ئه‌وكه‌سه‌ی خۆی ویستی له‌سه‌ر هه‌یه، هیچ به به‌ڵگه‌بوونێك له‌مه‌دانییه بۆ پاشاو ده‌سه‌ڵاتداره‌كانی ئه‌م زه‌مینه، به‌وه‌ی ئه‌گه‌ر یه‌كێك له‌وان خوای گه‌ره موڵك وماڵێكی به‌هه‌ق به‌دادگه‌رایی پێبه‌خشیبێت، وه‌ك ئه‌و پێغه‌مبه‌رانه‌ی كه خوای گه‌وره گێڕاونی به‌جێنشین و وه‌ك پاشایه‌ك به هه‌ق، وه‌ك داوود و سوله‌یمان، كه خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: (و قتل داود جالوت وآتاه المك)[٢]، هه‌روه‌ها

[1]– القصص ٧٦.

[2]– البقرة ٢٥١.

دەفەرموێت: (يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الآرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ۚ)[1].

دیارە لەنمونەی ئەو پاشایانەش کە خوای گەورە موڵك و دەسەڵاتی پێبەخشی و ستەمی لەنەفسی خۆی کرد، بەوەی کە کۆنترۆڵی خەڵك و ئازارو چەساندنەوەی دەکردە گیانیان، بەمەش تاقیکرایەوە و بوویە شوێنگەی تاقیکردنەوە، وەك ئەوەی کە حاڵی فیرعەون و نەمروود بوو، کە لەبارەیانەوە خوای گەورە دەفەرموێت: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ)[2]. هەموو پاشا و دەسەڵاتدارێك لەم سەرزەمینە بە موڵەت و ڕێپێدراوی خوای گەورە دەبێتە دەسەڵاتدارو خاوەن موڵك- وەك ئەوەی لە نەوەکانی ئیسرائیل و پێغەمبەراندا وەك داوود و سولەیمان، ئەوانەی دوای ئەوان پاشایەتیان کردو لەسەر شەریعەتی ئەوان ڕۆیشتن، یان پاشا هەبوو لە سەر سروشی پێغەمبەران کرایە پاشاو دەسەڵاتدار، نمونەش (طالوت)ە کە خوای گەروە دەفەرموێت: (وقال نبيهم ان الله قد بعث لكم طالوت ملكا)[3]، وەك ئەوەی خەلیفەکانی موسڵمانانیش، بەوشێوەیە بوو، کە گەل بە شێوەی ڕاوێژ (شورى) و ڕەزامەندی هەڵیاندەبژێرن، بە پێی شەریعەتی پێغەمبەر- ئەوەی بەوشێوەیە هەڵئەبژێرێت پاشا و فەرمانڕەواییکی بەهەقە، دیارە

---

[1]- ص ٢٦.

[2]- البقرة ٢٥٨.

[3]- البقرة ٢٤٧.

پاشایانی سەر ئەم زەویە هەرکامیان بەوشێوەیە دیاری نەکرێت ئەوە پاشایەکی نارەواو خۆسەپێنەرە، چەوسێنەرو ستەمکارە بەرامبەر دروستکراوەکانی خوا، خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەر ابراهیم (إني جاعلك للناس إماما قال ومن ذريتي قال لا ينال عهدي الظالمين)[1]

ئیبنوکەسیر لە تەفسیرەکەیدا بۆ ئەم ئایەتە دەڵێت: (سوفیانی کوڕی عویەینە وتی: کەسی ستەمکار نابێ ببێتەپێشەوا، هەروەها ئیبن خویزی میندراد وتویەتی: هەرگیز ستەمکار نابێت ببێتە جێنشین و نابێت ببێتە فەرماندار)[2]، لەبەرئەوە شەریعەتی پێغەمبەر بە جێنشینی هاتووە، هەموو جۆرە پاشایەتیەکی بەلاوە پووچەڵە هەر لە (فیرعەونی و قەیسەری و کیسرایی...هتد زەوی هی خوایە، بۆیە پاشایەتی راستەقینەش هەر بۆ خوایە، ملکەچی بۆ خوایە، فەرمانداری بۆخوایە، سەرداری هەربۆ خوایە، خولقاندن هەربەئەوە، هیچ پەروەردگارێکی تر جگە لەو نییە و هیچ پاشایەکی راستەقینە جگە لەو بوونێکی نییە، بەڵکو ئەو یەکتاپەرستی و تاقانەیی دانانەی خوا لەگەڵ ئەو نزمی وسوکیەی پاشاکان دژو پێچەوانەدەبێتەوە، وەك لە کتێبی (لسان العرب) هاتوە: (بەندایەتی (عبادە) لەزمانەوانیدا بەواتای ملکەچی و گوێرایەڵی دێت، هەرکەسێك خۆی بچووککردەوە بۆ پاشاکان ئەوە بەندایەتی بۆ دەکات) ئەوەتا لەسەر زاری دارودەستەکەی فیرعەوندا هاتوە (أنؤمن لبشرين مثلنا وقومهما لنا عابدون).

---

[1]- البقرة ١٢٤.

[2]- تفسير ابن كثير ٢٢٧/١.

جیاوازی گوێڕایەڵیکردنی نێوان جێنشین (خەلیفە) و گوێڕایەڵکردن بۆ پاشاکان (مەلیك)، ئەوەیە کە گوێڕایەڵی جێنشین بەپێی شوراو راوێژ و رەزامەندی و هەڵبژاردن دێت بە بێ ئەوەی هیچ پەستان و ناچاریەك لە ئارادا هەبێت، وەك شوێنکەوتن و گوێرایەڵیەکەی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی دەبێت، لەکاتێکدا گوێرایەڵی پاشاکان بەشێوەیەکی ناچاریە و سەپێنراوە بەسەر خەڵکیدا بەزۆر لەسەر بنەمای ئەو ماف بەخۆدانە نارەوایەی کە بەشێوەی پشتاو پت یان هێزی خۆسەپێنەر داوایدەکات، لەسەر خەڵکیش پەستان درووستدەکات تاوەکو گوێرایەڵی و ملکەچی بۆ بنوێنن، ئەوەش وەك وتمان گوێرایەڵبوون و ملکەچیەکەی بۆ ئەو هێزو ملهوڕی و خۆسەپاندنییە یانەوە، ئەوەیە پەرستراوێتی و بەخوازانین لەزمانی عەرەبیدا، وەك ئەوەی لەسەرزاری فیرعەنەوە هاتوە بە پێغەمبەر موسی دەڵێت: (لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَهًا غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ...).

ئیبنو خەلدون ئاماژە بەدیاردەی پەرستش و بەندایەتیکردنی پاشاکان دەکات، کە خۆی لە ملپێکەچکردنی خەڵکان دەکات بۆ داواو خواستەکانی خۆیان بەتەنها، ئەوەتا لە (موقەدیمە) مێژوویەکەیدا دەڵێت: لەسروشتە ئاژەڵیەکەی مرۆڤدا هێزی درووستکەری فیزو خۆبەگەورەگرتن و لەهەمانکاتدا ملکەچی هەیە، کە پاشا لەرێگەی بەداری پێنەکردنی ئەوانی تر لە دەسەڵات و قۆرخکاریەوە دەست بەرامکردن و راهێنان درووستکردنی ملکەچی و شوێنکەوتن و فەرمانبەرداری کردنی ئەوانی تر دەکات، لێرەوە فەزای دروستکردنی بەندایەتی و ملکەچیەکی وەها

دەخولقێنێت کە لەگەڵ ئەو بارودۆخە سیاسیەی بگونجێت کە یەك دەسەڵاتداری باڵادەست و تاکرەوی و ملکەچی مێگەلیانەی هەموان بۆ ئەو تیایدا بێتەوە، دیارە گەندەڵی و خراپەکاری بە پێی ئە جۆرە حوکمرانییەی لەلایەن پاشاکانەوە دەسەپێنرێت بڵاودەبێتەوە. (لوکان فیهما ألهة إلا الله لفسدتا) لێرەوە دەمارگیریان لە پەلوپۆ دەخات و دەمبەستیان دەکات لەوەی کە نەتوانن ورتەیان لێوە بێت سەبارەت بەهەر دەستبەرداربوونێکیان لە فەرمانڕەواییدا. سەرکۆنەی ئەو دەمارگیریەی دەکات کەبیەوێت لەبارەی دەسەڵاتەوە نووزەی لێوە بێت، ئیتر تەنها دەبێتەوە –واتە پاشا– بۆ خۆی تاکرەوانە دەسەڵات دەبات بەرێوە،تابتوانێت ناهیلێت تاکە کەسێك جویَ بێتەوە لە ملکەچی نەنواندن بۆی و بیَ ئاگاو رەزامەندی تەنانەت کەسێك شوانی حوشترانیش بکات، لەبەرئەوە شکۆمەندی باڵادەستی هەمووی بچێتە سایەی ئەمەوە و لەسایەی ئەمەوە ئیتر جوڵەو بزاوتیان هەبێت، شکۆ بەو دەسەڵاتە گشتگیریەوە دەبینێت و کە رێگرە لەبەردەم بەشداری ئەوانی تردا، ئەوەش لەلایەن پاشاکانەوە ئەجامدەدرێت و دەکرێت.[1]...

مەبەستی لێرەدا ئەو دەرەنجامەیە کە لەم رەفتارە دەکەوێتەوە کە خۆی لە (دروستکردنی بەندایەتی و ملکەچیدا دەبینێتەوە) تاوەکو بڵێت ئەوەی کە پاشاکان و خۆسەپێن و ملهوڕەکان ئەنجامی دەدەن بریتیە لە بە بەندەکردنی ئەوانی ترو خوایەتی کردن بەسەرئەوانی ترەوە، کە لەراستیدا قورئانی پیرۆز بۆ نەهێشتن ورادانی ئەوە هاتووە، ئەمە

[1]– مقدمة ابن خلدون ١/٢٠٨.

بەپێچەوانەی پاشایەتی پێغەمبەران وەك پاشایی داوود و سولەیمان پێغەمبەر، چونکە ئەوان بە سروشی خوایی دەجولاًنەوە بیٚ ئەوەی کەس ناچار بکەن یان خۆسەپێنی بکەن، بەڵکو حوکم و فەرمانڕەوایی بەفەرمانی خوا یان دەکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ).

پێغەمبەری خوادا (صلّ الله عليه وسلّم) سەرپشك کرا لەنێوان پاشایەتی و بەندایەتی، بەڵام پێغەمبەر، (صلّ الله عليه وسلّم) دووەمی هەڵبژارد واتە: بەندەیەك کە ئەرکی پێغەمبەرایەتی لەئەستۆ بگرێت[(١)]. ئەوەش پەیام و شەریعەتەکەی بوو، سونەتی جێنشینەکانی و گەلەکەی لەدوای خۆی. کاتێکیش نامەی بۆ پاشاکانی سەردەمی خۆی دەنارد و داوای لێدەکردن بێنە ناو ئیسلامەوە، هەرگیز بە پاشا (مەلیك) ناوی نەدەبردن بەڵکو دەیفەرموو: (بۆ هیرقەل گەورەی رۆم) یان (بۆ کیسرا گەورەی فارسەکان) ئیمامی نەوەوی ئەیفەرموو (هۆکاری ناونەبردنی ئەوانە بەپاشا (مەلیك) واتە نەیدەفەرموو (پاشای رۆم) لەبەرئەوەبوو کە خاوەن موڵك و پاشایی راستەقینە نە هی ئەو بوو نە غەیری ئەویش،بەڵکو تەنها بۆ خوایە، مەگەر ئەوکاتە نەبێت بەفەرمانێکی ئاینی ئیسلام نەبێت[2].

[1]– رواه النسائي في سنن الكبرى ١٧١/٤ والبيهقي ٤٩/٧ وله شاهد في كصنف عبدالرزاق ١٨٣/٣.

[2]– انظر شرح النووي لصحيح مسلم ح رقم ١٧٧٣

لە فەرمودەی پیرۆزی پێغەمبەردا هاتوە (نە پاشای گچکە- و نەپاشاو نەگەورە بێجگە لە خوا نییە)[١].

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ڕەتیدەکردەوە کە پاشای گچکە- وەك پاشا بچوکەکانی خێڵی حەمیر لە یەمەن- هەروەها ڕەتیکردەوە کە پاشای ڕاستەقینە بێجگە لە خودا هەبێت و ئەو هیچ هاوەڵێکی وەهای نییە. هەروەها لە فەرمویەدەیەکی تردا هاتوە (لە غەزای تەبوکدا ئێمە هاوەڵی پێغەمبەرمان دەکرد، شەوێکیان پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) وەستا و ئێمەی هاوەڵان لەدەوری کۆبووینەوە، فەرمووی من لەم شەودا خوای گەورە دوو گەنجینەی فارس و ڕۆمی پێ بەخشیم، هەروەها پشتیوانی لێکردم بەسەر پاشا گچکەکانی هۆزەی حومەیردا، هیچ پادشاییەك بێجگە بۆ خوا بوونی نییە، دێن لەماڵ و موڵکی خوا دەبەن و شەر لەپێناو خوادا دەکەن، ئەمەی سێ جار فەرموو.[٢]. بۆیە بریاردراوە لە ئیسلامدا پاشایەتی بوونی نەبێت، بەڵکو ئەوە تەنهابۆخودایە، پاشان پاشاکانی هۆزی حومەیر وەك هەر موسڵمانێك لەپێناو خودادا دەجەنگان، لە بەیتولمال دا بەشیان وەردەگرت، حاڵیان هەمان حاڵی موسڵمانانی تربوو. لەبەرئەوە لە فەرمودەی صحیحدا هاتوە کە (قیزەونترین ناوێك لای خوا ناوی

---

[1]- رواه احمد في المسند ٤/ ٣٨٧ بإسنادين احدهما الصحيح، والطبراني في الكبير ٩٨/٢٠ من حديث عمر بن عبسة.

[2]- رواه عبدالرزاق في المصنف ٤٨/١١ ، وعنه احمد في المسند ٢٧٢/٥ من حديث الخثعمي بإسناد مقبول.

کەسێکە کەخۆی ناوناوە (پاشای پاشاکان) چونکە هیچ پاشاییەك بۆغەیری خودا بوونی نییە. لە ریوایەتێکدا (تورەیی خوا زیاتر دەبێت لەسەر) لە ریوایەتێکی تردا (بیزراواترین پیاوێك لەلای خوا لەرۆژی دواییدا، و ناشیرینترینی مرۆڤ، کەسێکە ناوی پاشای پاشاکانە، کە هیچ پاشاییەك بۆ غەیری خودا بوونی نییە، لە ریوایەتێکی تر (پیسترین یان قیزەونترین) ناویٚ (شاهەنشاه)یە.[1].

هۆکاری بە حەرام گرتنی ئەو وشەیە بۆ ئەوە نییە کە ئەو کابرایە نازناوی خۆی وەك پاشای پاشاکان بەکارهێناوە و رۆیشتوە، وەك ئەوەی هەندێك واگومان دەبن، بەڵکو هۆکارەکە ئەوەیە کە ئەم بانگەشەیە درۆیەکی گەورەیە، ئەو خەصڵەتە تایبەت و سنوردارە وەك ناوێك لەناوەکانی خودا و خەصڵەتێك لە خەصڵەتەکانی، کە ئەوانە تەنها بۆ خوای گەورەن و وەصفی زاتی خۆی پێکردوون، بەڵکو پووچەڵدەبێت هەرچیەك ببێتە هاوبەش وهاوەڵی، جا ئەگەر ئەوە بکرێتە ناوی یەکێك لە درووستکراوەکانی بەوە پێی بوترێت (پاشای پاشاکان)، یان هەر پێی بوترێت (پاشا–مەلیك) هەرچەندە ناوی پاشای پاشاکان قیزەونترین و خرابترین و بیزراوترینیانە لەچاو ناوبردنی بە پاشا. وەك لەناواخنی دەستەواژەی (أفعل) اسم التفضیل لەزمانی عەرەبیدا ئەمە دەگرێتەخۆ. لەمەوەیە شەرعزانان پێیان وایە کە یەکەمیان حەرامکراوە واتە (شاهەنشاه–پاشای پاشاکان) نەك دووەم

---

[1]– رواه البخاري ح ٦٢٠٥، ومسلم ح ٢١٤٣.

واتە (پاشا) هەرچەند گوتەی قیزەونتر یان خرابتر یان بیزراوتر ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لەوە کەمتر لەقیزەون و بیزراوی بوونی هەیە، ئەویش ناوهێنانە بە پادشا لەبەرئەوە لەکۆتایی فەرمودەکەدا (بێجگە لەخوا هیچی دیکە پاشا نییە)، هاتوە. لەریوایەتێکی تر (هیچ خاوەن موڵك و خاوەنێکی راستەقینە بیجگە لەخوا بونێکی نییە) نەیفورموە (پاشایەکی باڵا بۆ پاشاکان بوونی نییە  بێجگە لە خوا)، بۆ ئەوەی جەخت لەسەر ئەو حەرامکردنە بکاتەوە کە کورتناکرێتەوە لەناوهێنان و ناولێنان بە (پادشای پاشاکان) بەڵکو پەیوەندی تەواوی بە مەغزای وشەی پاشاکەوە هەیە، چونکە هیچ پاشایەکی راستەقینە بێجگە لەخوا بوونێکی نییە، بۆیە هێنانی عیلەت و هۆکارێك لە کۆتایی فەرمودەکەدا رۆشنە کەبۆ بەحەرامکردنی رەهای هەردو چەمکەکەیە کە (پاشای پاشاکان یان پاشا) کە بدرێتە پاڵ هەر مرۆڤێك، کە بەڵێنی سزای توندی بۆ دیاری کراوە، هەروەها ئەوانەش کەئەم بانکەشەیە دەکەن بۆ خۆیان و ناویان دەهێنرێت بەو چەمکانە ئەوە بەبێزراوترین و قیزەونترین و خراپترینی خەڵکانێکی رۆژی دوایی هەژماردەکرێن. ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەری خودا جەخت لەسەر ئەم راستیە دەکاتەوە کە دەفەرموێت لە رۆژی دواییدا بانگەواز دەکرێت: کوان پاشاکانی سەرزەوی؟ من پادشام.!.

لە فەرمودەی صحیح دا هاتوە (مەگەر هەواڵتان نەدەمێ سەبارەت بە خەڵکی بەهەشت؟ هەموو چەوساوەیەکی چەوساوە بەدەست چەوسێنەرەوە ئەگەر (سوێند بەخودا بخوا هەرچیەکی بداتێ دەیداتێ)،

هەروەها دەتانەوێت هەواڵتان بدەمێ سەبارەت بە خەڵکی دۆزەخ ؟ هەموو لووتبەرزێکی خۆبەگەورەزانە)[1].

له فەرمودەیەکی تردا هاتوە: (دۆزەخ وتوویەتی من کاریگەر دەبم بە خۆ بەگەورەزان و خۆسەپێنەرەکان، بەهەشتیش وتوویەتی با چەوساوەو هەژارەکان بێنە ناومەوە، خوای باڵادەستیش فەرموویەتی: بەئاگر تۆ سزای منی سزای ئەوانەت پێدەدەم کە خۆم ویستی سزادانیانم هەیە، هەروەها بەهەشتی فەرمووە تۆ میهرەبانی و سۆزی منی بۆ ئەوانەی ویستی سۆزو میهرەبانیم بۆیان هەیە.[2].

هەروەها دەفەرموێت: (دوو پۆل لە خەڵکانی دۆزەخن من نەمبینوون، پۆلێك کە قامچیان بەدەستەوەیە کە قامچیەکەیان وەك کلکی مانگا وایە پێی لەخەڵکان ئەدەن)، لە ریوایەتێکی تر (ئەگەری ئەوە هەیە کەئێوە پۆلێك ببینن کە قامچی وەك کلکی مانگایان پێیە، ئەوانە توورەیی خوا دەبێتە نسیبیان و دەکەونە بەر خەشمی خوا)، لە ریوایەتێکدا (لە تووڕەیی و خەشمی خوا دەخۆنەوەو دەکەونە بەرنەفرەتی خوای گەورە)[3]، ئەوانە قامچی کێش و ئازاردەرەکانن، کەلەهەوڵی ئازاردان و ترساندنی خەڵکن، بۆ ئەوەی زیاتر ملکەچ پێکردن و بەبەندەکرنیان بدەن بۆ پاشاو ملهوڕەکان.دیارە ئەمە بایەخ و پاڵپشتی تەواوی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم)ە بۆ پاککردنەوەی

---

[1]- البخاري ح ٦١٧١ ، ومسلم ح ٧١٨٧.

[2]- رواه مسلم ح ٧١٧٢.

[3]- مسلم ح ٧١٩٤ –٧١٩٦.

پرسی یەکتاپەرستی کە بۆ خواکان دەکرێت، هەروەها سووربوونی تەواوی لە پاراستنی ئەو بنچینەیە، کە هەموو خوو سونەتی پاشاکانە رادەپێچێ و پووچەڵیان دەکاتەوە، هەروەها پێچەوانەی نۆرمەکانی کیسراو قەیسەرەکان بێتەوە و پەکیان بخات. لەوانەش:

یەکەم: پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) نەهی کردووە لە سەردانەواندن و وەستان لەدەوری کەسێك کە دانیشتوە، جارێکیان پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیة وسلّم) لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە نەیتوانی بە پێوە بوەستێت نوێژیان بەکۆمەڵ بۆ بکات، بۆیە بەدانیشتنەوە ویستی نوێژبکەن لەوکاتەدا تەماشای کرد هەموویان بەپێوەوەستاون، بۆیە ئاماژەی بۆکردن کە ئەوانیش بەدانیشتنەوە نوێژی لە دواوە بیکەن، بۆیە ئەو نوێژەیان هەموو بەدانیشتنەوە کرد، پاشان پێی ووتن (نەکەن سەرشۆڕی بکەن فێری سەردانەوین بن وەك خەڵکانی فارس و رۆم کە بۆپاشاو گەورەکانی خۆیان دەکەن، ئەوان لەدەوریاندا بەپێوە دەوەستن و پاشاکانیان دادەنیشن، بۆیە شتی وامەکەن، ئەگەر شوێنکەوتەی پێشەواکانتان بوون بەپێوەبوون ئیوەش بەپێوە بن گەر دانیشتن ئێوەش لەگەڵیدا دابنیشن، لە نوێژیشدا ئەوان بەپێوە نوێژیانکرد ئیوەش بەپێوە گەر بەدانیشتنەوە ئێوەش بەهەمان شێوە دانیشن)[١].

[1]– رواه البخاري ح ٦٨٨ و ٦٨٩ ، ومسلم ح ٩٢٨ وللفظ له.

دووەم: خواردن و خواردنەوە لە هەر قاپ و قاچاخێکی ئاڵتوونی و زیوی، لەبەرکردنی جل و بەرگی حەریر و لەبەرکردنی هەر ئاڵتوون بۆ پیاوان، هەروەها دانیشتن لەسەر پێستی پاڵنگ و درندەکان، هەر شتێك لەخوو نەریتێکی پاشاکانی فارس و رۆم، لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە کە جارێکیان پاش ئەوەی کە مەدائین فەتح کرا حوزەیفەی کوڕی یەمان، داوای خواردنەوەی لە یەکێك لە بەردەستە مەجوسیەکانی کرد ئەویش لەناو قاپێکی زیویدا بۆی هێنا، ئەویش پێی وت:(من فەرمانم پێکردن کە خواردنەوەم لەناو ئەمانەدا بۆ مەهێنن، چونکە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمووی: لەناو قاپ و قاچاخی ئاڵتوون و زیودا مەخۆنەوە، هەروەها لە پەرداخ و پیاڵەیان مەخۆنەوە، پۆشاکی ئاورێشم و حەریر لەبەرمەکەن، چونکە ئەوانە بۆ پۆشاکی و خواردنەوەی دونیایی ئەوان دەبێت و بۆ رۆژی دواییی ئێوەش دەبێت)[١]، لە فەرمودەیەکی تر کە ئومسەلەمە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) دەفەرموێت: ئەوەی لە قاپ و قاچاخی ئالتون و زیو بخوات ئەوا لە ئاگری دۆزەخدا بەسەرسکدا رادەکێشرێت[2].

سێیەم: پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) نەهی کردوە لە خشانی زیادەی جل و پۆشاك بە زەویدا بەمەبەستی پیشاندانی فیزو هەوا وەك پاشاو سەرۆکەکانی سەردەمی نەفامی کە دەفەرموێت: (خوای گەورە لە رۆژی دواییدا تەماشای ئەو کەسانە ناکات کە

---

[1]– رواه البخاري ح ٥٤٢٦ ومسلم ح ٢٠٦٧.

[2]– رواه البخاري ح ٥٦٣٤ ومسلم ح ٢٠٦٥.

پۆشاکیان دەخشێ بە سەر زەویدا)[1]. هەروەها دەفەرموێت: (کاتێك پیاوێك دەڕوات بەرێگادا و پۆشاکەکەی دەخشێ بەزەویدا و دەروونی پێی سەرسامە، ئەوە خوای گەورە بەناخی زەویدا دەیبات... تاکۆتایی[2].

چوارەم: ئەنجام نەدان و بەرگیری لە هەر زیادەڕەویەکی پیاهەڵدان و گەورەزانینێك، وەك ئەوەی خەڵکانێك بۆ پاشاو سەرکردەکان دەیانکرد، جارێکیان نوێنەرانی نەوەی عامر هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بەپێغەمبەریان فەرموو: تۆ گەورەمانی، ئەویش لە وەڵامیاندا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمووی: گەورە تەنها خودایە، وتیان باشترینمانی لەوەدا باشەت پێیە، گەورەمانی لەوەدا باڵای، ئەویش فەرمووی: ئەوە بڵێن کە لە وتەی خۆتاندایە، یان هەندێك لەو گوتەیەی خۆتان، باشەیتان فریوتان نەدات[3].

پێنجەم: پێغەمبەری خوا دڵخۆش نەبوو هەرگیز بەوەی کە هاوەڵانی هەڵسنەوە لەبەری، بەرگیریشی لەوەدەکرد، هەروەها نەهی دەکرد لەوەی پیاوێك لەشوێنەکەی هەستێتەوە بۆ کەسێکی تر ئەوەی بەگەورەی بگرێت، وەك ئەوەی کەبۆ گەورەو سەرۆکەکان دەکرا لە سەردەمی نەفامیدا، لە فەرمودەی پیرۆزدا و لەئەنەسەوە گێڕاوەتەوە: کەس نەبووەبەئەندازەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم)

---

[1]– رواه البخاري ح ٥٧٨٨ ومسلم ح ٢٠٨٥.

[2]– رواه البخاري ح ٥٧٨٩ ومسلم ح ٢٠٨٨.

[3]– أبو داود في السنن ح ٤٨٠٦ ، وإسناده صحيح.

خۆشەویست بێت لای هاوەڵانی، بەڵام کاتێ بیانبینیایە هەڵنەئەسان لەبەری، لەبەرئەوەی دەیانزانی کە چەندە پێغەمبەری خوا رقی لەو جۆرە رەفتارە دەبووەوە)[١].

جارێکیان مەعاویە هات بەسەر کوڕی زوبەیرو کوڕی صەفواندا، هەستانەوە لەبەری، ئەویش پێی وتن دابنیشن، چونکە من لە پێغەمبەرەوە (صلّ الله علیه وسلّم) بیستوومە دەیفەرموو: ئەوەی دڵخۆش بێت بەوەی کە خەڵکان بەگەورەی بگرن و لەبەری هەستن، با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا ببینێتەوە)[٢]. هەروەها رۆژێکیان پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) چووە ناو هاوەڵان و خۆی دا بەمل گۆچانەکەیدا، ئەوانیش هەستانەوە، بەڵام پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) نەهی لێکردن و پێی فەرموون: (هەڵمەستنەوە وەك چۆن عەجەمەکان هەڵدەسنەوەو هەندێکیان هەندێکی تریان بەگەورە دەگرن)[٣].

شەشەم: پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمانی بە سادەیی و نەهی لە بە خۆدانازین و خۆبەگەورەزانین کردوە، وەك ئەوەی لە ژیانی سەردەمی نەفامی رەنگی دابووەوە، وەك فەرموویەتی: (خوای پەروەردگار سروشی بۆ ناردم کە با مرۆڤەکان خۆیان بەسادەو ساکار نیشانبدەن، بۆ ئەوەی یەکێکیان بەسەر یەکێکی تریاندا خۆی

---

[1] – الترمذي ح ٢٧٥٤ ، وقال (حديث حسن وصحيح).

[2] – رواه أبو داود ح ٥٢٢٩ ، والترمذي ٢٧٥٥ ، وقال (حديث حسن).

[3] – رواه أبو داود ح ٥٢٣٠.

نەسەپێنێت، و یەکێکیان شانازی بەخۆیەوە نەکات خۆی بەگەورە بزانێت لەسەر حیسابی ئەوی دیکە.)[١].

حەوتەم: پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) نەهیکردوە لە هەوڵدان بۆ گەیاندنی هەواڵ بە سوڵتان و خۆبردنە پێشەوە لای،، هەروەها قسەگواستنەوەو سیخوڕی کردنی خەڵکی بۆ پێشەواکانی حەرامکردووە.

چونکە حوزەیفەی کوڕی یەمان جارێکیان بیستی کە کەسێك هەواڵ و شت لەناو خەڵکەوە دەگوێزێتەوە بۆ لای پێشەوا عوسمان، حوزەیفەش پێی وت ئاگاداربە من لە پێغەمبەرەوە (صلّ الله علیه وسلّم) بیستوومە فەرموویەتی: (هەواڵبەر (سیخوری کاری سوڵتان) ناچێتە بەهەشتەوە)[٢].

لە ریوایەتێکی تردا فەرموویەتی: (پیاوێك هەواڵ و قسەی دەگواستەوە بۆ سەرۆکێك، ئێمەش لە مزگەوت دانیشتبووین، دانیشتوان وتیان: ئەوە کەسێکە هەواڵ و زانیاری دەگوێزێتەوە لە خەڵکەوە بۆ ئەو سەرۆکە، حوزەیفەش فەرمووی: (هەواڵبەر ناچێتە بەهەشتەوە) مەبەست لە هەواڵبەر ئەو کەسەی کە هەواڵ و زانیاری خەڵکان دەگەیەنێتە لای سوڵتان و جاسوسیان بەسەرەوەدەکات. هەروەها نەهی کردوە لەسەر کاری سیخوریکردن بەسەر خەڵکەوە، وەك ئەوەی خوونەریتی پاشکان بووە، وتوویەتی: (ئەگەر سەرۆك گومان و بێ

---

[1]– رواه أبو داود ح في السنن ٤٨٩٥.

[2]– صحيح البخاري ٦٠٦٥، ومسلم ح ١٠٥.

متمانەبوو لە خەڵکانی، ئەوا تووشی گێچەڵ و خرابیونیان دەکات)، لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: (ئەگەر تۆ کەوتیتە شوێن هەڵەو عەیب و عاری خەڵکی ئیتر ئەوە بەرەو خرابەکاریان دەبەیت)[١].

هەشتەم: جارێکیان پێغەمبەری خوا دانیشتبوو خواردنی دەخوارد، فەرمووی: (من دەخۆم وەك ئەوەی کەچۆن بەندەیەك دەخوات)، هەروەها بانگی هاوەڵانی خۆی دەکرد بۆ خواردن لەگەڵی، ئەوانیش زۆرێك هاتن و چوونە سەر خوانەکە، تا بەشێوەیەك زۆربوون لە دەوری خوانەکە، کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) شێوازی دانیشتنەکەی گۆڕی بۆ دانیشتن لەسەر ئەژنۆکانی، یەکێك لە دانیشتوانی دەشتەکی رەخنەی لەشێوازی دانیشتنی پێغەمبەر گرت کەخۆی هێناوەتە یەکەوە لەسەر ئەژنۆکانی دانیشتوەو وتی: ئەوە چ جۆرە دانیشتنێکە؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: (من خوای گەورە گێڕاومی بە بەندەیەکی بەرێز، نەیگێڕاوم بە کەسێکی خۆسەپێن و خۆبەزلزان و لوتبەرز)[٢]، خۆبەزلزان و لوتبەرزەکان مەبەستی پاشا ستەمکارەکان بووە.

نۆیەم: جاران پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ئەگەر بەرێگەیەکدا برۆیشتایە نەیدەهێشت دوان بکەونە شوێنی[3]، هەرگیز رەزامەندی نەنواندوە لە سەر ئەوەی کە کەسێك بەدوایدا براوات وەك ئەوەی پاشاکانی ئەو سەردەمە کردوویانە.

---

[1]– رواه أبو داود ح في السنن ٤٨٨٨.

[2]– رواه أبو داود ح في السنن ٣٧٧٣.

[3]– رواه أبو داود ح ٣٧٧١.

دەیەم: پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) هەردەم نەهی کردوە لەوەی کەخەصلەتی پادشایی بنێ لەخۆی یان بدرێتە پاڵی، جارێکیان پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) پیاوەکە قسەی لەگەڵدا کرد، ترسی لێ نیشتبوو دەپەشۆکا لەقسەکردن لەگەڵ پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) ئەویش فەرمووی پێی: (ئارامبەوە، خۆ من پادشاو سوڵتان نیم، بەڵکو من کوڕی ژنێکم کە گۆشتی وشککراوەی دەخوارد)[1].

لێرەوە دەبینین پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) هەمو نەریت و خوویەکی پاشاکانی فارس و رۆم (کیسراو قەیسەر)ەکانی رەتکردوەتەوە، هەر لە جل و بەرگ پۆشین و خواردن و خواردنەوەو شێوازی دانیشتن و جۆری تێکەڵبوونیان بەخەڵکی و جۆری وەستان لەسەر سەری خەڵکان بۆیان و حەزکردنی ئەوان بۆ ئەو ترس و لەرزو کردە بەندەییانە و هەروەها ئەو نازناو ناو لێنانەی کەپێیان ناسراون و هەروەها لەقامچی وەشاندن و زیندانیکردن و ئازارو ئەشکەنجەدان و سیخوڕو هەواڵبەرو چاوگێڕەکانیان و شانازیکردن بەخۆو و زۆری خەڵك لەدەوروبەریان و هەمو ئەو رێو شوێن ونەریتە دژ بە فیترەتە پاکانەی مرۆڤ.. بەڵکو خوای گەورە ناردوویەتی تاوەکو خەڵکان (مرۆڤەکان) ئازاد بکات لە بەندایەتی و هەموو شێوازەکانی بەندەبوونی مرۆڤەوە لەغەیری خوا، تاوەکو یەکێك ستەم لەکەسێکی تر نەکات و کەسێك خۆی بەگەورەو شانازیکەر بەسەر ئەوی تر نەزانێت.

---

[1]– رواه ابن ماجة ح رقم ٣٣١٢ ، وصححه الألباني في صحيح الجامع.

## راستەقینەی یەکتاپەرستی لە حوکم و دوورکەوتنەوە لە ستەمکار:

قورئانی پیرۆز بریاری داوە کە ئەمە بنەمایەکی گەورە لەبنەماکانی ئاین بێت لە ریگەی ئەم خالاّنەی خوارەوە:

١- چەسپاندنی ئەوەی کە خوای گەروە بۆخۆی (بریاردەرو دادوەرە و بریاریش لای ئەوە، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە، کەپێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) سەبارەت بەکەسێك کە نازناوی (أبوالحکم- خاوەن بڕیار) بوو فەرمووی: (خاوەن بڕیارو دادوەرە و بڕیاریش هەر لای خوایە)[1]. بۆیە نەهی کردوە لە (خاوەن بڕیار) وەك ناو، یان نازناوێك کەبدرێتە پالّ هەرکەسێك، بەلّکو ئەو نازناوەی تەنها بەشایەنی پەروەردگار زانیوە و بڕیاردەری راستەقینەو حاکمیش تەنها بۆ خوا (الله) پەسەندکردوە، کە خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ الْحَقَّ ۖ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ)[2]. هەروەها دەفەرموێت: (ألا له الحکم)[3]. هەروەها دەفەرموێت: (إن الحکم الا لله. أمر ألا تعبدوا إلا إیاه)[4]، هەروەها دەفەرموێت: (والله یحکم لا معقب لحکمه)[5].

ئەمەش رۆشنترین خستنەڕووە کە بە یەکتازانینی خوا لەبابەتی فەرمانداری (حاکمیە)ەو بنچینەیە بۆ یەکتاپەرستی لە پەرستشدا،

---

[1]- البخاري في الأدب المفرد ح ٨١١ ، وصحيح ابن حبان ح ٥٠٤.

[2]- الأنعام ٥٧.

[3]- الأنعام ٦٢.

[4]- یوسف ٤٠.

[5]- الرعد٤١.

ئەوەی ئەم یەکتازانینەی فەرمانڕەوایی لا جێگیر نەبێت، ئەوە یەکتاپەرستیەکەی ناتەواوە، بە فەرموودەی خوا (إن الحكم الا لله) لێرەدا (ان) ئامرازی نەهیە، واتە فەرمانڕەواییەکی راستەقینە نییە بێجگە بۆ خوا، دیارە نەرێکردن بە(ان)لەگەڵ (جوێکردنەوە–استسنا) بە (الا) لە بەهێزترین چرکردنەوەو کورتکردنەوەی شتێکە لەوەدا لە ڕووی زمانەوانییە وە، کە بۆ واتای تاقانەیی و یەکتاپەرستی بدات، ئەم رستە ناویە هاتوە بۆ جێگیرکردن و چەسپاندنی ئەوەی کە ئەوە راستیەکی بەرچاوە، پێشەکیەکی پێویستیشە بۆئەوەی لە دوای ئەوەوە دێت کە (أمر الا تعبدوا الا اياه) ئەم رستەی دووەمە هاتوە رستەیەکی کرداریە کەواتای نوێگەری و ڕوودان دەدات، دوای رستە ناویەکە کەواتای جێگیری ئەرێنی دەدا، بەوپێیەی کە کاری یاسادانان و حەڵاڵکاری و حەرامکردن لە شەریعەتێکەوەبۆ یەکێکی تر جیاوازە، لە پێغەمبەرێکەوە بۆ پێغەمبەرێکی تر، هەروەها هاتنی تەشریع بەپێی هۆکاری هاتنی دەکرێت بابەتی نەسخ و تایبەتمەندی تێبکەوێت، بۆیە نوێگەری دەیگرێتەوە، بە پێچەوانەی خەصڵەتی فەرمانڕەواییکردنی خوای گەورە، برواهێنان بەوەی کە فەرمانداری تەنها بۆ ئەوە، ئەمەش شێوەیەکی رەهایە، مافێکی تایبەت بەپەروەردگارە، ئەو فەرمانەی لەو ئایەتە پیرۆزەدا هاتوە لقێکە لە لقەکانی فەرمانڕەوایی (الحكم) جۆرێکە لە جۆرەکانی، ئەگەر فەرماندان لێیەوە فەرمان و نەرێ و هەڵبژاردن و مۆڵەتدانە (اباحه)، دیارە بابەتی یەکتاپەرستی لە پەرستشدا ناناسرێت تەنها بە ئەحکام و تەشریعاتەکانی نەبێت، بە ئەرێ و نەرێکانی نەبێت،

ئەوەش وادەكات كە يەكتاپەرستی پەروەردگار لە فەرمانڕەواییەكەیدایە پێش یەكتازانینییەتی لە بابەتی پەرستشدا، كاتێك هاوەڵدانننانیش لە یەكتاپەرستیدا ناناسرێت مەگەر لەفەرماندانددا نەبێت، هەروەها پەرستش بۆهۆی لە نەریتەكان جویێ ناكرێتەوە ئەگەر بە فەرماندانەكان نەبێت، لەبەرئەوە روخسەتدرابوو كەبراكانی یوسف كرنوش بەرن بۆ یوسف، كاتێك لە شەریعەتی ئەواندا بەهاوەڵدانان هەژمارنەكرابوو، پاشان كڕنووشبردن بۆ غەیری خوا و لە شەریعەتی پێغەمبەر موحەمەد (صلّ الله علیە وسلّم) بووە هاوەڵدانان.

ئەمەش هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ پرسی یەكتاپەرستی لە فەرمانداری و ملكەچی، هەروەها خۆڕادەستكردنی رەها بۆ فەرمانڕەواییەكەی، هەموو فەرمانێكی دەروەوەی پەروەردگار هاوەڵدانانەو پێویستە مرۆڤ لێی دوور بكەوێتەوە، وەهەرچی ئەو فەرمانیدا لەسەری ئەوە لەیەكتازانینی ئەوەو پێویستە پابەندبین پێیەوە، هەرچی هەڵگرت و نەسخی كرد لە شەریعەتەكان پێویستە شوێنكەوتەی بین، ئەوەش مانای راستەقینەی موسڵمانبوون و ئیسلامەتیە لای خوای گەورە.ئەمەش بنچینەیەكی تەواو رۆشنەو بنەمایەكی دیاری ئیسلامە، كەهیچ ناكۆكیەك لەمەڕ ئەم پرسە لەلایەن زانایینی ئوصولەوە بوونی نییە، وەك ئیمامی غەزالی لە (المستصفى في علم الأصول) دەفەرموێت: (لەگەران بەدووی فەرمانڕەواییدا دەركەوت كە بێجگە لەخوای گەورەفەرمانڕەواییكی تر بوونی نییە، هەروەها بۆ پێغەمبەر (صلّ الله علیە وسلّم) هیچ فەرمانڕەواییەك بوونی نییە، هەروەها بۆ هیچ

دروستکراوێکی تر لە دروستکراوەکانی خوا لەپرسی فەرمانڕەوایی (حکم)دا بونێکیان نییە، بەڵکو هەمووی فەرمانڕەوایی خوای گەورەیە و ئەو دانراویەتی و بڕیار لەسەردەریەتی.

ئامەدی لەوبارەوە لە (الاحکام) وتوویەتی: بنچینەی یەکەم لە فەرمانڕەواییدایە: بزانە کەوا هیچ فەرمانڕەواییەك بێجگە لەخوای پەروەردگار بوونی نییە، وەهیچ بڕیارو فەرماندانێکیش بۆ کەسی ترنییە و هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو).

هەروەها سوڵتانی زانایان عیزی کوڕی عەبدولسەلام لە (قواعد الاحکام) دەڵێت: خوایی تاقانە دەبێتەوە لە بابەتی گوێڕایەڵی، هەروەها لە بابەتی فەرمانداری بێجگە لە خوای گەورە فەرمانڕەواییەکی تر بوونی نییە.

تەنانەت تاقمی (موعتەزیلە) ئەوانەی سەبارەت بە چاکێتی و خراپێتی عەقڵیەوە وتوویانە، مەبەستیان لەوە توانای عەقڵە لە ناسینی فەرمانڕەوایی خوای گەورە لە ڕووی گشتێتیەوە، پێش هاتن و دابەزینی شەریعەتەکان، بەڵام پاش دابەزینی شەریعەتەکان ئەوان هیچ ناکۆکیەکیان لەو بنەما سەرەکیەوە نییە، ئەویش ئەوەیە کەخوای پەروەردگار فەرمانداری ڕاستەقینەیە و هیچ هاوەڵێکی نییە، عەقڵ تاکە ئاشکراکەری حوکمی خوای گەورەیە، کە هیچ حوکمێك بێحگە بەهی بوونی نییە.

٢- وەك خوای پەروەردگار بڕیاریداوەو هەواڵی ئەوەی داوە بەبەندەکانی کە هیچ هاوبەشێکی لە فەرمانڕەواییدا نییە، هەروەها

ئاگاداری هاوەڵدانانی لەبابەتی حوکم دا داوە، کە دەفەرموێت: (مَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا)[١]، ئەمە لەشێوەی هەواڵدانەو، لە یەکێك لە خوێندنەوە حەوتیەکان (قراءة السبعة) ولاتشرك في حكمه أحدا) ئەمە بەشێوەی فەرماندانە.

٣- هەروەها خوای گەورە گوێڕایەڵی کردنی غەیری خوای لە بابەتی تەشریع و حەڵاڵکردن و حەرامکردندا بەهاوبەشیکار بۆ خوای لەقەڵەمداوە، خوای گەورە لە سورەتی شورا کە سورەتێکی مەکیە دەفەرموێت: (أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله)[٢]، کە پرسیارکردنێکی ئینکاریەو بە ئەوانەی کە یاسادانانی دەکەن بۆ بەندەکان بێجگە لەخوا چ وەك ئاین و چ وەك گوێرایەڵی و ملپێکەچکردنیان بۆ خۆیان کە پەروەردگار هیچ مۆڵەتێکی بەوشێوەی نەداوە کەببێتە هاوبەش و هاوەڵی لە موڵکی و سوڵتانییە تی و ملکەچی و گوێرایەڵی، هەروەها دەفەرموێت: (ولا تاكلوا مما لم يذكر اسم الله عليه وإنه لفسق و إن الشياطين ليوحون إلى أوليائهم ليجادلوكم وإن أطعتموهم إنكم لمشركون)[٣].

ئەوەش لەوەوە هاتوە کە سەرانی قورەیش وتیان بە پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) وهاوەڵانی کە چۆن ئەوەی بەدەستی خۆیان سەریان بریوە بەدەستی خۆیان دەیخۆن، بەڵام ئەوە ناخۆن کە خواکان

---

1- الكهف ٢٦

2- الأنعام ١٢١

3- الشورى ٢١

بۆیان سەریان بریون کە مردوون؟ ئەم ئایەتەی قورئان لەوبارەوە دابەزیکە مافی دارشتنی تەشریعی رەها و حەلالکردن و حەرامکردن تەنها خوای گەورەیە. هەروەها گوێڕایەڵیکردنی غەیری خوا لەو بارەوە بەهاوەڵدانان هەژمارکردووە، ئەنجامدەیەکەشی موشرەکە بەخوای پەروەردگار، ئەمەش پێش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینەو لەشاری مەککە ئەم ئایەتە دابەزیوە و ڕوویداوە، کە ئەمە سروشتی بانگەوازو گوتاری ئیسلامیە لەسەردەمی مەککیدا.

٤- هەروەها خوای گەورە فەرمانڕەواییکردن بۆ غەیری خۆی حەرامکردوە، بە ستەمکاری هەژماریکردوە، لەوبارەوە فەرموویەتی: (يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به)[1]. هەروەها دەفەرموێت: (اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ ۗ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ)[2]، هەروەها دەفەرموێت: (وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ )[3]، هەروەها دەفەرموێت: (وقال الذين أشركوا لو شاء الله ما عبدنا من دونه من شيء نحن ولا آباؤنا ولا حرمنا من دونه

---

1- النساء ٦٠.

2- البقرة ٢٥٧

3- النساء ٧٦.

من شيء كذلك فعل الذين من قبلهم فهل على الرسل إلا البلاغ المبين)[١].
هەروەها دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ.)[٢].

ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئەو راستیە دەدردەخەن کە ئامانجی ناردنی پێغەمبەران بەتێکڕا ئەوەیە کە پەرستراوێتی تەنها بۆ خوا بێت، و دووربکەوێتەوە لەهەر پەرستراوێکی ستەمکاری درووستکراو، دیارە لەو ئایەتەدا چەمکی (طاغوت) ئاماژەیە بۆ دوو جۆر لە ستەمکارو لەکاری سنوور دەرچوو ئەوانیش: ستەمکاری لەکاری خۆدەرچوون لە پرسی پەرستشدا وەك بتپەرستی، هەروەها ستەمکاری لەکارو سنووری خۆدەرچوون لەفەرمانداری وەك پاشاکان، ئەوە بۆ هەموو ستەمکارو لەکاری راستەقینەی سنوور دەرچووێك لایەنگرو پشتیوان و شەربۆکەرانی هەیە.

(طاغوت) بنچینەکەی لەزمانی عەرەبیدا لە کاری (طغی و یطغی و طغیا و طغیانا)، کە بۆخۆی واتە ستەمکاری لەسنووری خۆدەرچوون لە کتێبی (لسان العرب) بەمانای: دەرچوون لە سنووری خۆدەرچوون و زیادەرەویکردن لەکوفردا، وە هەر زیادەڕەویەك لەتاوان و ستەمدا ئەوە (طاغیة) کە دەفەرموێت: (کذبت ثمود بطغواها) واتە بە زیادەرەویکردنی. هەروەها فەرمویەتی: (یؤمنون بالجبت والطاغوت) لێرەدا (طاغوت) هەموو پەرستراوێکە بیجگە لەخوا لە ستەمکارو

---

[1] – النحل ٣٦.

[2] – الزمر ١٧.

ئەوانەی زیادەرەوی دەکەن طاغوت دەکرێت شەیتان بێت، دەکرێت کاهنێك بێت، یان هەر سەرێکی ستەمکاری لەرێدەرچوو، یان دەکرێت بت بێت و بپەرسترێت، دەکرێت جنۆکە یاخود مرۆڤێك بێت، ئیبن و عەباس دەفەرموێت: الجبت مەبەست لێی (حەی کوڕی ئەختەبە)و (طاغوت)یش مەبەست لێی (کەعبی کوڕی ئەشرەفە) کە ئەم دوانە دووسەر جولەکەبوون. ئەزهەری دەڵێت: ئەمە ئەوشتە نییە کە بچێتە دەرەوەی زمانەوە و ئەوەی زمانەوانەکان وتویانە، ئەوەی شوێنکەوتەی فەرمانی ئەوان بێت و ملکەچ و گوێڕایەڵی عەیری خوا بێت، هەروەها چەمکی (الطواغي) لە زیادەرەوی لەکوفر و بەزاندنی سنوورە راستەقینەکەیە، کە سەرۆکەکانیان و گەورەکانیانن، هەروەها (طاغية) پاشای رۆم بووە، ملکەچپێکەری ستەماکارئەو چەوسێنەرەی کە گوێی نەدەدا لەوەی دەهاتە پێشەوە، خەریکی کوشتن و ئازاردانی مرۆڤەکان بوو بێ هیچ جیاوازیەك. ئیبن و جەریری تەبەری لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: تاغوت هەموو ئەوانەی کە لە سنووری خۆیان دەردەچن لە ئاستی خوای پەروەردگاردا، بەوەی بەندایەتی بۆ غەیری ئەو دەکەن جا ئەگەر بەهۆی زوڵم و ستەمەکەیەو بێت یان بە ملکەچی و گوێرایەڵیکردنی ئەوەی بەندایەتی بۆدەکات، ئەگەر مرۆڤێك بێت یان شەیتان بێت یان بتێك بێت یان سومبولێك و نۆرمێکی ئاینی بێت یان هەرشتێك بێت.

دیارە لە گەران بە شوێن واتای (الطاغوت) دا لە ڕووی زمانەوانییە وە کە بەرۆشنی بینیمان ئەوەیە کە بەسێ واتا بەدەرکەوت:

١- هەموو پەرستراوێك بێجگە لەخودا: لە بت، سومبول، بەرد، درەخت، گۆڕ، وەك لە ئایەتێكی سورەتی زومەردا ئاماژەی پێدراوە (والذين اجتنبوا الطاغوت أن يعبدوها).

٢- هەموو گوێڕایەڵ و ملكەچبۆكراوێك بێجگە لە خوا: هەر لە پیاوێكی ئاینی،زاناو، خەڵوەكێشێكی ئاینی فەلە، پاشا، سەرۆك، هەرچی تر.. وەك لە ئایەتی سورەتی نیسائدا هاتووە: (يريدون أن يتحاكموا الى الطاغوت وقد أمروا ان يكفروا به) ئەم ئایەتە لەسەر دوو كەس دابەزی كە ناكۆكی كەوتە بەینیانەوە، یەكێكیان ووتی بابچینە لای پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) ئەو دادوەریمان بكات، ئەوی تریان وتی نەخێر بابچینە لای كەعبی كوڕی ئەشرەف، ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی، بەڵام ئەم ئایەتە گشتیە، وەك ئیبنو كەسیر لە تەفسیرەكەیدا هێناویەتی، دەڵێت هەركەس خۆی وادانا كە دادوەرەو بریاری راستەقینە لای ئەوە، دادوەری كرد بەهەرشتێك بێجگە لەوەی كەخوای پەروەردگار ناردوویەتی، ئەوە بۆخۆی (تاغوت)ە، چونكە خوای گەورە هەمو ویستێكی بەدادوەر زانین بۆ غەیری پەروەردگار بە كوفر زانیوە، وەك لە فەرمودەی خوادا هاتوە: (يريدون أن يتحاكموا الى الطاغوت) ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە نایەوێت غەیری خوا دادوەری بێت و رەزامەند نەبێت پێی، ناچێتە بەر ئەو بەڵێنەی كە لە ئایەتەكەدا هاتووە، تەنانەت ئەگەر بەزۆریش كەسێك بچێتە بەردەم دادوەرێكی وەها شێوەی غەیری خوا، بەڵام لە ژێر پەستانێكی تردا و بێ ویستی خۆ وەك ئەوەی دۆخی گەلی ئیسلام وایە، لەسەری نانوسرێت.

٣- هەموو خۆسەپێنەرو ستەمکارێك: ئەوەی کەخەڵکان بەزۆرو خۆسەپێنی کۆنترۆڵ دەکات و ملکەچی فەرمان و ویستە ناڕەواکانی خۆی دەکات، وەك قەیسەری رۆم، کیسرای فارس و هەرکەسێك بەشێوەو نەریتی ئەوان بڕوات، ئەوە بۆخۆی (تاغوت)ە وەك لە ئایەتی سورەتی نیسائدا هاتوە: (والذين كفروا يقاتلون في سبيل الطاغوت)، خوای گەورە لەو ئایەتەدا ڕوو لە ئیمانداران دەکات کە تێبکۆشن و ڕووبەڕووی ببنەوە، کۆشش بکەن بۆ رزگارکردنی ئەو چەوساوانەچ پیاو چ ئافرەت و چ منداڵ..ئەوانەی کە دووچاری ستەم و چەوساندنەوە لە لایەن ئەو ستەمکارانەوە بوون، هەروەها ئەو بەشمەینەتکاریەی کە تووشی خەڵکی مەکە هاتبوو لەسەردەستی ملهۆرەکانی، وەك ئەبو جەهل فیرعەونی ئەو گەلەو ئەوانەو هەرچیەکی تر کەلەسەر رەوتی ئەوان بروات.

ئەو ئایەتەی سورەتی نەحل ئاماژە بەهەردوو جۆرەکەی دەکات چ لە پەرستش و چ لە تەشریع، دیارە هاوبەشدانەرانی خەڵکی مەکە بەڵگە و پرسی (جەبر و قەدەری گەردوونی)یان بۆ پێغەمبەر دەخستە بەرچاو، بەوەی دەیانوت کە ئەگەر خوای گەورە ویستی هەبوایە ئەوە نە ئێمە و نە باووباپیرانمان هەرگیز ئەوبت و شتانەمان نەدەپەرست، و هیچ کاتیش گوێڕایەڵی گەورەکان و پیاوەئاینییە کانمان نەدەکرد، بەڵام بە قورئان بەرپەرچیان دەدرایەوەو ئەو بانگەشەیان بەدرۆ دەخرایەوە، بەوەی کە ئامانج لە ناردنی پێغەمبەران بریتی بووە لە بانگکردنی خەڵکان بۆ بەندایەتی خوای تاك وتەنها و ملکەچکردن بۆ ئەو، پاشان

دووركەوتنەوە لەهەر (تاغوت)ێك یانی هەرستەمكار و بەبەندەكەرێكی مرۆڤەكان، سا ئیتر ئەو (طاغوت) ە پەرستش و بانگی لێبكرێت و بۆ بكرێت، یان فەرمانبەرداری و ملكەچی بۆ بكرێت.

دیارە مرۆڤەكان ئیختیارو توانای هەردوكیان لەمەدا هەیە، لەهەمانكاتدا خوای پەروەردگار فەرمانی بە هاوەڵدانانی نەكردوە، هیچ كاتیش نەیسەپاندوە بەسەریاندا، بەڵكو ویست و توانایی و ئازادی هەڵبژاردنیان پێبەخشراوەو خاوەنینی، هەروەها پێغەمبەران نێردراون و پەیامیان پێبوە بۆ رۆشنكردنەوەی هێڵی راست و رێگەی پان وبەرینی، بۆ ئەوەی حوجەیەك نەمێنێ بەدەست مرۆڤەكانەوە.

ئیبن و جەریری تەبەری تەفسیری ئایەتی (والذین اجتنبوا الطاغوت أن یعبدوها) كردوە لەسەر ئایەتی پێشتری سورەتی بەقەرە، (فمن یكفر بالطاغوت ویؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقی)[1]. كاتێ لە تەفسیركردنی (طاغوت) دەیكات دەڵێت: (راست لەو گوتەیەی من كە لە تێگەیشتن لە زاراوەی (طاغوت) هەمە، ئەوەیە كەهەركەس لەسنووری خۆی ولایداو ترازاو هەستا بە بەندەكردنی خەڵكان كە ئەوە مافی خوایە، جا بە خۆسەپاندن و چەوساندنەوە بێت لەسەر ئەوانەی دەچنە ژێر ركێفیانەوەو بەندایەتیان دەكەن چ بە ملكەچی و شوێنكەوتەیی، جا ئەو پەرستراوە چ مرۆڤ بێت یان شەیتان بێت، یان بت و یان سومبولێكو یان هەربوونێكی تر بێت..)

---

1- البقرة ٢٥٦.

هەرهەولێك بۆ گوێڕایەڵی و ملکەچی بەویستی خۆو — لەغەیری ملکەچی بۆ خوا– بخرێتە گەڕ، جائەگەر بۆ پاشا بێت، یان سەرۆکێك بێت یان زانایەك بێت، یاخود فەرمانڕەواییکردن و گەڕانەوە بۆ لای داوەرێك بێجگە لە خواو بەویست و هەڵبژاردنی خۆ، ئەوە بریتیە لەبەندایەتیکردن بۆی و کردویەتی بەهاوەڵی خواو و پەرستراوی بێجگە لە خوا، هەروەها ئەوەی کە بەزۆرەملێ کەسانی تر ملکەچی فەرمان و گوێڕایەڵیبون و گوێلەمشتبوون دەکات لەهەرشتێکدا کەخوای گەورە پێی ناخۆشە ئەوە بەبندەی کردوون، خۆیشی بوەتە (طاغوت).

دیارە وای وێنانەکردوە کە قورئانی پیرۆز بریاری لەسەر ئەم هەموو راستەقینەیە دابێت، و لەگەڵ ئەوەشدابریاری بوونی پاشاکانی دابێت، و دەسەڵاتیان بەسەربەندەکاندا بسەپێنن، چونکە ئەوە جێگیربوو کە پێهەستانی پاشای توندوتیژی بەکارهێنەرو پاشای خۆسەپێن، شتێك نییە بێجگە لەلادان و لەسنوورترازان لەرێنوونییەکانی پێغەمبەرایەتی و جێنشینە راستەقینەکانە، وەك لە فەرموودەدا هاتوە(پاشان سەردەم دەبێتە سەردەمی پاشایەکی توندوتیژی بەکارهێنەر، پاشائەوە پاشایەتێکی خۆسەپێنەر بەزۆر، دوای ئەوەش جێنشینیایەتێکی راستەقینە لەسەر پەیڕەوی پێغەمبەرایەتی)– پێچەوانە هاتنەوەی ئەوەی کە لەئیسلام هاتوە لە بنچینەکانی بیروباوەڕی و کرداریە، و دووکەوتنی سوننەتی قەیسەرو کیسراکانە؟

ئیسلام بە جێنشینایەتی و راوێژکاریەوە هات، بۆ ئەوەی خۆسەپاندن و پاشایەتی بروخێنێت، هات تاوەکو ستەم وبەندایەتی

هەڵبگرێت، هات تاوەکو سونەتی کیسراو قەیسەرەکان هەڵبوەشێنێتەوە، تاوەکو ئازادی بۆ مرۆڤەکان بەگشتی دەستەبەر بکات و دووریان بخاتەوە لەهەرجۆرە بەندایەتیەك، دووریان بخاتەوە لەو بەزۆر ملکەچ پێکردن و شوێنکەوتن وستەم و چەوساندنەوەو بەخودا زانینەی ئەوان کە بەسەر مرۆڤەکاندا سەپاندبوویان، لە بەرامبەردا دەوڵەتێکیان بۆ دابمەزرێنێت کە لەسەربنەمای داد و یەکسانی و زانست و راستی و یەکسانی و ئازادی و بەزەیی و میهرەبانی و مرۆڤایەتی.

بنچینەی دووەم: بەیەکبوون کردنەوەی مرۆڤایەتی و رێزادرپیشاندانی و بەجێنشینکردنی لەم سەرزەمینە:

ئەمە بنەماو بنچینەی دووەمە لەبنەماکامی گوتاری ئیسلامی سیاسی قورئانی، رەهەندی بانگەواز لە یەکتاپەرستی و بە تاقانە زانینی و هاوەڵ بۆ دانەنانی لە هەرشتێك کەواپێویست بێت بۆی، شکۆیە بۆمرۆڤ و پیشاندەری راستەقینەی بوونی ئەو ئامانجە تیایدا، هەروەها پێگەی لەبووندا و مەهام و کاری و پەیوەندی بە خواو بەزەمینەوە، پەیوەندی بەکۆمەڵگەکەی و بەمرۆڤی برای و هەموو ئەوشتانەی لەم سەرزەمین و بوونەدا هەن، بریاری ئەم بنەمایەو دوبارەکردنەوەو جەختکردنەوە لەسەری لە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا دراوە لەوانەش:

١- جەختکردنەوەی قورئانی پیرۆز کە رەگەزی مرۆڤ وەك جێنشینێکی خۆی لەم سەرزەمینە هەژمارکردوە، کە دەفەرموێت: (إني

جاعل في الارض خليفة)[1]، لەوەش تایبەتمەندی و پسپۆری دیاریکراوە بۆ مرۆڤ کە ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی زەوی و چاکسازی تیاکردنە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (هو أنشأکم من الأرض و استعمرکم فیها)[2].

٢- ئەوە جێگیرکراوە و جەختیلێکراوەتەوە کە مرۆڤایەتی یەك ریشەی هەیە و لە یەك باوك ودایکێك کەوتوونەتەوە، هیچ جیاوازیەك لەنێوان مرۆڤەکان چ لەسەر ئاستی رەگەزی نێرو مێ و رەنگ و هەرشتێ تر، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا)[3].

٣- جەخت لەسەر ئەوەکراوەتەوە کە ئامانج لەگێڕانی خەڵکان بە گەل و نەتەوە و خێڵ بۆ یەکترناسین و درووستکردنی پەیوەندی ئەرێنی و ئولفەتە، هاوکاری و هەماهەنگی کردنە لەسەر چاکەو خۆپارێزی و دوورکەوتنەوە و هەماهەنگی نەکردن لە بابەتی لادان و تاوان و دوژمنایەتی کردن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (یا ایها الناس إنا خلقناکم من ذکر وأنثی وجعلناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا إن أکرمکم عند الله أتقاکم)[4].

1- البقرة ٣٠.

2- هود ٦١.

3- الأعراف ١٨٩.

4- الحجرات ١٣.

٤- جەختکردنەوەی تەواوەتی لە سەربەرێزی مرۆڤ لەلایەن خوای پەروەردگارەوە وەك دفەرموێت: (ولقد كرمنا بنى آدم وحملناهم في البر والبحر وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا)[١].

٥- جەختکردنەوە لەسەر نەبوونی هیچ جیاکاریەك لەنێوان مرۆڤەکان، لەسەر ئاستی گەل و گەلێکی تر، نەتەوەو نەتەوەیکی تر ورەنگێك و رەنگێکی تر رەگەزو رەگەزێکی تر، واتە نەبوونی هیچ جیاکاریەك لەنێوان رەش و سپی و عەرەب و عەجەمی و نێرو مێ تەنها بەتەقوا نەبێت. مرۆڤەکان وەك دانەکانی شانەیەك وان، هیچکامیان لەپێشتر نین لەوانی تروەك پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) دەفەرموێت لەوبارەوە.

٦- بڕیاری رێزگرتن و بەحەرامزانینی شکاندنی شکۆو دەستدرێژی بۆ سەر گیان و جەستەو کیانی، بەتوندی پرسی دەستدرێژی بۆسەرگیانی مرۆڤ رەتدەکاتەوەو وایداناوە کە کوشتنی تاکەکەسێك وەك ئەوە وایە کە هەموو جیهانی کوشتبێت، وەك چۆن هەرکەس پارێزگاری بکات و کەسێك لە مردن رزگار بکات وەك ئەوە وایە جیهانی رزگار کردبێت لەمردن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (من قتل نفسا بغير نفس أوفساد في الأرض فكأنما قتل الناس جميعا ومن أحياها فكأنما أحيا الناس جميعا)[٢].

---

[1]- الإسراء ٧٠.

[2]- المائدة ٣٢.

٧- خوای گەورە بەڵێنی داوە بە بەندە باوەڕدارە چاکسازەکانی بەوەی کە دەبنە جێنشینی تایبەت و بەردەوامیدان بەژیان لەسەرزەوی کە دەفەرموێت: (وعدالله الذين آمنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الأرض كما استخلف الذين من قبلهم وليمكنن لهم دينهم الذي ارتضى لهم وليبدلنهم من بعد خوفهم أمننا يعبدوني لايشركون بي شيئا)[١].

ئەم ئایەت پیرۆزە هەواڵی ئەوەدەدات بەمرۆڤەکان، جەخت لەسەر ئەوەدەکاتەوە کەمانەوەو درێژەدان بەژیان و جێنشینی راستەقینە دواجار بۆ ئیماندارانە بەگشتی، وەك چۆن بەهەمان شێوەش بەڵێنی ئەوەدراوە کە زەوی دواجار هەر بۆئەوان دەبێت جێنشینایەتی تیابکەن کە دەفەرموێت:(ولقد كتبنا في الزبور من بعد الذكر أن الأرض يرثها عبادي الصالحون)[٢]. هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا هاتووە (صلّ الله علية وسلّم) دەفەرموێت: (خوای پەروەردگار زەوی بەشێوەیەکی گشتی پیشاندام لە رۆژهەڵاتیەوە بۆ رۆژئاوای، بینیم موڵکی گەلەکەی من (موسڵمانان) سەراپای زەوی گرتبوو)[٣]. ئەو زەویەی کە دانیشتوانەکانی پەیامی خوایان پێبگات و لەسەری موسڵمانان هەبن بە موڵکی گەلەکەی ئەو هەژمارکراوە.

هەموو ئەم راستیە قورئانیانە جەخت لەسەر جێنشینی ئاوەدانکردنەوەی زەوی دەکەنەوە لەلایەن مرۆڤەوە، هەمووشیان باس

---

1- النور ٥٥.

2- الأنبياء ١٠٥.

3- مسلم ح ٢٨٨٩ ، و أبو داود ح ٤٢٥٢.

لەرێزی پەروەردگار دەکەن کەلە مرۆڤی گرتووە، هەروەها جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤەکان جیاوازیەکیان نییە و هەموویان لەیەك ریشەوە هاتوون، ئامانج لەو دابەشبونەیان بەسەر گەل و نەتەوەو خێڵ ونەتەوەکاندا تەنها دروستکردنی پەیوەندی و ناسین و ئولفەت و هەماهەنگی و هاوکاری و ئاوەدانکردنەوەی ئەم سەرزەویەیە، هەموو ئەمانەش لەگوتاری قورئانیدا هاتوون تاوەکو بەم بەها بەرزو مرۆییانە هەموو بەها ناتەواو نەفامیەکان بەرکەناربکات و رایانبدات، کەئەو بەهانەفامیانە ژیانیان پەشێوکردبوو وەکو چینایەتی، رەگەزپەرستی، نەتەوایەتی، دەمارگیری، بەبەندەکردنی بێهێزەکان لەلایەن بەهێزەکانەوە، ئیستغلال کردنی هەژاران لەلایەن سەرمایەدارو دەوڵەمەندەکانەوە، قۆرخکردنی رەگەزی مێ وەك کەرەستەیەك بۆ رەگەزی نێر و بەکارهێنانی هەموو جۆرە توندوتیژیەك لەبەرامبەری، ئەمانە ئەو بەهاو چەمکە نەفامیانەبوون کە مرۆڤ برا مرۆڤەکەی خۆی پێ بەبەندە دەکردو دەیچەوساندەوە، وستەم و دوژمنایەتی بەرامبەر دەکرد، ئەوەش لە ئەنجامی لادان لە سیستمی مرۆڤ بوون دوورکەوتنەوە لەپەیامە راستەقینەکانی پێغەمبەران، کە هەردەم داوای برایەتی مرۆڤەکان و هەماهەنگی و یەکسانی و دادەپەروەریان کردوە، مرۆڤیان ئاراستەکردوە روەو دادو یەکسانی و خۆشەویستی.

## بنچینەی سێیەم: ئازادکردنی مرۆڤایەتی

## لە هەموو شێوازێکی کۆیلەیی بوون بۆ غەیری خوا:

گوتاری قورئانی تەنها کورت نەبوەتەوە لەسەر یەکتاپەرستی و بەتاقانەزانینی خوا دانەنانی هاوەڵ بۆی، پاشان بڕواهێنان بەوەی کەپەروەردگار بەتەنها شایانی پەرسشتش و ملکەچی بۆ کردنە، وەك لەبنەمای یەکەمدا ڕۆشنمان کردەوە – بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا گوتاری قورئانی بانگەشەی چەسپاندنی ئازادی بۆ مرۆڤایەتی دەکات، ئازادکردنی مرۆڤ لەهەموو شێوازێکی بەندایەتی کردنێکی لە غەیری خوا، بەڵکو لەخۆیدا گێڕاویەتی بە ئامانجی بالاو شەرعی گوتارەکە. تەنانەت ئازادی مرۆڤی بەپیرۆزترین خواستەکانی دەستەواژەی یەکتاپەرستی (لا اله الا الله) داناوە. بەندایەتی ئەگەر بریار بێت لەسەر مرۆڤ هەبێت ئەوە تەنها شایستەیە بۆ خوای تاقانە بکرێت، ناکرێت بەندایەتی بۆ درووستکراوەکان بکرێت و مرۆڤەکان هەموویان ئازادن و هاوئاستن لەنێو خۆیاندا لەوبارەوە. لێرەوە هەرملکەچی و گوێڕایەڵبوون و (رغبە ورهبە) بێدەسەلاتی نواندن هەمووی تەنها بۆ خوای بالادەست شایەنە کە دروستکەرو بەدیهێنەرو خاوەن موڵك و فەرماندەرو فارماندارو بریاربەدەستە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (ولا يتخذ بعضنا بعضا أربابا من دون الله)[1]، ئەم ئایەتە پێغەمبەری خوا پەروەرێنی (ربوبيە) ی بەومانایە راڤەکردوە کەبریتیە لە ملکەچی و گوێرایەڵبوون بۆ

---

[1]– آل عمران ٦٤.

سەرۆکەکان و پیاوانی ئاینی جوو فەلە، وەك لە فەرموودەدا هاتووە (انما السید الله) کە سەروەری و گەورەیی رەها تەنها بۆ خوای بالادەستە.

لێرەوە ئەگەر (گەورە–سید) بریتی بێت لە خوا، کە خاوەن موڵکی رەهاو پەروەرێن و فەرماندارو بڕیاردەری رەهایە– وەك لەبنەمای یەکەمدا هێنامان– بۆ بەندەو دروستکراوەکانی خوا نییە داوای گەورەیی بکەن، بۆیە ملکەچ و فەرمانداری و گوێڕایەڵبوون، دەسەلاتداری، بێ ویست و رێپێدانی ئەو نییە، تەنانەت بۆ پێغەمبەرانیش بۆیان نییە تەنها بەرەزامەندی و مۆڵەتی ئەو نەبێت وەك دەفەرموێت: (وما أرسلنا من رسول إلا لیطاع بإذن الله) ئەمە واتای ئازادی مرۆڤایەتیە، لێرەوە بنەمایەکی شەریعەت دانراوە کە دەڵێت: (بنەما لە مرۆڤدا ئازاد بوونییەتی)[1]. هەرچی کۆیلەو بەندە هەیە ئەو دۆخێکی نائاساییەو پێویستە کار بۆ ئازادکردنی بکرێت و لەو دۆخە بهێنرێتە دەرەوە.

زۆرینەی ئەحکامە شەرعیەکان و بالاترین و دیارترینیان پەیوەستە بەپرسی ئازادیەوە، وەك پێشەوایەتی کردنی گشتی، جیهاد، جومعە، کۆمەڵبوون، حەج، زەکات،...ئەمانە هەموویان واجب بونیان پەیوەستە بە ئازادبوونی تاکەوە، لەکاتی کۆیلەبوونی ئەمانەی هەموو لەسەردەکەوێت و واجب نین لەسەری، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمانی دەکرد بە ئازادکردنی بەندەکان و نەهێشتنی

[1]– انظر قوله ابن قدامة الحنبلي في الكافي ٤/٤٨ (الأصل الحرية والظاهر في الدار – أي دار الإسلام – الحرية) وفي الشرح الكبير للمقدسي ٩/٤٨٠ (الأصل الحرية والرق طارئ).

کۆیلایەتی لەناو عەرەبدا، حەزرەتی عومەر لەسەردەمی جێنشینایەتی خۆیدا بریاری دا بە ئازادکردنی ئەوانەی کەلەسەردەمی نەفامیدا بەکۆیلەکرابوون، و لەسەر بەیتولمالی موسڵمانان پارەکەی دان.![1]، بۆیە دەبینین عەرەبەکان یەکەم گەل بوون لە مێژووی مرۆڤایەتیدا رزگاریان بووبێت لە پرسی کۆیلایەتی بەهەموو جۆرەکانییە وە، ئازادی بەتەوای بەدیهێنرا بەهەردوو جۆرەکەی:

١- ئازادی مەعنەوی بەوەی تەنها بەندەی خوابێت و هیچ هاوەڵێکی بۆ پەیدا نەکات، کە هەموو مرۆڤەکان چ پیاوە ئازادەکان و چ کۆیلەکان وەکو یەك هاوبەش بوون لەمەدا.

٢- ئازادی جەستەیی ئەوەش بەرزگاربوونی لە سیستمی کۆیلایەتی و ئازادکردنی هەموو کۆیلەکان بەنیسبەت عەرەبەکانەوە، کە تەنانەت لەسەردەمی دەسەڵاتی عومەردا یەك کۆیلە نەما هەمووی ئازادکرا.

دیارە قورئانی پیرۆز ئەوئازادیەمەعنەویەی گێڕاوە بە ئامانجی باڵای یەکتاپەرستی و فەرمانیداوە کە هیچکات و هیچ مرۆڤێك بەندایەتی کەسی بێجگە لە خوای پێ قبوڵ نەبێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (قل يا أهل الكتاب تعالو إلى كلمة سواء بيننا وبينكم ألا نعبد إلا الله ولا نشرك به شيئا ولا يتخذ بعضنا بعضا أربابا من دون الله.)[2]

قورئان ئەم جۆرە بەندایەتی و پەروەرێنییەی بەملکەچی و گوێڕایەڵی بۆ غەیری خوا راڤەکردوە، کە دەفەرموێت: (اتخذوا أحبارهم

---

[1]- انظر ما سيأتي.

[2]- آل عمران ٦٤.

ورهبانهم أربابا من دون اللهوالمسيح ابن مريم وما أمروا إلا أن يعبدوا إلها واحدا لا إله إلا هو سبحانه عما يشركون)[١].

ئاشكرایه كه شوێنكەوتوانی ئاینه ئاسمانییەكان، پیاوه ئاینی و قەشەكانیان بەمانا عەرەبیه باوەكەی نەدەپەرست، بەڵكو گوێڕایەڵیان بۆیان هەبوو ملكەچی هەموو ئەو فەرمانانه دەبوون كه بەناوی ئاینەوه پێیان دەسپێرا و دیاره بەهەڵبژاردن و ویستی خۆشیان به بێ ئەوەی هیچ جۆره سەپاندنێكیش لەو نێوەندەدا بوونی هەبووبێت، دیاره ئەم گوێرایەڵی و ملكەچبوونه بۆ فەرمان و داواكانیان بریتی بووه لەپەرستش و پایەبردنه سەرەوەیان بەشێوەیەك چوونه ژێر باری ئەوان بوو بۆ خوا و بڕیاری خوایانەیان، وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمووی به عەدی كوڕی حاتەم كاتێك وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئێمه پیاوه ئاینیی و قەشەكانما ن ناپەرستین! ئەویش فەرمووی: (مەگەر حەرامیان بۆ حەلالّ نەدەكردن و حەڵاڵیان بۆ حەرام نەدەكردن و ئێوەش گوێڕایەڵبوون بۆیان.؟!) وتی بەڵێ وایه.. فەرمووی: (ئەوه پەرستنی ئێوەیه بۆ ئەوان)[٢].

ئیبن و كەسسیر له تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەفەرموێت: (حوزەیفەی كوڕی یەمان و ئیبن وعەباس و ئەوانیتر.. لەراڤەی ئەو ئایەتەدا دەڵێن: ئەوان شوێنكەوتەو گوێڕایەڵدەبوون لەوەی كه حەرامی دەكەن و حەڵاڵی دەكەن.. لەبەرئەوه خوای گەوره دەفەرموێت: (وما أمروا إلا ليعبدوا إلها

---

[1]- التوبة ٣١.

[2]- رواه الترمذى ح ٣٠ ٩٥، وأحمد في المسند وابن الجرير الطبري في التفسير الآية في طرق.

واحدا لا إله إلا هو) ئەوەی ئەو هەرشتێکی حەرام کرد، ئەوە ئیتر تەواو حەرامەو ئەوی روخسەتی هەرشتێکی دا وەك حەڵاڵ ئیتر ئەوەش حەڵاڵە، ئەوەی بەشەرعی زانی شوێنکەوتەی بەو ئەوەی فەرمانی دا جێبەجێی بکە..)

ئەگەر بەندایەتی دژایەتی ئازادی بکات و دژی بێت، ئەوەقورئان بۆ ئازادکردنی مرۆڤەکان هاتوە لەدەرهێنان و رزگارکردنیان لەهەموو جۆرە بەندایەتی بوونێکی مرۆیی، لەهەموو شێوازە کۆیلایەتی و پەرستشێك بۆ غەیری خوا، جا ئیتر ئەو کۆیلەو بەندایەتیکردنە بۆ پاشایەك یان گەورەو سەرۆکێك بێت یان بۆ زاناو پێشەوایەکی، یان بۆ هەواو ئارزەزووی خۆی بێت، ئەوەش بەرێگەی یەکلابوونەوە بۆ یەکتاپەرستی خودا فەراهەم دەبێت کەواتای تەواوەتی ئازادبوونی تیا دەبینرێتەوە.

کاتێك دایکی حەزرەتی مەریەم (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی: (ربي إني نذرت لك ما في بطني محررا)[1]. واتە یەکتاپەرست، و یەکلابوەوە بۆ پەرستشی تۆ بەندایەتی تۆو بەتاقانە زانینی تۆ، هەروەها ویستی ئەو لەدایکبوە بکاتە خزمەتگوزاری پەروەردگار لە پەرستگادا، و هیچ وەخت خزمەتگوزاری کەسی تر نەبێت.خۆی خەریکی ملکەچی بۆ هیچ کەسانێ نەکات بێجگە لە خوا، بەڵکو گوێرایەڵی و فەرمانبەرداری تاك و تەنهایی خوا بێت، وەك فەرمووی: (محررا) لێرەدا

---

[1]– آل عمران ٣٥.

وشەی ئازادی بە هاوواتایی یەکتاپەرستی هێناوە، چونکە لێرە ئازادی بەواتای یەکلابوونەوە بۆ یەکتاپەرستی هاتووە.

کاتێك چەمکی ئازادی مرۆڤایەتی قووڵدەبێتەوە وەك ئەوەی هاتوە لە قورئاندا کە دەفەرموێت: (لااکراه في الدين)[1]. دەبینین لێرەدا چەمکی دین بەواتای ملکەچی و گوێرایەڵی هاتووە، لێرەوە ملکەچی و گوێرایەڵی بۆ خوا و بەندایەتیکردنی لە ئیسلامدا بەزۆرەملێ نییە، بەڵکو گوێرایەڵی و ملکەچی لە سەربنەمای ئازادی وەستاوە نەك لەسەر زۆرەملێ و سەپاندن، ئەگەر خوای پەروەردگار لەبەندەکانی قبووڵنەکردبێت کە بەزورە ملێ و سەپاندن گوێرایەڵی بن و ملکەچی فەرمانەکانی بن و پەرستشی بۆ بکەن، چۆن گونجاوە و پەسەندی دەکات کە بەزۆر پاشاو سەرۆکەکان هەستن بە سەپاندنی بەندایەتی و بەزۆرەملێ بیانهێننە ژێر رکێف و فەرمانبەرداری خۆیان، بەبێ ئەوەی خۆیان رەزامەندیەك بنوێنن؟!

---

[1] – البقرة ٢٥٦.

## ئیتر چۆن شەریعەتی کردارەکی پێچەوانەو دژی بنەما باوەڕیەکان دەبێتەوە؟

دیارە عەرەب چەمکی (دین) ی بەمانای ملکەچی و گوێڕایەڵی بەکاربردوە، وەك عەمروی کوڕی کەلسوم دەڵێت: ڕۆژانێ ئێمە زۆر درێژەیان خایاند سەرپێچی پاشامان کرد تیایدا و کە (دینداریمان نەکرد) مەگەر پاشا کێیە؟ خەڵکان ملکەچ و زەلیلی بوون، کە ئێمە ئەوەمان نەویست کە خۆسەپێنی و ملکەچ و زەلیلی بۆ ئەو لەناوماندا هەبێت.

هەروەها سەعدی کوڕی ناشیبی مازنی دەڵێت: هەڕەشەمان لێمەکە ئەی بیلال کە ئێمە مانان ئازادین، ئەگەرچی هێشتا سەرپێچیکردنی (دین) مان نەبڕیوەتەوە.

لێرەدا سەرپێچیکردن لە دین واتە لە ملکەچی و گوێڕایەڵی هاتووە..

گوتەی خوای گەورە (لا اكراه في الدين) واتە هیچ زۆرەملێییەك لە گوێڕایەڵیکردندا– وەك ئیبن و تەیمیە لە تەفسیری ئایەتی (ويكون الدين كله لله) وتوویەتی دین بەواتای ملکەچی و گوێڕایەڵیکردن دێت لێرەدا.[١]، نەبوونی زۆرەملێ بۆخۆی واتا بوونی ویستی خۆو واتا ئازادی، لەبەرئەوە ویستی هەڵبژاردن و نەبوونی زۆرەملێ مەرجی سەرەکی تەکلیف خستنەسەرشانی هەرتاکێکە لەلای زانایانی ئوصول و شەرعزانان بەبێ جیاکاری. هەرچی لەلایەن مرۆڤەوە دەربچێت ویستی

---

[1]– مجموع الفتاوى (٢٨/٥٤٤).

خۆی تێدانەبووبێت و بەزۆرەملێ کرابێت لەسەری هەژمارناکرێت، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم)دا هاتووە: (رفع عن أمتي الخطأ والنسیان وما استكرهوا علیه).

بەڵکو ئەو چەمکی یەکتاپەرستیەی کە قورئان هێناویەتی، فراوان دەبێتەوە بۆ ئازادکردنی مرۆڤ تەنانەت لە ڕووی نەستو دەروونیشەوە، وەك ترسان لە غەیری خوا و هەروەها ترسی دەروونی و جەستەیی و وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (ولاتخافوهم وخافوني إن كنتم مؤمنين)، مەرجی بەدیهاتنی بڕوا بە خوای پەروەردگار نەبوونی ترسە لە غەیری خوا و هەرچی بیجگە لەو ترس بدات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وإياي فارهبون) یان دەفەرموێت: (واياي فاعبدون) وەك چۆن پەرستش بۆ غەیری خوا ڕێگەپێنەدراوە، بەهەمان شێوەش باسی ترسان و تۆقان هاتوە، پێویستە بروادار ترسی لەغەیری خوا نەبێت، کە خوڵقێنەری شتەکانی گەردوونە بەگشتی و ڕۆزیدەرەیانە، بژێن و مرێنەریانە، هەر ئەو شایستە بە پەرستن و ملکەچ بۆکردن و ترسانە لەبەری، یەکتاپەرستی تەواوەتی بەرامبەر ئازادبوونی تەواوی دەروونی مرۆییە لە هەموو شێوازێکی بەندایەتی بۆ غەیری خوا.

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علية وسلّم) لەم بابەتە زۆرترین قوڵبوونەوەی هەبوو کەپەیوەستە بە ئازادی مرۆڤ لە هەموو شێوازەکانی کۆیلایەتی و بەندایەتی بۆ غەیری خوا، تەنانەت بەرگیری دەکرد لە هاوەڵانی لە هەستانەوەیان لەبەر ئەو ئەگەر برۆیشتایەتە شوێنێك ئەوان دانیشتووبوونایە وەك ئەوەی کە کۆیلەکان بۆ گەورەکانیان دەیانکردو

هەڵدەسانەوە لەبەریان، پاشان بەهەمووشێوەیەك وەستانی هاوەڵان لەپشتی سەریەوە لەکاتێکدا ئەو دانیشتووبوایە رەتدەکردەوە تەنانەت لەکاتی نوێژدا ئەوەشی پێ پەسەندنەبوەو بەرگیری لێکردوە، ئەوەش بۆ دوورکەوتنەوە لەخوونەریتی سەرۆك وپاشاکان و هەروەها چەمینەوە لەبەر کەسێکی دیکەی بەتەواوی رەتکردوەتەوە، نەهی کردوە لە بەکار هێنانی دەستەواژەی (بەندەکەم، خزمەتگوزارەکەم) بەڵکو فەرمویەتی بڵێن (کوڕەکەم– کچەکەم) بەڵگەشی بۆ ئەوە هێناوەتەوە بەوەی کە فەرموویەتی (هەمووتان بەندەی خوان، هەموو ئافرەتێکیشتان بەهەمان شێوە بەندەی خوایە)[١].

[1]– رواه مسلم في صحيحه ح ٢٢٤٩.

## بنەمای چوارەم: بانگەوازی خەڵکان بۆ داد پەروەری و راستی:

کاتێك ئیسلام هات سەرزەوی پڕبووبوو لە ستەم و چەوساندنەوە، لەسەردەستی ستەمکارەکان لەهەموو پستێکی ئەم زەویە، مرۆڤایەتی بەدەست ستەم و جەورو چەوساندنەوەوە دەتلایەوە، کۆمەڵگەی مرۆیی بەدەست هەموو شێوازێکی توندوتیژی و ئازارو مەینەتەوە دەینالاند، یاسای دارستان باڵادەس بوو، ئەوکات گەلی عەرەبی پشکی زیاترینی بەدەست ئەم زوڵم و چەوساندنەوەیوە بەرکەوتبوو، بەهێز بێهێزی دەخوارد و دەوڵەمەند خوێنی هەژاری دەمژی هەندێکیان بووبوونە زۆردار بەسەر هەندێکی تریانەوە، ستەم و ستەمکاری وابوبوو بەباو کەهەرکەسەیان بیکردایە دەبوە جێی شانازی بۆ بکەرەکەی، وەك شاعیر دەڵێت:

قبيلة لا يخفرون بذمة ولا يظلمون الناس حبة خردل!

ئەم شاعیرە زەمی خێڵەکەی خۆی دەکات، کە ناچێت بدات بەسەر ئەوانی تردا و ستەمیان لێبکات، ئەمە بەڵگەی بێهێزی و لاوازیانە، ئەمە لەکلتووری نەفامی عەرەبدا بوونی هەبووە.

تەنانەت شاعیرێ تر باسی خرابی خێڵەکەی خۆی دەکات گوایە ناتوانێت زیان بگەیەنێت بەوانی تر و دەڵێت:

ئەگەر من لە خێڵی مازن بومایە وشترەکەم نەدەبرا..... ئەو کورە زۆڵانە لە گەمژەکانی بەنو شەیبانن قەومێکن ئەگەر شەڕو نارەحەتی بەدەرکەوت ئەوا کەڵبەکانیان بۆیان دەردەخات، بەکۆمەڵ و بەتاك لێی رادەکەن و باڵدەگرن ناپرسنەوە لە برایان پشتی تێدەکەن و لە

ناڕەحەتی و تەنگانەدا........کاتێ ڕوبەرووی دەبنەوە، بەڵگەیەکیان بۆ وتن نییە، من ئەگەرچی لەقەومێکی خاوەن ژمارەی زۆرم...... بەلام لە هیچ شتێکدا توندوتیژیەکیان نییە ئەگەر ئیهانەش بکرێن بەرامبەر ستەمی ستەمکاران لێبوردەییان هەیە، بەرامبەر هەرتاوان و خراپەکاریەکیش لێبوردن و چاکەیان هەیە.

لەم چەند بەیتە شیعرە وێنەیەکی ڕەوان هەیە بۆ کۆمەڵگەی نەفامی و بڵاوبوونەوەی ستەمکاری تیایدا، تاوەکو ئەوەی کە ناپرسێتەوە لە براکەی و ستەمی بەرامبەردەکات و بەرامبەری دەبێتەوە، و کەچی وەصف دەکرێت، ئەوەش بەهۆی ئەو کلتورە باوەی لەنێویاندا بڵاوبووە، تەنانەت کەسە بەرێزەکانیش ڕاڤەیەکیان بۆ هۆکار نەدەبوو، بەڵکو یەکسەر بەپەرچی ستەمیان دەدایەوە هەرکەس هانای بۆ بهێنانایە ئەگەر ستەمکاریش بوایە، وەك بڵێین هاوارکردن ڕوونادات، تەنها ئەوکاتانە نەبێت کەکەسێك ستەمی لێکراوە ئیتر بۆ پشتی ئەوە نەڕوانرێت و هۆکار لێکنەدرێتەوە، تاوایان لێهاتوە شانازیان کردوە بەستەم و دەسدرێژی و دوژمنایەتی بە قارەمانی دەهاتە بەرچاویان وەك شاعرێکیان دەڵێت:

زۆر جار هێرشمان دەبردە سەر کچی براکەمان ئەگەر ئیتر ئەوکاتەی کە کەسمان دەسنەکەوتایە بێجگە براکەمان!!

ئەوکات عەرەبە خاوەن دەسەڵاتەکان بەخۆیان دەیاننازی و باسی ئازایەتی خۆیانیان دەکرد بەشانازیەوە کاتێ ستەمیان لە خێڵە بچوکەکان دەکردو بەسەریاندا دەدان، یان تۆڵەیان لە هۆزێ

بکردایەتەوە، هەردەم خەرکی تۆڵەکردنەوە بوون لە یەکتری، پاشان گەلانی تریش ئەوکات لەژێر مەینەت و چەوساندەنەوەی ستەمکاران و خۆسەپێنەرەکاندا بوون و ستەمیان لێدەکردن، لەوکاتەدا خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆناردن وەك رەحمەتێك بۆ مرۆڤایەتی بەگشتی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين)[1]، کە دامەزراندنی دادو یەکسانی گێرابوو بەکۆتا ئامانج لەناردنی ئەو پێغەمبەرەدا (صلّ الله عليه وسلّم) هەروەها ناردنی پێغەمبەرانی پێش ئەویش و ناردنی ئەو کتێبە ئاسمانیانەش لەگەڵیان، کە دەفەرموێت: (لقد أرسلنا رسلنا بالبينات وأنزلنا معهم الكتاب والميزان ليقوم الناس بالقسط)[2]. خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردوە بە پەرتووك و تەرازووەوە وەك رەحمەت و سۆزێك بۆ مرۆڤایەتی، تاوەکو خەڵکان بە شێوەیەکی دادوەرانەو یەکسانی، هەروەها غایەو ئامانجی درووستکردنی خەڵك بەدیهێنانی دادگەریە، کە خوای گەورە دەفەرموێت: (الرَّحْمَنُ.عَلَّمَ الْقُرْآنَ. خَلَقَ الإِنسَانَ. عَلَّمَهُ الْبَيَانَ. الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ. وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ. وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ. أَلاَّ تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ. وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ)[3] . ئەم سورەتە مەکیە و بە ناوی پیرۆزی خۆی (الرحمن) دەستپێدەکات، ئاماژە لە ئامانجی سەرەکی خولقاندنی مرۆڤەکانی تیادا باسکردوە، تەنانەت لە پێناویدا

---

[1]- الأنبياء ١٠٧.

[2]- الحديد ٢٥.

[3]- الرحمن ١-٩.

ئاسمانەکانی وەها راگیرکردوە، تاوەکو دادگەری و یەکسانی بچەسپێت و بێتەدی، پاشان بانگی بەندەکانی خۆی دەکات کە دادگەری بچەسپێنن و یەکسانی لەنێوان خۆیاندا فەراهەم بکەن، ئەوەش بە یەکتاپەرستی دامەزراندنی داد لە نێوانیان بە چاکویستی و بەرگیری لە ستەم، قوۆئانی مەکی هاتوە بە بانگەوازی یەکتاپەرستی وبەرگیری لە هەر هاوبەشی ئەنجامدانێك بۆ پەروەردگار، کە بە ستەم باسی لێوەکراوە بەڵکو لە خراپترینی جۆری ستەمکاریش هەژمارە، وەك چۆن جەختی لەسەر دامەزراندنی دادگەری و پاڵپشتیکردنی ستەملێکراو و سەرخستنی چەوساوەو بێهێزەکان و بەزەیی هاتنەوە بە خەڵکیی کردوەتەوە. دیارە قورئانی مەککی بانگەواز و بانگەشەکردن بۆ دادگەری خستوەتە پێش یەکتاپەرستیەوە، ئەوەتا خوای گەروە دەفەرموێت: (قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ۚ)[1].

ئەوەی کە جەختی لەسەرکراوەتەوە لەوەیە دادو یەکسانی پێش شتەکانی تربکەوێت، ئەوەیە کە ئیسلام بڕیاریداوەو ئەوەی لاپەسەندە کە لە دەوڵەت و ژێردەسەڵاتی ئەودا هەڵگرانی ئاینەکانی تر بمێننەوە لەسەر ئاینی خۆیان و بەهیچ شێوەیەك پەستانینان نەخرێتە سەرو ناچارنەکرێن بەوازهێنان لەئاینەکانی خۆیان، بۆیە مەبەست لەوە نواندنی دادگەری و یەکسانییە و لەنێوانیاندا، وەك خوای پەروەردگار

[1]– الأعراف ٢٩.

لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (صلّ الله علیه وسلّم) دەفەرموێت: (وأمرت لأعدل بینکم)[1]، بەوپێیەی نێردراوێکە کە رەحمەت و میهرەبانییە بۆ مرۆڤایەتی بە بڕوادارو بێ باوەڕەوە، دیارە رەحمەتی بۆ بێباوەران خۆی لە بەرپاکردنی داد و یەکسانی و ناچارنەکردنیان بۆ وازهێنان لەهەربیرو باوەڕێك کەهەیانە، و پارستنیان لەزیان و جیاکاری نەکردنیان و بەسۆزو میهرەبانییە وە مامەڵە لەگەڵکردنیان و چاکبوون و چاکویستی بۆیان وەك برایەکی مرۆیی مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت برایی مرۆیی مرۆڤەکان کۆبکاتەوەو لەسەرووی هەمووشتەکانەوە بێت لەوانەش بیروباوەڕ، لەبەرئەوە فەرمودەی پیرۆزدا هاتووە کە بەپێغەمبەریان وتوە ئەی پێغەمبەری خوا نزای خرابە بۆ موشرکەکان بکە، ئەویش لە وەڵامیاندا فەرموویەتی: (من نەنێراوم بۆ ئەوەی کە نەفرەت لەمرۆڤەکان بکەم بەڵکو بۆ ئەوەنیرراوم کە رەحمەت و میهرەبانی بم بۆیان)[٢]، هەروەها فەرموویەتی: (من لا یرحم الناس لا یرحمه الله) [3]، هەروەها دەفەرموێت: (الراحمون یرحمهم الرحمن ارحموا من في الأرض یرحمکم من في السماء)[٤]، تەنانەت سۆزو رەحمەتی ئاژەڵ و دانەکانی سروشتیشی گرتوەتەوە، وەك لە فەرمودەدا هاتوە: ئافرەتێك بەهۆی پشیلەکەیەوە چوە دۆزەخ، کاتێك دەرگای لێداخست

---

1– الشوری ١٥.

2– صحیح مسلم ح ٢٥٩٩.

3– صحیح مسلم ح ٢٣١٩

4– أبو داود ح ٤٩٤١ بإسناد صحیح.

نەیهێشت لە ژوورەکەی بێتە دەرەوەو خواردنی پێنەداو نەیهێشت بێتە دەرەوە تاکو پێویستی ژیانی لە دەروە دەست بکەوێت، تا گیانی لەدەست دا)[1].

هەروەها پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: (جارێکیان پیاوێك سەگێکی بینی لە تینواندا هەناسەبڕکێی لێکەوتبوو، ئەویش چووە ناو بیرێکەوەو پڕی پێڵاوەکەی ئاوی هێناو بەدەم هەڵیگرت، هاتە سەرەوەو تینویەتی سەگەکەی شکاند، خوای گەورە پاداشتی کرد و لەتاوانەکانی خۆش بوو) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر ئێمە لەپای چاکەمان بۆ ئاژەڵەکان پاداشت وەردەگرین؟ ئەویش فەرمووی: (بۆ هەموو زیندەوەرێك پاداشت هەیە)[2].

جارێکیان پێغەمبەری خوا لە گەشتێکدا بوو لەگەڵ هاوەڵانی، باڵداریٚ جۆری (حمرە) دوو بێچوی لەگەڵ بوو، هاوەڵانی بێ ئاگاداری پێغەمبەر بێچوەکانیان گرت، باڵندەکەش بەدەوریاندا دەسوڕایەوە دەیجریوان، پێغەمبەری خوا بەوەی زانی و پێی فەرموون: (کێ ئازاری بێچوەکانی ئەو باڵندەیەی داوە، زوو بێچوەکانی بەرەڵا بکەن با بچنەوە لای دایکیان).[3]

لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ڕێمونیکەرێکی بەسۆز بووە و میهرەبانیی بەرامبەر مرۆڤ و ئاژەڵەکان نواندووە.

---

[1]– صحيح البخاري ح ٧٤٥ ، ومسلم ح ٢٢٤٢ واللفظ له.

[2]– صحيح البخاري ٢٣٦٣.

[3]– رواه أبو داود ح ٥٢٦٨.

قورئانی پیرۆز موشرکەکانی لەکەدارو ریسوا دەکرد، لەو ستەم و ستەمگەراییەی بەرامبەر مرۆڤ و هەمووستەکان دەکرد، بەوپێیەی ستەم بەهەموو شێوازەکانی و جۆرەکانی بلاوبوبویەوە لەناویاندا بۆ نموونە:

١–ستەمی ئابووری: کە ئەم جۆرە ستەمە دەوڵەمەندەکان بەسەر هەژارو نەدارەکانەوە پیادەیان دەکرد لەو هەموو مامەڵە و کرین و فرشتنانەی کە ئەنجامیان دەدا، کە قوربانی هەمیشەیی هەژارو مسکێنەکان بوون، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ * الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُواْ عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ * وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ * أَلا يَظُنُّ أُوْلَئِكَ أَنَّهُمْ مَّبْعُوثُونَ * لِيَوْمٍ عَظِيمٍ * يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَلَمِينَ)[1].

ئەم بانگەوازە بنەمایەکی گەورەی هەیە لەگوتاری شوعەیب پێغەمبەردا (سەلامی خوای لێبێت)، بەڵکو دۆزی سەرەکیە تیایدا پاش یەکتاپەرستی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ وَلَا تَنْقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ إِنِّي أَرَاكُمْ بِخَيْرٍ وَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُحِيطٍ، وَيَا قَوْمِ أَوْفُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ..)[2]. وەك دەبینین لە ئایەتی(أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ، وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ )[3] هەمان شێواز داوا لەپێغەمبەر

[1]– المطففين ١–٦.

[2]– هود ٨٤– ٨٥.

[3]– الشعراء ٨١–٨٣

شوعەیب دەكرێتەوە، هەروەها لە سورەتێكی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: (قالوا یا شعیب اصلاتك تأمرك أن نترك ما یعبد آباؤنا وأن نفعل في أموالنا ما نشاء)[1]واتە ئایا دینەكەت و پەرستشەكەت بۆ خواكەت، ئەوە دەسەپێنیٚ بەسەرماندا كە واز لە بتپەرستی بهێنین و هیچ شتێك بە ویستی خۆمان لە ماڵەكەمان نەكەین، لە كرین و فرۆشتن و لەكاری تەرازووبازی و ستەمكردن لەهەژاران و نەداران؟

گەلەكەی شوعەیب پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) پەی بەو جیاكاریە بردبوو كە ئاینەكەی شوعەیب هاوبەشیگرتن بۆخوا و ستەمكاری پیٚ رەوانییە، چونكە هەردووكیان هەردەستدرێژین، ئەمەیان بۆسەرماڤی پەروەردگارو ئەویان بۆ سەرماڤی بەندەكانی خوا (مرۆڤەكان)، لەكاتێكدا پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتوون كەستەم هەڵگرن و دادگەری و یەكسانی فەراهەم بكەن، و خۆشەویستیو بەزەیی لەنێوتاكەكانی كۆمەڵگەدا بچێنن، دیارە ئەو ستەمەی كە هەموو پێغەمبەران بۆ نەهێشتن و پاشان دژایەتی كردنی هاتوون هەر لە موسا و شوعەیب و عیسا و موحەمەد (صلى الله علیه وسلم) لەهەموویان بێت، كەهۆكاری سەرەكی كێشەكانی كۆمەڵگاو نەهامەتی و هەژاری و سەرلێشێونی كۆمەڵگەی مرۆیی بوە، تابە ئیمرۆ..لەوەی كە بەملیۆنان لە هەژاری و نەداری و برسیتی و نەخۆشیدا دەمرن، بەهۆی ستەمی دارایی و گەندەڵیەوە و بەرتیل و فێڵ و فێڵكاری لە مامەڵەدا، خواردن و

---

[1]- هود ٨٧

حەپەلوشکردنی سەروەت وسامان و قوتی خەڵکانی هەژارو چەوساوە لەلایەن سەرمایەدارو دەسەڵاتدارانەوە ئەمەش وەك ستەمێکی دارایی، تەنانەت پیاوانی ئاینیش بەشداری تیادەکەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيراً مِنَ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ)[1].

هەروەها خوای گەورە سەبارەت بە جووەکان و کۆتایی و ئەو دەرەنجامەی ڕووبەڕوویان بوویەوە هۆکارەکەی ستەمکاریان بوو کە دەفەرموێت: (وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُوا عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا)[2].

٢- ستەمی کۆمەڵایەتی: بەهەموو جۆرو شێوازەکانییە وە، وەك ستەمکردن لە هەتیووبێ سەرپەرشتەکان، ستەمکردن لە ئافرەت، ستەم لەدەستکورت و ستەم لەبێهێزەکان، وەك لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ (١٧) وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ (١٨) وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا (١٩) وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا..)[3]. هەروەها دەفەرموێت: (أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ. فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ.. وَلَا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ. فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ. الَّذِينَ هُمْ عَن

---

[1] - التوبة ٣٤

[2] - النساء ١٦١

[3] - الفجر ١٧-٢٠

صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ. الَّذِينَ هُمْ يُرَاؤُونَ. وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ)[1]، هەروەها دەفەرموێت: (أَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ.)[2].

هەروەها قورئانی پیرۆز لەچەند شوێندا جەخت لەسەر پێدانی زەکات و خێرو بەخشین دەکاتەوەو هانی باروەرداران دەدات کە یارمەتی هەژارو نەدارو دەستکورتەکان بدرێت، وەك رێگەیەکی بەهەشت و پلەو پایەیەکی رۆژانی دوایی و پاداشتێکی بەهەشتتی دەیناسێنێت، هەروەها ماف و حورمەت و کەسێتیان دەپارێزێت و ئاگارداربوونی باوەڕدار لەوانە و هاوکاریکردن و لەبەرچاوگرتنی مرۆڤەکان بۆ ئەو لایەنە وەك هۆکارێکی دوورخەرەوە رێگرێگ لەبەردەم ئاگری دۆزەخ باسی لێوەکراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّى إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَى وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَى فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّى لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّى وَسَيُجَنَّبُهَا الأَتْقَى الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى )[3].

هەروەها دەفەرموێت: (فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ فَكُّ رَقَبَةٍ أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ) [4]، خوای

---

[1]– الماعون ١–٧

[2]– الضحى ٩–١٠

[3]– الليل ٥–١٨

[4]– البلد ١١–١٧

پەروەردگار بەڵێن دەدات بەوانەی بڕوایان بەو هێناوە، کە ئامۆژگاری و پێشنیاری سۆزو میهرەبانی نواندنیان لێدەکات بەرامبەرخەڵك و دروستکراوەکانی، هەروەها بە بەخشین بەوانەی نەدارو شایەن بەپێویستین، بەم ڕێگەیەش دەتوانن بەرگیری لە ڕێگرتن بەرەو دۆزەخی خۆیان بگرن و ڕوەو بەهەشت برۆن.

هەروەها خوای گەورە سەبارەت بەدۆزەخی بوونی موشرکەکان و هۆکاری چونە ناو ئاگریان باس دەکات، کە ئەنجام نەدانی نوێژو کە ئەمە مافێکی خودایە بەسەر بەندەکانییە وە، دواتر هۆکاری وەك یارمەتینەدانی هەژاران لەڕووی داراییەوە، کەئەمەیان مافی مرۆڤەکانە بەسەر مرۆڤەکانی برایەوە، جا ئەگەر لە سەر ئاینی ئەو بێت یان نا، چونکە بەزەیی هەمەگیرەو هەموان دەگرێتەوە کە دەفەرموێت: (قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ)[١].

دەبینین لەم ئایەتە پیرۆزەدا تاوانی پێنەدانی ژەمەخۆراك بە نەداران وەك تاوانی وازهێنان لەپەرستشی خوای پەروەردگارە، پاشان قورئان جەنگکردنی موسڵمانانی لەپێناو بێهێزو چەوساوەکاندا وەك جەنگکردن بۆ سەرخستنی بانگەوازی خوا ئاینەکەی هێناوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا.)[٢].

---

[1] – المدثر ٤٢–٤٤

[2] – النساء ٧٥

قورئانی پیرۆز له سەردەمی مەککەدا و لەگوتاری مەککەدا، بانگەواز بۆ خۆشەویستیو سۆزو بـەزەیی هاتنـەوە دەکـات لـەنێوان مرۆڤەکانـدا بەتایبەتی سۆزو میهرەبانی نواندن بەرامبەر بیٚ سەرپەرشتان (هەتیوان) بێهێزەکان و نەرمی نواندن بەرامبەر خاوەن پێداویستیەکان و هەژاران و بەخشین پێداویستی پێیان، کە ئەمانە پرسی سەرەکی گوتـاری مەککـە بوون، لەکاتێکدا ئەم گوتارە رووبەڕووی موشریکەکان بـوو، دیـارە ئـەم چـــین ودەســـتە لـــەناو موشـــرکینەکاندا بێبـــەش و بێبـــەریکرابوون، لەهەمانکاتیـشدا بانگـەوازی یەکتاپەرسـتی پەیوەسـت و لکێنراوبـوو بـە بانگـــەوازی خۆشەویـــستیو ســـۆز بەرامبـــەر خـــەڵکان، و دامەزرانـــدنی دادگەری و جیاکاری نەکردنی نێوانیـان مـرۆڤ بـوون تاکـەپێوەربوو لـەو ڕوەوە بوبوە ئامانج و غایەی ناردنی پێغەمبەر و دابەزاندنی وەحی.

هەروەها خوای گەورە سەبارەت ستەمكاری بەرامبەر ژن و زیندەبەچاڵكردنی رەگەزی میٚ لە لایەن بەشێك لەخەڵکی سەردەمی نەفامیەوە کە کچەکانیان زیندە بەچاڵدەکرد دەفەرموێت: (وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ....)[1].

دیارە عەرەبەکان لەسەردەمی نەفامیاندا زۆر رقیان لە ئافرەت و رەگەزی میٚ بوو وەك حەزرەتی عومەر دەفەرموێـت: (سوێندبەخوا ئێمە لە سەردەمی نەفامی و پێش هاتنی ئیسلام هیچ هەژمارێکمان بۆ ئافرەت نەدەکرد و وەك مرۆڤ تەماشامان نەدەکرد، تاوەکو خوای

[1]- التكوير ٨-٩

پەروەردگار سەبارەت بەوان ئەوەی دابەزاند کە پێشتر دانەبەزی بوو لەوشێوە، مافی وای بۆ جیاکردنەوە کە پێشتر بەهیچ شێوەیەك بەوشێوەیە بەشیان نەدرابوو)[1].

هەروەها خوای گەورە سەبارەت بەدیل و گیراوانی جەنگەکان هاتە دەنگ و بەسۆز جولاّوەوە لەگەلّیان و مامەلّەی باش لەگەلّیان و خۆراك پێدانیان کردە هۆکاری چوونە بەهەشتی موسلّمانان: کە دەفەرموێت: (وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنْكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا..)[2].

لەم ئایەت و سورەتانە – کە هەموویان مەکین بێجگە لەسورەتی الانسان– دا هاتنەدەنگ لەسەر کۆمەلّێك پرسی بیرو باوەڕی و مرۆیی و ئاگادارکردنەوەیەکی موشریکەکانی خەلّکی مەککە کەچەندە ستەم وچەوساندنەوەی کۆمەلاّیەتیان تیادا هەبووەو، کەلەو دۆخەش نەداران و بێهێزو هەژارەکان و بێسەرپەرشت و هەتیوەکان و دیلو گیراوەکان و ژن و منالّە بێدەرامەتەکان بوونە قوربانی، بەهۆی ئەو سەرمایەداریە مرۆڤخۆرەی تەنها بەرژەوەندی سەرزلەکانی دەبینی و پەرستنی مالّ و پێگەبوولایان و تەنها بەدەستهێنان و پێگەیشتنی بەلایانەوە گرنگ بوو بووبنە بەندەی و خۆشەویستیان بۆی خۆشەویستیەکی لەرادەبەدەر بوو ئەگەرچی لەسەر حیسابی هەژارو مرۆڤە بێهێزەکانی دەوروبەریان دەبوو.

---

[1]– رواه البخاري في صحيحه ح ٤٩٢٣

[2]– الإنسان ٨–٩

٣- ستەمی چینایەتی: ئاینی ئیسلام بۆ لەناوبردنی بەها نزم و چەپەڵەکانی سەردەمی نەفامی هات کە مرۆڤی بەپێی چین و توێژەکان دابەشکردبوو، جیاکاری کردبوو لەنێوان مرۆڤەکاندا، لەبەرئەوە خوای گەورە هەرزوو ئاگاداری پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم)ی کردەوە کە نەکات بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکاندا بکات و ڕووت نەدا بەهەژارو نەدارەکان و چینە خوارینەکانی کۆمەڵگەو تەنها بیری بەلای چینە بالاو سەرزلەکانەوە بێت،کە دەفەرموێت: (وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِمْ مِنْ شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لِيَقُولُوا أَهَؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ بَيْنِنَا أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ)[١].

هەروەها داوای لەپێغەمبەرکەی دەکرد کە ئارام بگرێت بەرامبەریان و دەفەرموێت: (وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا)[٢].

هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە- وەك لە صەحیحی موسلم- داهاتوە، کە خانەدانەکانی قورەیش داوایان لە پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) کرد کە کۆڕو دانیشتنێکیان بۆساز بکات بەڵام ئەو با هەندێ خەڵکی بەندەو چینی خواری نەهێنێتە ناو کۆڕەکەیانەوە وەك بیلالی حەبەشی

---

[1]- الأنعام ٥٢-٥٣

[2]- الکهف ٢٨

و خەباب و عەماری كوڕی یاسر و ئیبن و مەسعود و صوهەیبی ڕۆمی و هتد.. تا ئەوانە بەرامبەر ئەم پیاو ماقوڵانە نەوەستنەوە، گەر ئەم بێ پێگەو پلانە نەیەن ئەوا ئەم پیاو ماقوڵ و خانەدان و گەورانەی قورەیش گوێ بۆ بانگەوازەكەی ئەو رادەگرن و لەیەك تێدەگەن، بەڵام خوای پەروەردگار پێغەمبەرەكەی خۆی ئاگادار كردەوە لەم داوایەی ئەوان و سووربێت لەسەر دانیشتنی هەموان پێكەوە بێجیاكاری و هەژماركردنی پێگە بۆیان و ئەو چاوی نەچێتەسەر تواناو ماڵ و پێگەی ئەوان، مادام ئەوان لەسەر نەفامی خۆیان بەردەوامن و بیر لەگەورەیی و ستەم و توانای خۆیان و شانازی بەپێگەو ماڵ و سەروەتی خۆیانەوە دەكەن، ئەوبەها نەفامیە نامرۆڤانەیان لا پەسەندبو دەیكەنەپێوەر بۆ دانیشتنەكەیان ئەمیش هەرگیز گوێ لەو خواستەی ئەوان نەگرێت، وەك چۆن پێغەمبەری ئاگاداركردەوە لەوەی كە بەدەم عەبدوڵلای كوڕی ئوم مەكتومی كوێرەوە نەچوو، بەڵكو چوو بەدەم وەلیدی كوڕی موغەیرە كە سەرۆك و خانەدانێكی قورەیش بوو، لەوبارەوە خوای گەورە دەفەرموێـت: (عَبَسَ وَتَوَلَّى أَنْ جَاءَهُ الآعْمَى وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنْفَعَهُ الذِّكْرَى أَمَّا مَنِ اسْتَغْنَى فَأَنْتَ لَهُ تَصَدَّى)[1].

دیارە گەلی پێغەمبەر نوح (سەلامی خوای لێبێت) هەمان بۆچوون و گوتەیان وت كە سەرانی قورەیش بە پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) وت: (قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الآرْذَلُونَ قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ إِنْ

[1]- عبس ١-٧

حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَى رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ)[١]، هەروەها (فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلَّا بَشَرًا مِثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلَّا الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِنْ فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ)[٢]. دیارە وەڵامی نووح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) ئەوەبوو فەرمووی: (وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّهُمْ مُلَاقُو رَبِّهِمْ وَلَكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ)[٣].

خوای پەروەردگار نمونەی خۆبەخوازانین و زیادەرەویکردنی لە پرسی چینایەتی دەهێنێتەوە، سەبارەت بەستەم و بەراوردکردنی خۆی و بنەماڵەکەی لەئاست نەوەکانی ئیسرائیل وەك دەفەرموێت: (إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ)[٤].

ئەو بانگەوازە لەوکاتەدا لەوسەردەمی دابەزینەی قورئان لە مەککەو گوتاری مەککەدا هەمووی بۆ یەکسانی نێوان مرۆڤەکان و بەدیهێنانی دادگەری کۆمەڵایەتی و بڵاوکردنەوەی سۆزو خۆشەویستی بۆخەڵك و لەنێوبڕواداراندا، کەدۆزێکی سەرەکی بوو لەگوتاری قورئانی لەسەردەمی مەکی وپاشانیش مەدەنی.

---

[1]- الشعراء ١١١- ١١٤

[2]- هود ٢٧

[3]- هود ٢٩-٣١

[4]- القصص ٤-٥.

قورئانی پیرۆز بانگەوازی یەکسانی مرۆیی و دادگەری دەکات، تەنانەت لەگەڵ ئەوانەشدا کەدوژمنایەتی ئاین و موسڵمانان و خوادەکەن، ئەوپرسەی وەك واجبێکی ئاینی و برواداری ناساندوە و ستەمکردنی حەرامکردوەو بەرگیری لێدەکات، وەك خوای گەورە لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی کە لەمەککە بوو دەفەرموێت: (وَأُمِرْتُ لأَعْدلَ بَيْنَكُمُ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ.)[1]. هەروەها لەسەر پابەندی بە دادگەری و واجب بوونی ەسەر بڕواداران خوای گەرە دەفەرموێت(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ...)[2]. هەروەها دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ..)[3].

ئیبن و مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: ئەگەر بمەوێت سورەتی نەحل لەقورئان کورت بکەمەوە ئەوا لەم ئایەتەدا هەمووی کۆدەکەمەوە. دیارە بابەتی دادگەری و چاکبوون لەگەڵ مرۆڤەکاندا پەیوەست نەکراوەو کورت نەکراوەتەوە تەنها لەگەڵ بڕواداران و ئەوانەی موسڵمان خۆیان نیشانداوە بەڵکو بێ باوەران و هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە کەلەدەرەوەی بازنەی باوەرەوەن، بۆیە

---

1- الشورى ١٥.

2- المائدة ٧.

3- النحل ٩٠.

بەپێویست زانراوە مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤی برایدا هەردەم مامەڵەی مرۆیی بەرز بکات ئەگەرچی جیاوازی ئاین یان شتی تر لەنێوانیاندا هەبێت،کە خوای گەورە دەفەرموێت: (لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ.)[١].

هەروەها خوای گەروە فەرمان بەبڕواداران دەکات بەوەی فەرمان بە دادگەرانە بکەن و بریار بەدادگەرانە بدەن کە دەفەرموێت: (وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)[٢].

ئامانجی سەرەکی لە ناردنی پێغەمبەران و دابەزاندنی وەحی و کتێبە ئاسمانییەکان بۆ بەدیهێنانی دادگەری و یەکسانی مرۆڤەکانە، وەك ئیبن و قەییم دەفەرموێت: (خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردوە، و کتێبەکانی رەوانەکردوە، بۆ ئەوەی لەنێو خەڵکیدا دادگەری پەیدابێت، ئەو دادگەریەی کە ئاسمانەکان و زەوی وەستاندوە و تێکناچێت، ئەگەر خواستەداگەرایییەکان سەرکەوتن و بەدیهاتن، و سەرزەمینیان نەخشاند بەخۆیان بە هەرشێوازێك ئەوە شەرعی خوایە و ئاینی خوا لەوێیە، پاشان خوای پەروەردگار ئەو رێو شوێنانەی رۆشنکردوەتەوە بەو شەریعەتەی کە ناردوویەتی بۆ ئەوەی لەوێوە دادگەری لەنێوان ببەندەکانیدا بەرقەراربێت، و مرۆڤەکان هەست بەمرۆڤی خۆیان بکەن بەیەکسانیو بەیەکسانی بژین، بۆیە هەر رێگەیەك مرۆڤەکان بباتەوە

[1] الممتحنة ٨.

[2] – المائدة ٤٢.

لای دادگەری و دادو یەکسانی پێ بەرقەراربێت ئەوە لەئاینە.)[١].دیارە ئیسلام بەهاتنی و بەو بنەما ئاسمانیانەوە، گەورەترین شۆڕش بەرامبەر هەموو ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و ئاینییە ی کە ئەوکات عەرەبی تیادەژیا و هەموو ئەو نەنەوانەی تریش کەلەنەفامیدا ژیانیان دەگوزەراند، و لەنێو ستەم و چەوساندنەوەدا بوون بەرپاکرد، پێغەمبەری خودا بەم پەیامە مەزنە و بەورێنماییە ئاسمانییە وە هات، تاوەکو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەودۆخە رزگاربکات و سەرلەنوێ کۆمەڵگەیەکی پڕخۆشەویستی و مرۆڤ دۆست و شێلراو لە دادگەری و یەکسانی لەنێو هەموو چین و توێژەکان و لەهەموو کاروبارەکانی ژیاندا دابمەزرێنێت. دیارە ئەوە ئامانجی سەرەکی هاتنی ئاین و ناردنی پێغەمبەران و رەوانەکردنی کتێبەکانە بەشێوەی وەحی کە خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ.)[٢]، هەروەها دەفەرموێتت: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ...)[٣].

[1]– الطرق الحكمية في السياسة الشرعية ص١٤.

[2]– الأعراف ٢٩.

[3]– الحديد ٢٥.

## بنەمای پێنجەم: برایەتی بڕوادارانەو دەسەڵاتی راوێژکاری

قورئـــانی پـــیرۆز لەســـەردەمی مەکـــەدا مـــژدەی بـــە دامەزرانـــدنی کۆمەڵگـــەی مرۆیـــی بڕوادارانـــەی داوە، وەك خـــوای گـــەورە خـــۆی دەفەرموێت: (وَمَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ، وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ، وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ، وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ، وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ، وَلَمَنِ انْتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبِيلٍ، إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ)[١].

ئەم چەند ئایەتە لەمەککە و پێش ئەوەی دەوڵەتی ئیسلامی لەمەدینەی پێغەمبەر دابمەزرێت، دابەزین، کەباس لە دیارترین خەصڵەتەکانی کۆمەڵگەی نویێ ئیسلامی دەکەن کە دواتر دەبێتە رزگارکەری کۆمەڵگەی نەفامی مەککە کە لەسەر بنەمای ستەم لە خەڵکان و لادان لە راستەقینەو دوژمنایەتی هەژاران و نەداران و چەوساندنەوەیان و بە کۆیلەکردنیان و ژێرچەپۆککردنی بێهێزەکان و ئافرەتان، بونیادنرابوو، لەسەر بنەمای چینایەتی و پێگە و پێوەری خانەدانی دەسەڵات دابەشکرابوو، راوێژ و کاری پرس پێکردن بۆ

---

[1]– الشوری ٣٦–٤٣.

کاروباری خەڵکی تەنها کورتکرابوویەوە لە خانەدان و دەوڵەمەند و دەسترۆیشتوەکانی قورەیش، کەئەوان لە (دارالندوە) راوێژیان دەکرد، بۆ هەژارو کەمدەست و بەندەکان و ئافرەتان و بێهێ.ەکان نەبوو بچنە ناو ئەو کۆڕو کۆبوونەوانەوە، راوێژ تەنها لەنێو ئەو چینە دەسڕۆیشتوەدا بوو، ئەوەبوو قورئانی پیرۆز دابەزی و خوای گەورە لەوبارەوە فەرمووی: (وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ) بەم ئایەتە مژدەدرا بەڵکو بە سورەتی (شوری) هەمووی، مژدەی ئەوە دراو کە کۆمەڵگەیەکی نوێ دادەمەزرێت کە تیایدا چینایەتی و نەفامی تێدا نییە، بەڵکو لەسەربنەمای برایەتی مرۆیی بونیاددەنرێتـ، کاروباری بڕواداران بەراوێژ لەنێوان یەکتری دەچێت بەرێوەو هیچ جیاکاریەك لەنێوان ئازاد و بەندە نییە، لەنێوان ژن وپیاودا نییە، لەنێوان کەسی خاوەن رەچەلەك و بێ رەچەڵەك نییە، لەنێوان بەهێزو بێهێز و لەنێوان هەژارو دەوڵەمەنددانییە، بەڵکو هەموویان بەدەم خواست و بانگەوازی خواوە دەچن و نوێژ دادەمەزرێنن و راوێژ لەنێوانیاندا دەگوزەرێت، کە ئەمە لەدیارترینی خەصڵەتەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی کە لە مەککەدا دەبوو درووست ببێت و پێش ئەوەی لە سەر ئەزری واقیعدا لە دەوڵەتی مەدینەدا ببینرێت.

دیارە ئایەتی (شوری– راوێژ) بە شێوازی رستەی ناوی هاتوە (أمرهم) لەزمانی عەرەبیدا موبتەدایە، (شوری بینهم) خەبەرەکەیەتی، کەواتای جێگیری و ئەرێنی دەدات، وەك ئەوەی ئەو خەسڵەتە

هەڵوەشانەوەی نییە و جێگیرە، بڕواناکرێت کە ئەو خەصڵەت و کردەیە لەناو کۆمەڵگەی بڕوادارانەد بڕوات وا بۆ کاروباری ژیانیان لە پیادەکردن بکەوێت، بۆیە خۆسەپێنی لە راوبۆچوونەکاندا نییە، دەسەڵاتداری نەبەستراوەتەوە بەکەسێ یان بە دەستەیەکی دیاریکراوەوە، سامان و دارایش بەهەمان شێوە بۆهەموانە، چینایەتی لەم کۆمەڵگە نوێیەدا رەتکراوەتەوەو نییە، هەروەها قورئانی پیرۆز فەرمان و کاری بۆ موسڵمانان سەربارکردوە، لەگەڵ تایبەتمەندی و پرسی مافێتی دەفەرموێ (أمرهم) بۆ جەختکردنەوەیە لەسەرئەوەی کە ئەو کاروبارو فەرمانانە بۆ بڕواداران بەگشتیە نەك بۆ ئەوانێکی تر، لە پاشاو ستەمکارەکان، یان پێڕێکی دیاریکراو لەمانیش، بەڵکو هەموویان بەشدار وەکو یەك، نە خێڵێك نەدەستەیەك نە خێزانێك نەبنەماڵەیەك نەپارتێك نە نەتەوەیەکی دیاریکراو دەتوانێت ئەمە بۆخۆی قۆرخبکات. هەروەها ئەم ئیزافەو سەرباریەی کە واتای هەمەگیرو گشتێتی دەدات وەك لە زانستی رەوانبێژی(بەیان) و بنەماکانی فیقهدا هەیە بۆ دەستەواژەی (وأمرهم) هەموو کاروبارێك دەگرێتەوە، پرسی کاروبار و فەرمانەکان دەچێتە بواری بەرێوەبردن و کارگێری و سەرۆکایەتیکردنەکان و خەلافەتەوە، کە سەرۆکایەتی و خەلافەتکردنی گەل سەری هەمووکاروبارەکانە، عەرەب کەدەستەواژەی (أمر) بەکاردەبات و مەبەستی لە دەسەڵات و سەرۆکایەتیە، کاتێك دەوترێت (تقلد أمرهم) واتە سەرۆکایەتیان و گەورەییان و میرایەتی کردنیان،

بۆنموونه وتەی شاعێرێکی سەردەمی نەفامی (لەقیتی ئیادی) لەو قەصیدەیەدا بۆ قەومەکەی نوسیوە هاتوە دەڵێت:

**وقلدوا أمركم دركم رحب الذراع بأمر الحرب مضطلعا..**

کە مەبەستی (ئەمیرایەتیکردن) وشەی (أمر) ی بەکابردووە.

هەروەها لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە دەفەرموێت: (اطيعوا الله واطيعوا الرسول واولي الامر منكم) مەبەست لە (اولي الامر) لێرەدا ئەمیرو سەرکردەکانن، ئەوانەی پێویستە گوێڕایەڵیان بکرێت کەدەچێتە ناو خانەی گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەیەوە، کەئەم شێوە گوێڕایەڵیەش بەدرێژی لە بنەما پراکتیکاندا باسی لێوەکراوە. مەبەست لەمە ئەوەیە کە برایەتی بڕواداریانە تایبەتیترە لە برایەتی مرۆییانە، پەیوەندیەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا لە سەر تاکەکانی دەوەستێت و لەسەر بنەمای برایی دەبن، کەخۆی لە یەکسانی و یەکشێوە تەماشاکردنی مرۆڤەکان، درووست دەبێت لەنێوان تاکەکاندا، سەرباری ئەوەی دەبێت لەگەڵ ئەوبرایەتیەدا سۆزو میهرەبانی نواندنی جەدەلی و بەزەییهاتنەوەو پشتی یەککگرتن ئامادەیی هەیە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ)[١].

هەروەها وەك لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە دەفەرموێت: (موسڵمان برای موسڵمانە، ستەمی لێناکات، سەرشۆڕی ناکات، رقی لێی نابێتەوە، تەسلیمی دەستی دوژمنی ناکات، رقبوونەوە لەبرای خۆ، بەسە وەك

[1]– الحجرات ١٠.

تاوان و شەڕ لەگەردنی مرۆڤدا بێت، چونکە هەموو شتێکی موسڵمان لەسەر برا موسڵمانەکەی حەرامکراوە، خوێنی وماڵی و نامووسی)[١].

هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە (بڕوادار نییە ئەو کەسەتان تا ئەوەی بۆ خۆی دەیەوێت بۆ براکەشی نەوێت)[٢]. هەروەها دەفەرموێت: (موسڵمانان خوێنیان وەك یەك وایە، دەستێکن لەسەر ئەوانی تر، لەسەر شان و گەردنیانە ئەوەی دەیخەنە سەرشانیان ئەگەرچی نزمەکانیش بن) [٣]، مەبەست لێی ئەگەرچی ئافرەت یان کەمئەندام یان لەوانەبن کە جیهادیان لەسەر نییە ئەگەر بڕیارێکیاندا یان کرێ یان هەرشتێ بیخەنە گەردنیانەوە ئەوە لەسەرشانیانە.. (وەرگێر) وەك هاتوە سەبارەت بە ئافرەتان (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ..)[٤]، هەروەها لەفەرمودەدا هاتوە(انما النساء شقائق الرجال)[٥].

ئەو برایەتیە کە یەکسانی لەخۆدەگرێت بەهەمان شێوەش خۆسەپاندنی کەسێك لەسەر کەسێکی تری قبوڵ نییە و تەنها بۆخۆویستی دەداتە دواوە، مەگەر لەو شتەی کەمافی پێوەی هەبێت

---

[1]– رواه مسلم في صحيحه ٢٥٦٤.

[2]– رواه البخارى ح ١٣ ، ومسلم ح ٤٥.

[3]– رواه ابوداود ح ٤٥٣٠ والنسائي ح ٤٧٣٨.

[4]التوبة، ٧١.

[5]رواه ابوداود ح ٢٣٦ والترمذي ح١١٣ باسناد حسن.

بەڵکو دادگەری و یەکسانی پەیڕەو دەکات و هیچ جیاکاریەك لەنێوان تاکەکانی بروادرادا ناکات، و هیچکامیان بەسەر ئەویی تردا لە بەرژەوەندی لایەك لەلاکەی تر نابرێت و بەڵکو تەنها بەماف و بەکاری چاکە لەلای دینی خوا لەپێشترەوە دەبن.

ئەم هەموو واتاو بەهایانەی کە گەلان پێویستی تەواویان پێیانەوە تینویانن ئیسلام هێناونی، هەموو ئاینە ئاسمانییە کانیش پشتگیرو تەواوکاری ئەم بەهابەرزو مرۆڤانەیان لەلا مەبەست بووە.

ئاشکرایە یەکەم کاری پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کاتێ گەیشتە شاری مەدینە پاش بونیادنانی مزگەوتەکەی، بریتی بوو لە درووستکردنی برایەتی درووستکردن لەنێوان پشتیوانانی ئاین و کۆچەرەکان بوو، ئەوەش بۆ جەختکردنەوە لەو شێوازە پەیوەندیە نوێیەی کە کۆمەڵگە نوێیەکە پێویستی بوو، کە لەسەر بنەمای برایەتی نموونەیی بوو، لەم برایەتیەدا جیاکاری نەبوو لەنێوان خانەدانێك و کابرایەکی رەشۆکی (رەعیە) لەم برایەتیەدا بەندەو خاوەن بەندە بوونی نییە، بەهێزی و بێهێزی بوونی نییە، چینایەتی و تاقمگەرایی و خێڵایەتی و دەمارگیری بوونی نییە،بەڵکو هەموو لەبرایەتی و ئایندا وەکو یەك بوون، هەموویان پێکەوە پەیوەندی دەگرن، راوێژ دەکەن، کۆشش لەپێناو خوادا پێکەوە دەکەن، بەم بنەما رەسەنە مەزنە، کە لە مەککەی پیرۆز بەئەنجام گەیشت لەنێوان براوادارانداا پێش ئەوەی کۆچبکەن و بونیادی دەوڵەت دابمەزرێنن، کە بەم بنەمایە حەمزەی هاشمی و عومەری قورەیشی و صوهەیبی رۆمی و بیلالی حەبەشی وەك

یەکیان لێهات و یەکسانکران، موسڵمانان توانیان یەکەم دەوڵەت لەسەر ئەم بنەمایە دابمەزرێنن.

یەکەم کۆمەڵگەی مرۆیی کە جیهان بەخۆیەوە بینیبێتی، کە برایی مرۆیی تیا چەسپا، برایەتی بڕوادارانە لەنێوان هەموو تاکەکانی بەدیارکەوت، ئەوەی لە ئەحکام و یاسادانان کەڵەکەبوو، هەموو ئەو جیاوازیانەی کە کۆمەڵگە نەفامی لەسەر بونیادنرابوو کە جیاکاری کردبوولەنێوان خەڵکاندا لەسەر بنەمای رەگەز و جۆر و رەنگ و چینایەتی، تەنانەت پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرموی بە ئەبوبەکر سەبارەت بەسەلمانی فارسی و سوهەیبی رۆمی بیلالی حەبەشی کاتێ توڕەبون و توندیان نواند سەبارەت بە ئەبووسوفیان دوای فەتحی مەککە، کاتێ ئەبووبەکر رێگیری لێکردن لەوە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمووی:(ئەی ئەبووبەکر لەوانەیە رقت لێیان کەوتبێت؟ ئەگەر رقت لەوان کەوتبێت ئەوە خوات لەخۆت رەنجاندوە)[1]. تەنانەت پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) سەبارەت بەسەلمانی فارسی دەفەرموێت: (سەلمان لە ئێمەیە و لە ئال و خانەوادەی منە)[2]. تەنانەت عومەر دەیفەرموو: (ئەبوبەکر گەورەمانە، گەورەیەکمانی ئازادکردوە لەکۆیلایەتی، مەبەستی بیلال بوو)[3]. بیلالی حەبەشی ئەو کۆیلەیەی کە بەقامچی لەلایەن گەورەکەیەوە لەسەردەمی نەفامی

---

[1] رواه مسلم في صحيحه ح ٢٥٠٤.

[2] رواه الطبراني وقال الهيثمي في مجمع الروائد ٦/١٣٠.

[3] رواه البخاري ح ٣٧٥٤.

لەقورەیش لێیدەدرا، کەچی سەرۆکی دەوڵەتی موسڵمانان و مرۆڤایەتی عومەر بەگەورەی خۆی باسی لێوەکردوە، ئەوەیە کۆمەڵگەی راستەقینەی یەکسانی و ئازادی.

لە فەرمودەدا هاتوە (سالم ئەو کەسەی کە بەندەی ئەبوحوزەیفە بوو جاران، لە مزگەوتی قەبادا پێش نوێژی بۆ کۆچەریە یەکەمینەکان و هاوەڵانی پێغەمبەر کەتیایاندا ئەبوبەکر و عومەر هەبوو، کرد).[١]

هەموو ئەمانە وەك شۆڕشێك و هەڵگەرانەوەیەك بوو لەبەهاکانی کۆمەڵگەی ئەوکاتە و گۆڕانکاریەکی ریشەیی بێنموونە بوو لەمێژووی مرۆڤایەتی، لەکۆمەڵگەیەکدا کە لە هەموو کۆمەڵگەکانی تر چینایەتی و پر لەکەش و فشی گەورەکان و جیاکاری لەنێوان توێژە کاندا وتاکەکانیدا بەپێی پێگەو پایەو خانەدانی و نەسەب و ریشەی کۆمەڵایەتی!

[1] رواه البخاري ٧١٧٥.

# بەشی دووەم:
# بنەماکانی گوتاری سیاسی پێغەمبەر
## ( صلى الله عليه وسلم )

ئەگەر ئەو بنەمایانەی پێشتر هێنامانن و ئاماژەمان پێدان لە بەشی یەکەمدا– بریتی بوون لە یەکتاپەرستی خوداو رێزو شکۆمەندی بەمرۆڤ، وئازادی بۆ خەڵك و ئازادکردنی لەهەموو شێوازێکی بەندایەتی، پاشان بەپێویست زانینی دادو یەکسانی و چەسپاندنی برایەتی ئیمانی کە تیایدا یەکسانی تەواوەتی بەرقەرار بێت و بریاردان بە راوێژو رەتکردنەوەی تەواوەتی ستەم و زیادەرەوی– لەدیارترینی بنەماکانی گوتاری سیاسی قورئانی بن، کە توانیان کێشەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگەو دەوڵەت چارەسەر بکەن، ببنە چارەسەرێکیش بۆ هەمو ئەو کێشەو گرفتە سەرەکیانەی کە هەر گوتارێکی سیاسی هەیبو ئەوانیش:

١- سروشتی دەسەڵات لە کۆمەڵگەدا، کێ مافی هەیە لە پاشایەتی و سەرۆکایەتی و فەرمانڕەوایەتی و گوێڕایەڵی بۆ کردندا؟.

٢- راستەقینەیی مرۆڤ و شوناسەکەی، ڕیشەی مرۆڤ و پەیوەندی مرۆڤ بە برای مرۆڤیەوە، لە بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا.

٣- مافەکانی مرۆڤ کە جێگیربن لە ناو کۆمەڵگە، کە مرۆڤ شاد بێت پێیان و شادبێت بەو ئازادیە مرۆییەی کە لەناخیەوە هەڵگریەتی.

٤- بەهامرۆییەکان ئەوانەی کە پێویستە رابەرایەتی کۆمەڵگە بکەن، چەمکەکانی داد و یەکسانی، هەروەها چۆنییەتی جێبەجێکردن و دابەزاندنیان لەسەر ئەرزی واقیع لە دەوڵەتێکی دادگەرو نموونەییدا.

ئەگەر گوتاری قورئانی جەختی لەسەر ئەم بنەمایانە کردبێتەوە، بێگومان گوتاری پێغەمبەریش کۆمەڵێك بنەمایەك دەگرێتە خۆ کەداچۆڕاوی ئەمانەبن و کەمتر نەبن لە ڕووی بایەخەوە بۆ سروشتی سیستمی سیاسی ئیسلامی. وەك وتمان کە جۆرێکن لە داچۆڕاندن وبەیانکردنی ئەو گوتارە قورئانییە و درێژەپێدان ودابەزاندنی بە شێوەیەکی پراکتیکی، لەو بنەمایانەش:

## بنەمای یەکەم: پێویستبوونی دەوڵەت و پێویستی و واجب بوونی کۆمەڵ

دیارە ئەم بنەمایە لەو گوتەیەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) لە مەککە بە مامی گوت، بەرۆشنی بەدیار دەکەوێت کە فەرمووی (من تەنها یەك دەستەواژەم لەوان دەوێت کە عەرەب ملکەچ بن بۆیان و ببێتە هۆکاری ئەوەی عەجەمیش سەرانەیان پێبدات) وتیان کامەیە؟ ئەویش فەرمووی: (قولوا لا اله الا الله).[1] واتە هیچ پەرستراوێکی بەهەق و ملکەچبۆکەرو فەرمانڕەواییەك کە فەرمانبەرداری بەراستەقینەیی لەنێواندا بکات نییە بێجگە لە خوای تاقانە.

ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیة وسلّم) لەوانی دەویست زیاتر بوو تەنها لە وازهێنان لە بتپەرستی، بەڵکو ملکەچ و گوێڕایەڵی ڕەهای بۆ خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی لەوان دەویست، ئەوەی مەبەست بوو لە وتنی (لا اله الا الله) بریتی بوو لە راستەقینەیی ئەو پەیامەی خوا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّهِ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَحِيمًا..)[2]

دیارە ئەوەبوو کە عوتبەی کوڕی ڕەبیعە پەی پێبردبوو زانیبووی کاتێك قورەیشیەکان ناردیان بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کە کۆمەڵێك پێشنیاریان خستبوە بەردەم پێغەمبەری خوا (صلّ

---

[1] احمد في المسند ح ٢٠١٧، والترمذي ح ٣٢٣٢ وقال حسن صحيح.

[2] النساء ٦٤.

الله عليه وسلّم) لەماڵ و گەورەیی و پێگە و..هتد بەرامبەر وازهێنانی لەو بانگەوازەی، ئەویش سورەتی (فصلت)ی بۆ خوێندەوە و پاشان عوتبە گەڕایەوە بۆ لای قورەیشیەکان، بەڵام بەورەنگەی نا کە چووبوو بۆ لای، بە سەرانی قورەیشی وت: (ئەی خەڵکی قورەیش واز بهێنن لەوەی کە لای ئەو پیاوەیەو دەیەوێت، سوێند بەخوا من هەواڵێکی زۆر مەزن و شتێکی بێنمونەم لێ بیستوە، ئەگەر عەرەبەکان ڕووبەڕووی بونەوە توانیان کپی بکەنەوە ئەوە دیارە ئیتر ئێوە رزگارتان بوە لێی، خۆئەگەر زاڵ بوو بەسەر عەرەبدا و ئەو پەیام و نیازەی خۆی هەیەتی بە ئەنجام گەیشت و ملی عەرەبی کەچ کرد بۆی ئەوەدیارە ئێوەی پێ سەربەرزدەبن، ئەوکات سەربەرزی ئەویش دەبێتە سەربەرزی ئێوە و ئێوە پێی دەبن بە بەختەوەرترین مرۆڤەکانی سەرزەوی.)[1].

بۆیە دەبینین عوتبەی کوڕی رەبیعە باش لەناواخنی پەیامەکە گەیشتوە، ئەوپەیامە دواتر بەلای دەسەڵات و گوێرایەڵی و ملکەچی و دەسەڵات و دەوڵەتێکدا دەڕوات کە فەرمانداری هەموو عەرەب بکات!

ئەوەش مانای ئەو ئاینەیە کەوا قورئان فەرمانی پێدەدات کە دابمەزرێت و هیچ جیاوازی و رارایيەکیان لەبارەیانەوە نەبێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت لە سورەتی شوری (أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ۚ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ)

[1] المغازي والسير لابن اسحاق و تهذيب ابن هشام ١٣١/٢.

## گرێدراوی نێوان ئاین و دەسەڵات و سیاسەت

ئاماژە لەگوتەی (الدین) لەسەر پەیوەندی دەوڵەت و دەسەڵات ئاماژەیەکی گوتەیی زمانەوانییە، پێش ئەوەی ببێتە پێویستیەکی شەرعی و لۆژیکی، چونکە لە زمانی عەرەبیدا وشەی دین چەند مانای جۆراو جۆری هەیە کە لەمانە دەرناچێت:

یەکەم: دین بەواتای دەسەڵات دێت، وەك لە وتەی خوای پەروەردگار هاتوە لە چیرۆکی پێغەمبەر یوسف (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (ما كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ)[1] واتە بۆ یوسف نەبوە کە براکەی بگرێت و لەسەر شێوازی دەسەڵاتو دەوڵەتی پاشای ئەوکات بیکات بەندەی خۆی، ئیبن و جەریر لە تەفسیری ئەم ئایەتە و لەئیبن و عەباسەوە زوحاکەوە دەیهێنێت کە ئەوان وتوویانە (دین الملك= دەسەڵاتی پاشا) هەروەها قەتادەو ئیبنو زەید و ئەلسیدی (دین الملك— فەرمان و بریاری ئەو) لێکیان داوەتەوە، ئیبن و جەریر دەلێت هەرچەند راکان جیاوازبن لەسەر واتای (دین الملك)، بەڵام نزیکیان لەواتادا هەیە، چۆنکە ئەوەی بەپێی دەسەڵاتی پاشا کەسێك بگرێت، شێوازی مامەڵەی لەگەڵی هەمان شێواز دەبێت، دیارە بە رەزامەندی ئەو بوەگرتنەکەی نەك بەمانا غەیری ئەو، ئەوەش بەمانا بەپێی فەرمان و بریارەکانی ئەو حوکمی بەسەردا دەدرێت، دیارە حوکمدان بەسەری ئەوە بڕیارو

---

[1] یوسف ٧٦.

فەرمانەکەیەتی کە جێبەجێکراوە، لێرەوە بنەمای ئاین بەگوێرایەڵیکردن و جێبەجێکردنی فەرمانە.

دووەم دین بەواتای گوێڕایەڵی و ملکەچی دێت: بۆئەمەش خوای گەورە دەفەرموێت: (لا اکراه في الدين)[1]، واتە هیچ زۆرەملێکردنێك لە گوێڕایەڵی پێکردن و ملکەچی نواندیێکدا بوونی، وەك ئیبن و جەریر پێشتر وتی (بنەمای دین بریتییە لەگوێڕایەڵی).

سێیەم: دین بەواتای لێپرسینەوەو پاداشت دێت: وەك لەقورئاندا هاتوە دەفەرموێت: (مالك يوم الدين) واتە پاشای رۆژی لێپرسینەوەو پاداشت دانەوە.

لە قاموسی (لسان العرب)دا هاتووە کە واتای دین: الديان یەکێکە لەناوەکانی خوای گەورە، بەواتای دادوەرو بڕیاردەر دێت، ئەوەی بڕیار بەسەر کەسەکان دەدات و ملکەچیان دەکات بە فەرمانەکانی، نمونەی فەرمودەش لەمبارەوە: (اريد من قريش كلمة تدين بها العرب) واتە گوێڕایەڵ و ملکەچی بۆ بنوێنن، پاشان يوم الدين: واتە رۆژی پاداشت، (دانه دينا) بەواتای پێدانەوەو پاداشتکردن دێت، هەروەها الدين– واتە لێپرسینەوە و حیساب دێت.

هەروەها الدين: واتای گوێڕایەڵی، عەرب دەڵێت: (وقد دنته ودنت له) بەمانا گوێرایەڵی بوویت، عەمروی کوڕی کەلسوم دەڵێت:

---

[1] البقرة ٢٥٦.

وایام لنا غر طوال عصینا الملك فیها ان ندینا.

بۆیه که دەوترێت الدین لله: مەبەست لێی گوێڕایەڵی و بەندایەتی بۆ خوایە.

که دەوترێت: ودانه دینا: واته ملکەچ بوو کردی بەکۆیلە.

ودنته أدینه دینا: واته پەروەدەکردن و چاودێری کردنی گرتەخۆ و بەموڵکی خۆی کرد

ودینته القوم: واته سیاسەت و بەڕێوەبردنیانی گرتە ئەستۆی خۆی.

هەروەها الدین: دەسەڵات و ملکەچی بۆی، له فەرمودەی خەوارجەکاندا هاتووە (یمرقون من الدین) خەتابی له موبارەکەوە دەڵێت: واته مەبەستی له وشەی (الدین) ملکەچیە، واته دەچنه دەرەوەی گوێرایەڵی و ملکەچی بۆ فەرمانەکانی پێشەوایەك که پێویست بوو ملکەچی بن و هەڵئەگەرێنەوە لێیی) ئەمه له قاموسی لسان العربدا هاتووە.

هەروەها لەهەمان قامووسدا هاتوە: واته گوێڕایەڵی پاشا نەبوون و نەشبونەتە بەشێك له موڵکی ئەو له سەردەمی نەفامیشدا نەکەوتونەتە ژێر هێرشی دوژمنەکانیانەوە کەبتوانن کچیان بەسەبایا ببرێن. ئەمەش عەرەبێکی دەشتەکی سرودێکی لەم بارەوە وتووە:

**لعمر أبيك والأنباء تنمي لنعم الحي في الجلي رياح**

**أبوا دين الملوك فهم لقاح إذا هيجوا الى خرِب اشاحوا)**

وتەی شاعیر لێرەدا (أبوا دین الملوك) واته ملکەچ و چونه ژێر رکێفی دەسەڵاتی سوڵتانەکانی ئەوانیان رەتکردوەتەوە. ئیبن و جەریر تەبەری

لە تەفسیری ئایەتی دەڵێت (ولا یدینون دین الحق) واتا: ملکەچنەبوون و گویرایەڵیکردنی فەرمانی راستەقینەی خوا، واتە ئەوان گوێرایەڵی فەرمانەکانی ئەهلی ئیسلام نابن، هەموو گوێرایەڵبوویەکیش بۆخۆی خاوەنی دەسەڵات و لەزمانی عەرەبیدا بە (دائن) بانگدەکریٚ، وەك دەوترێت لەبارەیەوە (دان فلان لفلان فهو یدین لە دینا) واتە فلانەکەس بو بە خاوەنی یان کویٚ لەمشتی فلانی تر. (زوهەیریش لەو بارەوە دەڵێت:

**لئن حللت بجو في بني اسد...في دين عمرو وحالت بيننا فدك**

ئەگەر ئەوە وابوایە لە دۆڵی (جو) لای خیڵی بەنی ئەسەد...ملکەچ و گویٚ لەمشتی عەمری کوڕی هند بونایە ئەوا لەنێوانمان (فەدەك- گوندێکە لە خەیبەر) ڕوویدەدا.

ئەو واتایانە بۆ وشەی دین لە زمانی عەرەبیدا و لە قورئان بەکاربراون هەموویان لەدەورو خولی واتای گوێڕایەڵی و ملکەچی و دەسەڵات و فەرماندار و بریاردان و پاداشت دانەوە دێن. هەموو ئەم ئەواتایانە گرێدراویەك لەنێوانیاندا بەدیدەکرێت، پاشاو دەسەڵاتدار ئاماژەن بۆ دەسەڵات، دەسەڵاتیش ئاماژەیەکە بۆ سیاسەت و بەڕێوەبردنی کاروبار، ئەوەش دیارە پێویستی و ئاماژەن بۆ حوکم و فەرماندان لەنێوان خەڵکی و لەکاروبارو پرسە جۆراوجۆرەکانیان، کە ئەمەش بۆخۆی ئاماژەیەکیشە بۆ بابەتی گوێرایەڵی و ملکەچی و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی دەسەڵات، دیارە هەموو گویرایەڵیەك و پێچەوانەکەی بۆخۆی شایان بە پاداشتن، هەموو پاداشتێکیش هەردوو

ڕەگەزی بەخشش و سزایە، هەموو ئەمانەش لەدەورو خولی یەك واتادان ئەویش جەختکردنەوەیە لەسەر سروشتی ئەم دینە کە بریتیە لە ئیسلام، کە بەواتای تەواو تەسلیم بوون بۆ فەرمانەکانی و حوکم و بڕیارەکانی ئەو نەك بۆ پاشاو دەسەڵاتدارانێك ستەمکار،

هەروەها ناکرێت لەڕووی شەرع و لەڕووی زمانەوانییە وە دین لە دەسەڵات و حوکم و سیاسەت و دادگا، جوێبکرێتەوە، وەك لە فەرمودەدا هاتوە: (دانەو پێکهاتەکانی ئیسلام دانە دانە کەمدەکەن و جوێدەبنەوە، یەکەم و سەرەتا بە دەسەڵات دەست پێدەکات و کۆتاشی بە نوێژ دێت)[1]. بەڵام عەرەبەکان لە وشەی دین تێنەگەیشتون تەنها ئەوە نەبێت کە دین بریتیە لە گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەری خوا و ملکەچی بۆ داواو حوکم و فەرمان و بڕیارەکانی وەك ئەوەی خوای پەروەردگار فەرمانی کردوە، هەروەها عەرەب تێنەگەیشتون لە دین بەوەی کە کورت دەکرێتەوە لە باوەڕی ناخ و یان بیروباوەڕی، بەڵکو ئەو واتایەی دین بەواتای بیروباوەڕ دێت، بەبێ ئەوەی واتای ملکەچی و گوێرایەڵی و شوێنکەوتەیی بدات وەك ئەوەی هەر لەزمانەکەی ئەواندا وشەکە نەهاتبێت و مانای نەزانن.

قاموسی (لسان العرب) جەخت لەسەر واتای پەرسشتش و بەندایەتی دەکاتەوە بەم شێوازە هێناویەتی و دەڵێت: (بنچینەی بەندایەتی گویێ لەمشتی وملکەچی نواندنە، هەروەها پەرستشیش فەرمان جێبەجێکردنە

---

[1] صحيح ابن حبان رقم ٦٦٠.

لەگەڵ ملکەچ بوون، (وقومهما لنا عابدون) واتە بچووکی و خزمەتگوزاری بۆ ئێمە دەکەن، هەرکەسێ بچوکی و خزمەتگوزاری بۆ پاشا نواند ئەوە بەندەیەتی، (واعبدوا ربکم) واتە گوێرایەڵی فەرمانەکانی پەروەردگارتان بن).

هەرچی دینە بەمانا شەرعیە گشتیەکەی ئەوە هەمووی دەگرێتەوە کە بریتیە لەباوەڕ و ئیسلام و چاکبوون، واتە هەموو ئەوەی خواوە بۆ پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) هاتووە لە هەواڵ و ئەحکام و شەریعەت و بیروباوەڕ و ڕێنوینی مامەڵەی پراکتیکی، هەمووی ئیسلامە وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً)[1]، هەروەها ئەوەی لەو فەرمودەیەی کە لە لایەن جیبریلەوە پرسیار دەکرێت لە باوەڕو ئیسلام و چاکبوون پاشان فەرمووی ئەوە جیبریل بوو هاتبوو تا ئاینەکەتان فێر بکات، کە واتای ئەو ئایەت پیرۆزەیە دەفەرموێت: (إن الدين عند الله الاسلام).(٢)

---

[1] المائدة ٥.

[2] ال عمران ١٩.

## پایەکانی دەوڵەتی ئیسلامی:

دیارە لەگوتاری قورئانی و پێغەمبەرایەتیدا پایەکانی دەوڵەت دیاریکراون و بەرچاوخراون کە "خۆیان لە زەوی، گەل، دەسەڵات، ئەو سیستمەی کە جۆری فەرمانڕەواییتی دیاریدەکات و کاروباری گەڵ بەڕێوە دەبات، رێکخەری و کارگێڕی کاروباری گشتی دەبێت بە پێی ئەحکامەکانی، بەڵگەش بۆ ئەمانە ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم: خوای گەورە دەفەرموێت: (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ).[1].

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەو پایانەی کە دەوڵەتی لەسەر دادەمەزرێت بەرچاوخراون ئەوانیش: ئەو گەلە بەڵێنپێدراوەی کە شایەنی جێنشینایەتیە، ئەو زەویەی کە پشتاو پشت ماوەتەوە بۆیان کە لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا درێژدەبێتەوە، دەسەڵات و فەرمانڕەواییەکی رەواپێدراو لەلایەن گەلێکەوە کە شایەنی جێنشینایەتی و سەقامگیرین، ئەوسیستمەی کە شێوەی دەوڵەتەکەو چۆنییە تی بەڕێوەبردنی رێکدەخات، ئەو دینەی کە خوای پەروەردگار بۆ ئەوانی پێرەواو رەزامەندە لەسەری کە ئەویش ئیسلامە.

---

[1] االنور ٥٥

دووەم: خوای گەورە دەفەرمویّت: (الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ)(١).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پاش ئەوەی لە ئایەتی پیشوودا پایەکانی دەوڵەتی دیاریکرد،" زەوی، هەروەها ئەو گەلەی کە باوەڕی بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە، ئەودەسەڵاتەی کە ئەرکی چەسپاندن و سەقامگیری ئاسایش و ژیانی خوڵکە، هەورەها ئەوسیستمەی کە کە تایبەتمەندی خۆی هەیە کە جۆری فەرمانڕەوایەتی ئیسلامی دیاریدەکات جویّی دەکاتەوە لەئەوانی تر، ئەویش ئیسلامێکە کە بە دادو یەکسانی مرۆیی هاتووە.

سێیەم: ئەوەی لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە: (إن الله زوى لي الأرض فرأيت مشارقها ومغاربها، وإن أمتي سيبلغ ملكها ما زوى لي منها).(٢)

لەم فەرمودەیەدا پایەکانی دەوڵەت وەك ئەوەی فیقهی دەستووری سەردەم ناساندوویەتی، دەستنیشانکراوە، کە باسی لە زەوی وسنووری جوگرافیەکەی دەکات، ئەوگەل و نەتەوەیەی کە پاشایەتی و دەسەڵات دیاری دەکات بەهەمان شێوەش بابەتی ماف و شایانی و پسپۆڕیەکەی بۆ لەبەرچاو دەگرێت، پاشایی لێرەدا بریتیە لەدەسەڵات جێبەجێکردن و سەرکردایەتی کردنی گەل لەسەر زەویەکەی، لەم فەرمودەیەدا ئەوە رۆشنکراوەتەوە کە زەوی هی سەرکردەو جێنشینەکان نییە، هی گەورە پاشاو سەرۆکەکان نییە، بەڵکو لە ئیسلامیشدا پاشایەتی بوونێکی نییە، بەڵکو زەوی هی گەلە بە حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی. هەروەها پاشایەتی و

---

[1] لحج ٤١.

[2] مسلم ٢٨٨٩ والوداود ح ٤٢٥٢

دەسەڵاتدارێتی و سەرۆکایەتی و جێنشینایەتی هەر بۆ گەلە و هەموویان ئەودیاریان دەکات، وەك لە گوتەی فەرمودەی (ملك أمتی) نەك هی پارتێك یان بنەماڵەیەك یان تاقمێکی سیاسی یان گەلێکی دیاریکراو، بەڵکو ئەمانە هی نەتەوەن و گەلەکانن بەهەموو چین و پێکهاتەکانیانەوە. چوارەم وەك لە دەستووری مەدینەو لاپەرەکانیدا هاتوە کە پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) لەکاتی چوونی بۆ مەدینە نوسیەوە، هەموو پێکهاتەکانی گەل و دانیشتوانەکانی دیاریکرد، هەروەها ئاماژەی تەواوی بۆ پێکهاتەی دانیشتوانەکەی کرد لەوانە: (بڕواداران و موسڵمانانی قورەیشی و یەسریبی– واتە کۆچەرو پشتیوانان– پاشان ئەوانەی دێنە ناویان و تێکۆشانیان لەگەڵدا دەکەن، ئەمانە یەك گەلن، جووەکان گەلێکن لەموسڵمانان، بەڵام بۆ جوەکانە کە ئاینی خۆیان هەبێت و موسڵمانانیش بەهەمان شێوە، بۆ جولەکەو موسڵمانان هەریەك لای خۆیەوە بۆ خۆیان خەرجی و تێچوون و ژیانی خۆیان دەبەن بەڕێوە، لەنێوانیاندا پشتیوانی و سەرکەوتن هەیە، شاری یەسریب حەرامە ناوی و دەبێت پارێزراو بێت بۆ هەریەکەیان، هەرکە بچێتە دەرەوەی پارێزراوە، ئەوەی تیایدا بمێنێتەوە بەهەمان شێوە، لەهەر شتێکدا جیاوازی و ناکۆکیەك ڕوویدا ئەوە دەگەڕێنەوە بۆ لای شەرعی خواو پێغەمبەرەکەی بۆ چارەسەرکردنی).

لەو لاپەڕە دەستوریەی مەدینەدا ئەو هەرێمەی کە سەرۆکایەتیەکە دەیگرێتەوە دیاریکرابوو، کە مەدینەی پێغەمبەرو دەوروبەری بوو کە پشتیوانانی هۆزی ئەوس و خەزرەج تیادا نیشتەجێ بوون، هەروەها دەسەڵاتی سیاسی دیاریکرابوو کەبریتی بوو لەدەسەڵاتی پێغەمبەر، فەرمانداری و سەرچاوەکەی بریتی بوو لە کتێبی خوا، هەروەها بەو

لاپەرەیەدا دانیشتوانەکانی ئەو دەوڵەتە تیا دیاریکرابوون: کۆچکەرەکان بەجیاوازی هۆزو بنەماڵەکانیان، هەموو ئەوانەی بەوان دەگەشتنەوە، خەڵکی مەدینە بەجیاوازی تیرەو هۆزو دانیشتوانەکانی، هەروەها هەموو هاوپەیمانەکانی لە جولەکەکان.

هەموو ئەمانەی ئاماژەیان پێکرا جەخت لە پایەکانی دەوڵەتن– وەك فیقهی دەستوری ئیمرۆ دەیناسێنێت– لەو دەوڵەتە ئیسلامیەی کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) لە مەدینە دایمەزراند، دیارە ئەم دەوڵەتە نەپوکایەوە گەشەی کرد لەسەردەستی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) تا هەموو دورگەی عەرەبی کەوتە ژێرركێفی و دەسەڵاتیەوە، بۆیەکەمین جار لەمێژوودا دورگەی عەرەبی لە ژێر یەك پەرچەم و یەك ئاین و یەك دەوڵەتی سەربەخۆدا کۆبکاتەوە، ئەوەبو نەیبردە دەیەیەك پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) سنووری ئەو دەوڵەتە گەیشتە وڵاتی فارس لە رۆژهەڵات و کۆتا سنووری لیبیای ئیمرۆ لە رۆژئاواوە.

دیارە موسڵمانان بەم تێگەیشتنە لە دەوڵەت گەیشتوون، ئەوکات فیقهی دەستووری سەبارەت ماڵ و ئەحکامەکانی، زەوی و کون و کەلەبەرەکانی– مەبەست سنورەکانییەتی– هەروەها سەبارەت بە نەتەوەو گەل و پێکهاتەکانی، پاشان دەسەڵات و مەرجەکانی و دارایی و ئەوی تیایدا دەگوزەرێ و پێویستیەتی، ئەوە بابەتی پەرتووكێکە لە ئەحکامی سوڵتانی و سیاسەی شەرعی.

## بنچینەی دووەم: پێویستی دامەزراندنی دەسەڵات و واجب بوونی وگوێڕایەڵی کردنی:

وەك چۆن ناگونجێت ئیسلام ناگاتە شوێنگەی خۆی بە بێ بوونی دەوڵەتێك کە فەرمانەکانی بەجێبگەیەنێت، بەهەمان شێوەش ناگونجێت و دەوڵەتیش بونێکی واقیعی نابێت بە بێ هەبوونی دەسەڵات و گوێرایەڵی کردنی، ئەوکات لەپەیمانێکی وەك پەیمانی عەقەبە، کە لەنێوان پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) و خەڵکی پشتیوانانی یەسرب ئەنجامدرا کە پەیماننامەیەکی سیاسی و تەشریعی بوو، پێکهاتبوو لەکۆمەڵێك گوتار کە گوتاری سیاسی پێغەمبەر بوون لەوانە:

### یەکەم: گوێرایەڵی و ملکەچی:

وەك لەدەقی پەیماننامەکەدا هاتوە: (بەڵێنمان دا بە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی فەرمانەکانی لە کاتی تەنگانە و کاتی ئاساییماندا، ئەوەش ئەوشتەیە کە هەر دەسەڵاتێك و پێشەوایەتیەك بۆ بەرێوەبردنی کاروباری دەوڵەت و گەل پێویستیەتی، پێشتر عەرەبەکان – بەتایبەت عەدنانییەکانی دانیشتوی حیجاز و نەجد– ئەو شتەیان نەدەزانی، وەك پارێزگاریەك لێیان و لەسەر ئازادی و رێزداریان، تەنانەت ئەوان ئەو ستەمەی پادشاکانیان نەدەزانی، ملکەچی دەسەڵاتی ئەوان نەدەبوو، وەهیچ دەوڵەتێکیان لەمێژووی خۆیاندا بەخۆیانەوە نەدیبو، بەهۆی خۆبەزلزانی ملکەچ نەکردنیان بۆ پاشاکان، پێش سەرهەڵدانی ئیسلام و موسڵمان بونیان بە خواستی خۆیان، پاشان راوێژ هاتنەناوە لەراستیدا ئەوان لە سەردەمی نەفامیاندا

جۆره راوێژێكیان هەبوو، كاتێك خەڵك و خانەدانی مەككە كاروباری وڵاتیان بەرێوه دەبرد – كه بە (أم القرى) و دیارترینی شاری عەرەب لەڕووی سیاسیی و ئاینی و بازرگانییه وه له لوتكەدا بوو لەچاو چواردەوری– كه ئەوان كاروباری خۆیان له (دار الندوة) رادەپەراند، ئەوكات خەڵكی یەسریب كاروباری شارەكەیان له (السقيفه) بەڕێوەدەبرد، هەروەها خەڵكی تائیف و زۆرێك له خەڵكانی تری شاره عەرەبەكان وەهابوون، بەتایبەتی ئەوانەیان له كاروباری دەسەڵات و دەسەڵاتی پاشاییان بەخۆوه نەدیبو، بۆیه بێجگه لەهەندێ سەرۆك و كەسی خانەدانیان نه دەهاتنه ناوكۆری راوێژەكانەوه، بەڵام كاتێ ئیسلام هات و بابەتی راوێژ بوویه بابەتێكی گشتی بڕواداران، كه جیاوازی نەكردبوو بۆ بەهێزو بێهێز و هەژاو دەوڵەمەند و گەورەو بچووك و عەرەبی و یان عەجەمی..

دیاره پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) ئەمه ئیشكالیەتەی هەستپێكردبوو بەتەواوی، بۆیه دەقی ملكەچی و گوێرایەڵی له خۆشی و ناخۆشی و تەنگانەو كاتی ئاسایی هێنابوو وەك بنەمایەكی سەرەكی لەگوتاری سیاسی ئیسلامی، تاوەكو بەوه بونیادی دەوڵەتی ئایندەی خۆی لەسەر دابمەزرێنێت، كه ئەودەوڵەته نەدەوەستایه سەرپێ به بێ گوێرایەڵی و ملكەچی تاكەكان بۆی، هەروەها بەبێ خەرجكردنی پێداویستی لەبۆی لەكاتی پێویستدا، ئەوەش بۆ ئەوەی دەسەڵات بەو بەرپرسیارەتیەی كەدەخرێته سەرشانی هەستێت، ئەوەش وەك وتمان عەرەبەكان لەسەردەمی نەفامیدا ئەمەیان نەدەزانی، بەتایبەتی خەڵكی

قورەیش و عەرەبی حیجاز و نەجد، ئەوانەی کە قورئانی پیرۆز دابەزیە سەریان.

ئەمەی وتمان ئیمامی شافیعی لە کتێبی (الام)دا ئاماژەی بەم راستیە کردوە هەروەها ئبنو حەجەر دەڵێت: (ئەوکات قورەیشیەکان و ئەو عەرەبانەی کەلەدەورو بەریاندا بوون هیچ زانیاریەکیان لەسەر میرنشینایەتی و دەسەڵات نەدەزانی، و بەرگیریان لە فەرماندار دەکرد، بۆیە ئەو هانی دەدان لەسەر ملکەچی بۆکردن لە بۆ ئەوەی کە فەرمانی بەسەردادەکردن و گوێلەمشتی بوونایە بۆی کاتێك دەنێران وەك تاقم دەرچوون (سەرایا) یان بەڕێوەبردنی ناوچەیەك وەك فەرماندار، ئەمەش وتەی شافعیە لە (الام)دا.[1]

هەروەها لە (الرسالة) شافیعیدا هاتوە: (هەندێك لە خەڵکی زانا: واتای أولوالامر دەهێنن بە: فەرماندەکانی سریەکانی پێغەمبەر، ئەوەش وەك ئەوەیە والێکبدرێتەوە کە خەڵکانی عەرەبی دەوروبەری مەککە هیچ شتێکیان لەبارە فەرمانڕەواییەوە نەزانیوە، بۆیە زۆر توندو رقاوی بوون بەرامبەر ئەوەی کە کەسێکیان ملکەچی فەرمانی ئەوی تریان بێت، بۆیە وایان لێکدەدایەوە کە بێجگە لە گوێرایەڵی بۆ پێغەمبەری خوا ئیتر ملکەچی کەسانی تر ناگونجێت و رەوانییە فەرمانداری بۆ هیچکەسێکی تر. بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێدەکردن کە ملکەچی فەرماندەکانیان بکەن ئەوانەی پێغەمبەر بۆی

[1]- فتح الباري ٣٥٤/٨ج ٧١٣٧.

دەستنیشان کردبوون، کە ئەمەش ملکەچیەکی وابەستەو دیاریکراوبوو رەهانەبوو لەوەی کەلەو کارەدا بۆی دیاریکراوە کە دەفەرموێت: (فان تنازعتم في شیئ فردووه الی الله) بەمانا ئەگەر کێشەتان لەوبارە بۆهاتە ناوەوە، ئەوەش لە بارەی (اولی الامر)ەوە هاتوە، (فان تنازعتم) بەمانا ئێوەو فەرماندەکەتان کە فەرمانکراوە ملکەچیان بن (فردوه الی الله والرسول) بەمانا بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی دەیزانن، خۆ ئەگەر نەتانزانی بپرسن لە پێغەمبەری خوا لەبارەیەوە، ئەگەر گەیشتنە لای و یان ئەوەی لەئێوە دەکاتە لای)[1].

**دووەم: ناكۆكی نەناوە لە نێوان فەماندار و خەڵكانی تر:**

مەبەست لە (الامر– فەرماندار) لێرەدا بریتیە لە پێشەوایەتی و جێنشینایەتی، چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە پەیماننامەی عەقەبە لەگەڵ پشتیوانانداا وەك دەق نوسیبووی وەك مەرج کەتیایدا هاتبوو: (وان لا ننازع الامر اهله) بەهۆی ئەوەی کەدۆخێك بوو بەبێ پەسەندکردنی عەرەبەکانی بێجگە لەمان هەیانبوو بۆ پشتیوانی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم)، بۆیە پێغەمبەری خوا ویستی جەخت لەسەر ئەو بنەمایە بکاتەوە کە کاروباری فەرمانداری و دەسەڵاتوەرگرتن بە ناكۆكی درووستکردن و بەسەرکەوتن و دان بەمل بەرامبەردانابێت، هەروەها بە پشتاوپشت وەك ئەوەی پاشاکان و گەلانی نەفامی جێبەجێیاندەکرد، بەڵکو بەراوێژ لەنێوان بڕواداران کە

---

[1]– الرسالة للشافعي ص ٧٩.

هاوبەشی دەکەن گشتیان تیایدا بەهێزو بێ هێز و دەوڵەمەند و هەژارو خانەدان و رەشۆکی و گەورەو بچووك و پیاو ژن و سپی و رەش و هتد. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وأمرهم شورى بينهم).

کاتێك پێغەمبەر دەفەرموێت: (وأن لا نتنازع الأمر أهله) مەبەستی لە (أهله) لێرەدا هەموو ئیمانداریێکە بەگشتی، هیچ تاکە کەسێکی لەو (الامر) تیا جیانەکراوەتەوە لەدەستپێکردنیدا و هیچ ناکۆکیەکیش لەوەی کە کێ هەڵدەبژێرن بۆی لەکۆتاییدا، وەك چۆن هیچکەسێك ماڤ لێ ناسەنرێتەوە لەوەی کە کێ هەڵدەبژێرێ و کێ بە شایەن و ئەهلی ئەو پێشەوایەتیکردنە دەزانێت، هەروەها حەڵاڵ نییە بۆ هیچ کەسێك کە ناکۆکی دەربرێ بەرامبەر ئەوەی کە هەموان هەڵیانبژاردوە پاش راوێژو نواندی رەزامەنی و بەبێ هیچ جۆرە زۆرەملێ یەك لەوبارەوە. وەك چۆن حەرامە دەرچوون لێی و هەڵگەرانەوە لەدژی و گوێرایەڵی نەکرنی لەکاتێکدا گەل رەزامەندبوەو هەڵیبژاردوە، پاشان مەبەست لە وشەی (أهله) ئەو ئەمیرو پێشەواو سەرۆکانە نین کە گەل دەست و ویستی لە هەڵبژاردنیاندا نەبووە، بەڵکو نموونەی ئەو پێشەوایە ستەمکارێکی سەرکوتکەرەو لە ئەهلی ئەوە نییە  کە ملکەچی بۆ بکرێت، بەڵکو ئەوە خۆسەپێنەرێکە و پێگەکەی داگیرکردوە، هەروەها مەبەستی پێغەمبەر (صلّ الله عليه وسلّم) لە (وان لا تنازعوا الامر أهله) ئەو جۆرە خۆسەپێنەرانە نین، پاشان ئەوە لە فەرمودەی پەیماننامەکەی عەقەبە جەختی لەسەرکراوەتەوە لە ریوایەتەکەی عبادەی کوڕی صامت دەفەرموێت: (بەیعەتمان دا لەسەرملکەچی و گوێرایەڵی، لە خۆشی و

ناخۆشیماندا لەتەنگانەو ئاساییدا و لە هات و ناهاتدا، هەروەها ناكۆكی نەنوێنین لە بابەتی پێشەوایەتی و ئەوەی ئەهلیەتی، مەگەر لەكەسێكدا كوفرێكی روونتان بینی، ئەوەش دەبێتە بەڵگەیەك بۆتان لەلای خوا)[1]، هەروەها وتەی عومەر لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە (ئەوەی بەیعەت بەپیاوێك بدات بێ ئەوەی كە بەراوێژی موسڵمانان هەڵبژێرابێت، ئەوە شوێنكەوتەیی بۆنییە، ئەوەش بەیعەتی پێدەدا ئەوە شایەن بەكوشتنە) لە ریوایەتێكی تری صەحیحدا: (رەوا نییە بۆتان شوێنی بكەون بەڵكو بیكوژن)،[2] لە ریوایەتێكی تردا: (ئەوەی داوای لەكەسێك كرد كە ببێتەپێشەواو بەبێ راوێژ ئەوە بدەن لەگەردنی)[3].

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ترسی ئەوەی هەبوو لەوەی كە پشتیوانان خواستی ئەوەیان هەبێت كەئەوان لەپێشترن بۆ پێشەوایەتی پاش مردنی، بەوپێیەی كە ئەوان خاوەن ماڵن و ئەوان ئەهلی سەركەوتن و پشتیوانی بوون، ویستی لەو پەیماننامەیەدا كە لەمەككە ئەنجامدرا – لەپیرۆزترینی كۆبوونەوەی نهێنی كەلە تاریكایی شەودا نوسرایەوە– لەسەر پرانسیپی ئەوەی كە پێشەوایەتی كردن بە راوێژەو، هیچ ناكۆكیەكی تیانەبێت، هیچ خۆفەرزكردنێكی تیانەبێت و هیچ زۆرەملێیەكی تیانەبێت، بەڵكو ئەوە راوێژەو ویستی هەموان و هەڵبژاردنی گشتیە.

---

1– صحيح البخاري، ج ٧٠٥٦.

2– تەماشای صحيح البخاري، فتح الباري ١٤٥/١٢.بكة.

3– احمد/ في العلل ومعرفة الرجال– رواية عبدالله– ٢/ ٩٢، رقم ١٦٦٠ باسناد جيد؟

## سێیەم: مافی گەل لە پاراستنی دەسەڵاتەکەیدا:

ئەوە بنەمایەکە لەبنەماکانی گوتاری سیاسی پێغەمبەر، کە پەیماننامەکەی عەقەبە گرتبوویە خۆی: (ئێمە هەڵدەستین بە بەجێگەیاندنی راستی وەك ئەوەی لەسەرینی و ناترسین لەهیچ لۆمەی لۆمەکارێك ئەوەش لەبەرخوا)، هەروەها لەسەر گەل و خەڵکە گوێ رایەڵی فەرمانبەرداری و وەڵامی بۆ پێشەواو دەسەڵاتەکەی هەبێت، هەروەها لەسەرخستنی و گوێڕایەڵیکردنی، هەروەها خەڵك مافی ئەوەی هەیە کەرای تەواوی بە ئازادی هەبێت و بەرگیری لە دەسەڵات بکات هەرکات حوکمران لەرێی راستەقینەی خۆی دەرچوو یان خۆی سەپاندو ستەمکاری بەرامبەر گەلەکەی کرد، بۆیە گەل هەردەم رەقیب و چاودێرو بەرپرسیارە لەوەی کەراستی بکاتەوە رەخنەی لێبگرێت و هەڵەکانی راستبکاتەوەو پیشانی بدات و هەڵسەنگاندنی کارەکانی بکات، خواروخێچیەکانی پیشانبدات، لەئیسلامدا گوێرایەڵی رەها بۆ دەسەڵات نییە، پاشان خودی ئەو گوێرایەڵیەش بۆ دەسەڵاتەکە نییە بەڵکو بۆ ئەو ئامانجەیە لەرێگەی ئەوەوە بەدەست دێت، کە بریتیە لە دادو یەکسانی. کەواتە هەرگیز رێپێدراو نییە ملکەچی بۆ دەسەڵاتێك کە بەپێچەوانەی ئامانجە سەرەکیەکەی هەنگاو هەڵبگرێت بۆیە پێویستبوونی گوێرایەڵی مەبەست گەیشتنە بە ئامانجەکەیە نەك شتی تر، وەك لە فەرمودەی صەحیحدا هاتووە: (هیچ گویرایەڵیك نییە لەکارێکدا کە سەرپێچی خوای پەروەردگاری تیادا بێت)، هەروەها فەرمودەی: (ملکەچی تەنها لەکاری چاکەدایە) تەنانەت ئەم ئاینە

بەرگرتن لە پێشەوایەکی ستەمکاری وەك گەروەترین جیهاد لەپێناو خوادا هەژمارکردوە وەك پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) دەفەرموێت: (باشترینی جیهاد وشەیەکی راستەقینەیە لە بەرامبەر سوڵتانێکی ستەمکاردا دەکرێت)، هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە (گەورەی شەهیدەکان حەمزەی کوڕی عەبدولمتەلیبە و هەروەها ئەو کەسەیە کە بەرامبەر پێشەوایەکی ستەمکار دەوەستێت و فەرمانی بەسەردا دەیکات و جێبەجێی ناکات و دەیکوژێت)، هەروەها لەصەحیحی موسلمدا هاتوە سەبارەت بە پێشەوایانی ستەمکار دەفەرموێت: (پاشان دوای ئەمانە کۆمەڵێك لە پێشەوا دێن قسەی راست بۆ خەڵکان دەکەن و خۆیان جێبەجیّ ناکەن، شتانێکیش ئەنجام دەدەن کە بەو شێوەیە خوا فەرمانی بەسەردا نەکردوون، ئەوەی جیهاد بەدەستی بکات دژی ئەمانە ئەوە بروادارە، ئەوەی بەزمانی جیهادیان لەدژ بگات ئەوە بروادارە ئەوەی بەدڵ جیهادیان لەدژ بکات ئەوەش بروادارە، دوای ئەوە ئەوی ئەمانەی نەبێت بەئەندازەی تۆوی خەردەل بڕوای لەدڵدا نییە)[١]. ئەم فەرمودانە هاوڕاو تەریبن لەگەڵ ئەو بنەمایەی گوتاری سیاسی قورئانی کە ئامانجەکەی بریتی بوو لە چەسپاندنی دادو یەکسانی لەنێو مرۆڤەکاندا، پاشان گوتاری قورئانی دانی نەناوە بە ستەمدا و واجبی نەکردوە کەلەبەرمبەریدا ئارامی رابگرین، بەڵکو خوای پەروەردگار مەدحی بڕواداران دەکات لە مەککە (وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ

يَنْتَصِرُونَ، وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ) [١] هەروەها سەبارەت بەخەصلەتی بورداران دەفەرموێت: (إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانْتَصَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنْقَلَبٍ يَنْقَلِبُونَ). [٢]

هەروەها لە خستنەرووی ماڤی ستەملێکراودا و رەتکردنەوەی ستەمدا دەفەرموێـت: (لَا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَنْ ظُلِمَ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا)[٣]، عیللەت و هۆکاربوونی لە دانانی جیهاد وردانی زوڵم لە واسەرژیانی بواداران دەفەرموێت: (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ) [٤].

هەرگیز گومانی ئەوە ناکرێت کە پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمان بەپێچەوانەی ئەوەی کە خواێ گەورە فەرمانی پێکردوە بدات، هەرگیز باوەرناکرێت بەوەی کە پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمان بەسەر موسڵماندا بکات کە ئارام بگرن لەسەر جەورو ستەم لەکاتێکدا ئەو مەهامی گوتارەکەی پەخشکردنی دادو یەکسانی بێت و هەڵگری ستەم و چەوساندنەوە بێت؟! چونکە ئەوە پێچەوانەی گوتاری قورئانە کە دەفەرموێت: (وتعاونوا علی البر والتقوی ولا تعاونوا علی الاثم والعدوان) بەڵکو پەیرەوی ئەو تەریب و راڤەو پراکتیکی

1 – سورة الشوری/٣٩–٤٠

2 – سورة شعراء.٢٢٧.

3 – رقم ١١٨.

4 – سورة الحج/٣٩.

ڕێنوونییە قورئانییەکانە لە مافی چارەی مرۆیی بەوەی کە بەرگری لەخۆی بکات و ڕێزو شکۆی نەشکێنرێت و بەرگیری لەهەر کەسێك بکات کەستەمی لێدەکات وەك ئێمە لەمەو بەدوا باسی لێوەدەکەین.

ئەم جۆرە مەرجانەی کە پەیماننامەی عەقەبە لەخۆی گرتوە گرنگترین پرانسیپە دەستوریەکانی سیستمی نوێی سەردەمی تیایە، بەڵکو بەشێوەیەکی رۆشنتر و بالاتر لەوەی کە ئیمڕۆ بیری مرۆڤایەتی لەوبارەوە پێی گەیشتوە، سەبارەت بەرێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان دەسەڵات و گەل، لەوێدا بریاردراوە کە بابەتی دەسەڵات و پێشەوایەتی مافی گەلە، هەروەها رێوشوێنی بەدەستگەیشتنی بەشێوەی ململانێو ناکۆکی نانەوە ناکرێت بەڵکو رێگەی راوێژو پرسوڕای موسڵمانان و هەڵبژاردن دەستنیشانکراوە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە زۆرەملێ خۆسەپێنی و زۆر و پەستان بەکارهێنانێك لەو پرۆسەیەدا ئامادەیی تیاهەبێت، پاشان مافی ملکەچی و گوێ رایەڵی و وەڵامدانەوەی تەواو لەسەرخەڵکیە لەوەی کەلە لایەن دەسەڵاتی هەڵبژێراوەوە بەو مەرجەی فەرمان و ئەرکەکانی رێپێدراو و شەرعی بن و لە سنووری چاکەی وڵات و خەڵکیدا بن. لەگەڵ ئەوەشدا حەرامکراوە کەبەهیچ شێوەیەك بەرامبەربوونەوە و دژوەستانەوە لەهەرحاڵەتێکدا کەئەگەر ستەمی لێنەوەشێتەوە، هیچ وەخت مافی گوێرایەڵیکردنی خەڵکان بۆی هەڵناگیرێت تانەگاتە سنوری ستەم و لادان لەفەرمانی خوا، بۆیە پێشەوایەك هەڵدەبژیرێت بۆ بەرپرسیاریەتیەك هەندێك وای دەبینن کە ئەوە شایەنی ئەوکارەیە، وە لەتایبەتمەندی ئەوە، لەکاتێکدا شایانی

ئەو دەدەن بەسەر ئەوانی تردا بەهۆی ئەوەی متمانەیان پێیەتی، لەبەرئەوە ئەم پیشخستنەی هەندێك و ملكەچی زیاتریان بۆی نابێتە فاكتەری لادانی، چونكە لە بارودۆخی رودانی ئەمانەدا بیر لە جێگیری باری ئاسایشی وڵات و جۆری رێزگرتنی ئەو لەو دەسەڵاتانەی پیادەیان دەكات بیردەكرێتەوە، چونكە ئەوانە پێداویستی سەرەكی دەسەڵاتن كە بەشێوەیەكی بەرپرسانە هەڵدەستێ پێیان و جێبەجێیان دەكات.

هەروەها لەدەقی پەیماننامەی عەقەبەدا هاتووە كە مافی گەل و خەڵكانە كە بەشێوەیەكی ئازاد رای خۆیان دەربڕن و گوتەی ئازادانەی خۆیان و ئەركی چاودێری دەسەڵاتیان هەبێت، بۆیە دەسەڵات و كاری گەل و خەڵكان لەوەدا كۆتایی نایەت كە خەڵكان هەڵدەبژێرن بۆدەسەڵات و یان پەیمانی بەیعەتی پێدەدەن، بەڵكو مافی ئەوان لەسەری باش چاودێریكردنی و لێپرسینەوەی و تەنانەت دوورخستنەوەی لەدەسەڵاتیش ئەگەر پێویستی كرد، هەر لەسەر ئەوانە و جێگیركراوە وەك ئەوەی كەئاماژەی پێدراوە (وان نقوم الحق حيثما كنا لا نخاف في الله لومة لائم) لە ریوایەتێكی تردا (وان نقوم الحق حيثما كنا) لەم دەستە واژەیەدا دەستەبەری مافی گەل لەچاودێری كردنی دەسەڵات بەرامبەر بەگوێرایەڵیكردنی گەل لەبۆ دەسەڵات دانراوە، تاوەكو هاوسەنگی لەنێوان دەسەڵاتی بریكاری گەل و گەلی ریشەو رەسەنی، بۆیە گوێڕایەڵی دەسەڵات هەرگیز ناتوانێت چوارچێوەی وشەی ئازادو ئازادی بیرو را بگرێت، وەك چۆن ناتوانێت رێگیربێت

لەبەردەم ئەو مافەی گەل لەچاودێری کردنی و لێپرسینەوەو ڕێککردنەوەی.

بۆیە دەبینین ئیسلام پێش هەموو سیستمەکانی تری دەستکردی هاوچەرخ کەوتووە لەدیاریکردنی ماف و گرەنتیەکانی، لەیەکەم پەیمانی سیاسی دەستووری کۆمەڵایەتی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، کە لەسەر بنەمای ئەوە دەوڵەتێکی ئیسلامی لە مەدینەی پیرۆز و دورگەی عەرەبی دامەزرا، کاتێك پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) و هاوڵانی کۆچدەکەن لەمەکەوە بۆ مەدینە لەسەر بنەمای ئەو پەیمانە کەلەسەر ڕەزامەندی خەڵکەکەی و هەڵبژاردنی خۆیان، بۆ ئەوەی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) هەموو دەسەڵاتە سیاسی و ئاینییە کەی پیادە بکات، لە بەستنی پەیمان و دامەزراندن و پێدانی ماف و جێبەجێکردنی یاساو و ڕاگەیاندنی شەر و بەستنی پەیماننامەی ئاشتی و وەرگرتنی باج و سەرانە و خەرجکردنی و هتد...

لە ڕوانگەی ئەم پەیماننامەو ئەو مەرجانەی لەناواخنیدان ئەم خاڵانەی خوارەوە بەدی دەکەین:

١- ماف دراوە بەدەسەڵات بەوەی گوێرایەڵی و بەدەمەوەهاتنی فەرمانەکانی هەبێت و ملکەچی و هەروەها پشتیوانیکردنی و جێبەجێگردنی فەرمانەرەواکانی ئەوەش لەو خاڵەی کە هاتوە (بایعنا علی السمع والطاعة...)

٢- مافی گەلە لەبەرامبەردا چاودێری دەسەڵات بکات و راستی بکاتەو لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات وەك لەخاڵی پەیماننامەکەدا هاتوەکە(وأن نقوم أو نقول الحق حيثما كنا لانخاف في الله لومة لائم).

٣- مافی هاوبەشی گەل و دەسەڵاتە پێکەوە کەلەو خاڵەی دەڵێت(وأن لاننازع الامر أهله) بۆیە گەل خاوەنییەتی پێش ئەوەی دەسەڵاتدار دیاری بکرێت هیچ کەس بۆی نییە ئەو مافەی لێ زەوت بکات و ناکۆکی لەوبارەوە بنێتەوە، پاشان دەسەڵات هی ئەوە دەبێت کەبەکاری بهێنێ کە هەڵدەبژێرێ و دیاریدەکرێت لەلایەن گەلەوە بە راوێژو بەرەزامەندی، بۆیە بۆ کەس نییە ناکۆکی لەوبارەوە بنوێینێت، تا ئەوکاتەی گەل بەتێکڕا بڕیاری لەکاردانی دەدات و لای دەدات.

بنەمای سێیەم: چەسپاندنی پرەنسیپی هاوڵاتی بوون و دیاریکردنی مافی دەستووری و سیاسی:

دیارە پەیماننامەی عەقەبە پرۆتۆکۆلێکی سیاسی بوو، لەهەمانکاتدا پەیماننامەیەکی کۆمەڵایەتی بوو، کەتیایدا بنەماکانی سیستمی سیاسی گشتی دەوڵەتی نوێی تیادیاریکرابوو، بەبێ ئەوە بچێتە وردەکاری تەواوی ماف و ئەرکەکانەوە، لەبەر مەترسی ئەو دیاریکردنەی ماف و ئەرکە دەستووریی و سیاسیە گشتیەکان دەبینین پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) دوای کۆچکردن (پرۆتۆکۆلی مەدەنی- دەستووری مەینە) دادەڕێژێت، بۆ ئەوەی سنووری ئەو دەوڵەتە نوێیە دیاری بکات و بڕیار لەسەر مافەمرۆییەکان بدات ئیتر ئەگەر موسڵمانی شارەکە بن یان ئەوانەی هاتونەتە ناوی و کۆچیان کردوە لەدەرەوەی خۆیەوە، یان

غەیرە موسڵمانن لە جولەکەو هاوپەیمانەکانیان، وەك لەو پرۆتۆکۆلەدا بەکورتی هاتوە: (ئەوە نوسراوێکە لەنێوان موسڵمانانی قورەیش و یەسریب، و ئەوانەشی شوێنکەوتەی ئەوان و لایەنگرو کۆششکارن لەگەڵ ئەوان، ئەمانە یەك گەلێکن لەو خەڵکە، بڕواداران هیچ کات نابنە بارگرانی بەسەر ئەوانی ترەوە لە رووی دارایی و کۆمەڵایەتیەوە، پشتیوانی قەرزارو تەنگ پێهەڵچنراو دەکەن لە بەخشین وخوێن بایی دا، بڕواداران لەوەی کە سنوور دەبەزێنێت و لادەدات یان ئەوەی دەیەوێت ستەمێکی گەورە یان تاوانێك ئەنجام بدات لەنێوان بڕواداراندا ئەوە دەستی هەموان لەسەریەتی و بەگژیدا دەچنەوە ئەگەرچی کوڕی یەکێکیشیان بێت، ئەو پەیمانە خواییە لەسەریانە هەموو گەورەو بچووك دەگرێتەوە، ئەوەی پەنای هەرکەسێکی دا ئەوە لەئەمانداییەو موسڵمان پابەندی دەبن پێوەی، بڕواداران پشتیوان و کۆمەکی یەکترن.[(١)]

جولەکان ئاینی خۆیان هەیەو موسڵمانان ئاینی خۆیان هەیە شوێنکەوتەو پشتیوانانی هەردولا بەهەمان شێوە، ئەوی لەجولەکەکان شوێنکەوتەی ئێمەبێت ئەوە شایستەی پشتیوانکردن و پشتیوانیلێکردنە، ستەمیان لێناکرێت و هیچ کەس بۆی نییە خۆی بەسەریاندا فەرزبکات، لەنێوان ئەوانەی لەم دەستورەدا هاتوون لەسەریانە بەرگری بکەن لەیەسریب و سەریبخەن، لەنێوانیشیان ئامۆژگاری و راگۆرینەوەو پێشنیارکردنی چاکویستانەیان بۆ یەکتر هەیە

---

1 روایة ابن اسحاق في السيرة (مع المؤمنين) ورواية ابي عبيد في الاموال باسناد صحيح الى الزهري (من المؤمنين)

بەدوور لە تاوان، پاڵپشتی و سەرخستنی ستەملێکراو لەسەرشانی هەموانە، ئەوەی دانیشتووی ئەم شارە بێـت ئاسایشی پارێزراوە، ئەوەی لەم شارە بچێتە دەرەوە ئاسایشی پاریزراوە، لەو شتەی کە دەبێتە هۆکاری کێشەو جیاوازی و ناکۆکی نێوانتان دەگەرێنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی..).

لەو پرۆتۆکۆلەدا پرەنسیپی هاونیشتمانی بوون بە بەرز راگیراوە بۆو هەرکەسێك لە شاری مەدینەی نوێ بژی، مافی هەمووی وەك یەك دیاریکراوە، ئەگەر موسڵمانی پشتیوان بێت یان کۆچەری بێت یان غەیرە موسڵمان بێت لە یەهود و هاوپەیمانەکانی و بەندەکانیان. لە هەموو ماف و ئیمتیازاتێکی ئەوکاتە بەبێ جیاکاریکردن و یان ستەملێکردن چونییەك کراون. دەرگاش واڵاکراوە بۆ هەمان و ماف و ئیمتیازاتێك بۆ ئەوانەی کەپاشتر دێن و بەوان دەگەنەوەو پەیوەستن دەبن پێیانەوە، هەموویان یەك گەلن، یەك ئەستۆیان هەیە گەورەو بچوك دەگرێتەوە، سەبارەت بەئاینیش ئاماژەدراوە کە موسڵمانان دینی خۆیان هەیەو جولەکەش بەدینی خۆی، هاوکاری و یارمەتی یەکتر دەدەن لەسەر چاکەو دووردەکەونەوە لەستەم و تاوان و دوژمنایەتی لەیەکتر، هەموو پێکەوە هاوبەشی دەکەن لە پارێزگاریکردنی شاری مەدینەو بەرگری لێدەکەن، هەمووشیان لە ژێر رکێفی یەك دەسەڵاتدان کە ئەو دەسەڵاتە رەزامەندی زۆرینەی بڕواداری لەسەربوە، خۆی لە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) وێنا دەکات و سەرچاوە تەشریعیەکەشی پەیامەکەی خوا و سونەتی پێغەمبەرەکەیەتی.

دیارە ئیسلام سەبارەت بەدیاریکردنی پەیوەندی مرۆڤ بەزەمینەوە پێشکەوت، لە پرەنسیپی هاولاتی بوون و پەیوەندی مرۆڤ بە ولاتەکەیەوە هەرزوو ئیسلام دیاریکرد، وەك ئەوەی لە پرۆتۆکۆلی مەدینەدا بڕیاری لەسەردرا. ئیسلام هات بە کۆمەڵێك یاساو بڕیارەوە کە تیایاندا ماڤ مرۆڤی لەم سەرزەمینە دیاریکرد ئەگەر ویستی ژیاندنەوەی هەبێت، عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێت: (شایەتی دەدەم کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بریاری جێبەجێکردنی ئەمانەی دا: زەوی زەوی خوایە، بەندەکانیش (مرۆڤەکان) بەندەی خوان، ئەوەی شوێنێکی چۆڵەوانی ئاوەدان بکاتەوە ئەوە مافی بەخاوەنبوونی زیاتر بۆ ئەوە، هەروەها عوروە دەڵێت: ئەوەمان لە پێغەمبەرەوە پێگەیشت لەوانەی کە درودیان بۆ ئەو دەنارد.[1].

هەروەها بەکارهینانی زەوی هەمووی ڕێپێدراوکرد، هەموو قەدەغەو قۆرخکردنێك کە شتێکی تیادا قەدەغە کرد مەگەر ئەوەی کەبەرژەوەندی گشتی گەلی تیابێت. وەك لەفەرمودەی صەحیحدا هاتوە: (لا حمی الا لله ولرسوله)[2].

بەوەش ئیسلام سەرکەوتووبو لە دامەزراندنی یەکەم کۆمەڵگەی مرۆیی کە فرەیی تێدا بەرقەرار بێت، یەکەم دەوڵەتی دەستووری و یاسایی درووست بکات، لەو دەستورەدا دیاریکردنی سنور و دەسەلات و گەل و هەروەها ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی

---

1– ابوداود في السنن ج ٣٠٧٦ باسناد صحيح.

2– ابوداود في السنن ج ٣٠٨٣ باسناد صحيح.

تیادا دیاریکرد، پرانسیپی ئازادی ئاینی و بریاردان لەسەر پرانسیپی هاولاتی بوون و لەسەر بنەمای مافی مرۆڤ و پەیوەستکردنی بە زەوی و ئەو شوێنەی کەتیایدا لەدایك دەبێت و هەروەها تیایدا نیشتەجێدەبێت، هەروەها لەو دەستورەدا ئەوە برایەوە کە ئەوەی مافە و ئەوەی ئەرکە لەسەر هەموانە بەبێ جیاکاری، هەموویان پێکەوە دەژین بە جیاوازی چین و نوێژو پێکهاتەی ئاینی و کۆمەلایەتی بەبێ زۆرەملێ و هیچ پالەپەستۆیەك لەسەریان، هەماهەنگی و هاوکاری لەنێوانیاندا دەبێت بەرقەرار بێت لەسەر بنەمای چاکەو دادگەری و یەکسانی بەدوور لەهەر ستەم و دوژمنایەتیەك.

دیارە ئەوکات دانانی دەستوری مەدەنی یەکەم پرۆژەو کاری سیاسی بوو کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) هەستاپێی راستەوخۆ پاش گەیشتنی بە شاری مەدینە، لەکاتێکدا لەو شارە چەندین چین و توێژی جیاوازی هەلگرانی بیری ئاینی جیاوازی ئاینی هەبوون دیارترینیان جولەکەکان بوون، ئەوانە بروایان نەهێنابوو هیچ جۆرە بەیعەتێکیشیان نەدابوو بە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) لە پەیماننامەی عەقەبەش ئامادەنەبووبوون، لەبەرئەوە پێویست بوو پرۆتۆکۆلێك و دەستورێك دابنرێت تاوەکو پەیوەندیەکانی ئەمانەو بڕوادارن و تێکرادانیشتوانی مەدینە رێکبخات ولەنێو ئەو دەولەتە نوێیەدا، هەروەها ماف و ئەرکە گشتیەکانی دانیشتوانەکەی بە هەموو چینە جیاوازەکانەوە دیاری بکات، ئیبن و ئیسحاق لەوبارەوە لەژیاننامەی پێغەمبەر سەبارەت بەم پرۆتۆکۆلە دەیهێنێت (پێغەمبەری

خوا (صلّ الله عليه وسلّم) نوسراوێکی نوسی لەنێوان کۆچەرو پشتیواناندا، پاشان بانگی جولەکانی کردو و پەیمانێکی لەگەڵ ئەواندا بەست و دانی نا بە ئاین و ماڵ و ماف و ئەرکەکانیاندا و مەرجی لێوەرگرتن و مەرجیشی بۆدانان...هتد).

دیارە لە سیاقی ئەو پرۆتۆکۆلەدا درێژەی زۆر بابەت هەیە، زانایانی یاساو دەستووری ئەو پرۆتۆکۆلەو ئەوەی تیایدا هاتووە لە بنەمای دەستووری، بەیەکەم دەستووری نوسراو کە جیهان ناسیبێتی دادەنێن، کە هەموو پرەنسیپە دەستوریەکانی ئیمرۆی دەستووری سەردەمی تیا جێبوەتەوە، وەك دیاریکردنی سنووری دەوڵەتی نویٚ، دیاریکرنی شوناسی هاوڵاتیانی، هەروەها ئاماژە بە سەرچاوە یاساییەکانی دراوە، و ئەو دەسەڵاتەی کە بەوانە فەرمانبەرداری دەکات، هەروەها تیایدا ئاماژە بە کەسێتی سزایی دراوە، پرانسیپی دادو یەکسانی لەنێوان دانەکانی کۆمەڵگە و بنەمای (تکافل) ی کۆمەڵایەتی لەنێو تاکەکانی کۆمەڵگە لە خاڵەکانی ئەو نوسراوەدا هاتوە، پاشان بریاری لەسەر فرەیی و پلورالیزم و ئازادی ئاینی داوە، هەروەها مافی گواستنەوەو هاتن و جێهێشتنی شاری تێدا باسکراوە.

دیارە پرۆتۆکۆلی مەدینە لە ئاستێکی بەرزی جۆرەکانی دۆکیۆمێنتی دەستووری دایە، ئەو پرۆتۆکۆلە دەستورێك نەبوە کە دەسەڵات بینوسێت و ئاراستەی گەلی بکات واتە دەسەڵات دایبەزێنێت بۆ گەل، دەستورێکی دانراوی نەبووە کە لەلایەن دەستەیەکی گەلی تەوافوقیەوە نوسرابێت، بەڵکو ئەمە پەیماننامەیەك بووە لە سەر ویست رەزامەندی و

هەڵبژاردنی تەواوی نێوان خەڵکی مەدینەو پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کراوە. ئەوان بە ویستی خۆیان بڕیاریان لەمە داوە کە کێ دەسەڵات وەربگرێت و کێ و چۆن دەسەڵاتداری بکات، لەکاتێکدا ئەمان خۆیان خاوەن ماڵن و خاوەنی هێزو هەیبەتن.

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) لە یەکەم رۆژی چوونە ناو شاری مەدینەوە، لەسەر رێنموونییە قورئانی و سیاسیەکانی هەنگاوی هەڵگرتوە، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، قورئانی پیرۆز لەگوتاری مەککیدا بریاری لەوەدا بوو کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بەسەر ئەواندا زاڵ نییە، بەڵکو ئەو تەنها بانگەوازکارێکی راستی و دادو یەکسانییە، نە پاشایەو نەخۆسەپێنەر، بیەوێت خۆی زاڵبکات و کۆنترۆڵی ئەوانی تر بکات و هەژمونی کەسی خۆی و دەسەڵاتی خۆی بەسەپێنێت، بۆیە کاتێ پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) دەچێتە ناو شاری مەدینە لەسەر رەزامەندی خەڵکەکەی دەچێتە ناوی و لەسەر بنەمای پەیماننامەیەکی سیاسی کە پێشتر رێخۆشکەری بۆ کراوە، کە پێویست بوو چۆنییەتی پەیوەندیەکانی لەگەڵ گشت پێکهاتەکانی کۆمەڵگەکە لەگەڵ یەکتر تێدا رێکبخرایە، کەواتە لەسەر بنەمای ئەو پەیماننامەو رێککەوتنە پێشوەختینەیە و بەرەزامەندی و هەڵبژاردنی هەموولا بووە. بەتایبەتی ئەوانەی کە موسڵمان نەبوون وەك جولەکەکان کەباوەریان بە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) نەبوو و پێشوەختیش بەیەعتێکیان لێوەرنەگیرابوو، بەیەعتی پشتیوانانیش لە عەقەبە نوێنەرایەتی جولەکەی نەدەکردو یان ئەوانی پابەند نەدەکرد،

بۆیە (پرۆتۆکۆلی مەدینە) ئەو دەستورە مەدەنییە بوو کە هەوان لەسەری کۆك بوون، تیایدا داننرابوو بەوەی کە دەسەلاّتی فەرماندار تیایدا پێغەمبەری خوایە (صلّ الله علیه وسلّم)، بەوەش پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) سەرۆکایەتی دەوڵەتی نوێی تیا بەدەستهێنا.

پێشەوای ئەو کۆمەڵە نوێیە، بێ ئەوەی خۆی بسەپێنێت بە هێزو زۆرە ملیّ، پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بە پاڵپشتی ئەو بنەمایانەی گوتاری مەکی (لست علیهم بمسیطر) و(فان أعرضوا فما ارسلناك علیهم حفیظا)، هەروەها (وما انت علیهم بجبار) ئیتر بونیادی دەوڵەتی پێغەمبەر لەسەر بنەمای پەیماننامەی بەیعەتی عەقەبە لەگەڵ بڕوادارنی خەڵکی مەککە بەتایبەت، پاشان پرۆتۆکۆلی مەدینە لەگەڵ هەموو هاولاّتیانی دانیشتوی مەدینە بەگشتی، کەئەمەش دەربڕی ئەو بنەمایانەی گوتاری سیاسی قورئانی بنچینەکانی بوو، دیارە نە بەیعەتی عەقەبە و نە پرۆتۆکۆلەکەی مەدینە روداوێکی کتوپری نەبوو، شتێکی هەرلەخۆوە نەبوو، بەڵکو پراکتیکی ئەو گوتارە ئاسمانییە بوو، کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بەدرێژایی ١٣ ساڵ لە مەککە کاری لەسەرکردبوو، پاشان ئەو رێنمونییە مژدەبەخشە بەو بنەما سیاسیە مرۆییانەبوو کە کۆمەڵگە پێویستی بوو، ئەو رێنماییە قورئانی و خودایيە بوو کە لەگەڵ هاتنی سروشی پێغەمبەرایەتیدا کۆمەڵگە چاوەروانی بوو.

## بنەمای چوارەم: پێویستی راوێژ و واجببوونی جێنشینایەتی:

ئەمە بنچینەی چوارەمە لە بنەمای گوتاری پێغەمبەر، وەك چۆن لەم گوتارەدا پێویستی هەبوونی دەوڵەت و واجب بوونی کۆمەڵ، پێویستی دەسەڵات و واجببوونی گوێرایەڵی، ئەمە ئەو پرسەیە کە وادەکات کە پێویستی راوێژ و واجببوونی جێنشینایەتی بهێنێت لەگەڵ خۆیدا، وەك سیستمێك کەدەربری سروشتی گوتاری سیاسی ئیسلامی بێت، وەتێڕوانینی بۆ ئەو رێوشوێنانەی کەلە هەڵبژاردنی دەسەڵات لە دەوڵەتدا دەگیرێنە بەر، هەروەها چۆنییەتی درووستکردنی ئەودەوڵەتە کە لەگەڵ ئەو بنەماو پرەنسیپانەی کە پێشتر خستمانننە ڕوو لە گوتاری قورئانی بێنەوە، لەگەڵ ئەوەی ئەم بنەمایانە لە بنەمای یەکتاپەرستیدا بڕیاریان لەسەردرا کە پاشایاتی و فەرمانداری راستەقینە هەرهی خودایە، ئەو خاوەنداری راستەقینەی بە هەقە و تاقانەیە و هیچ هاوەڵێکی لەو رووەوە نییە، پاشان لە بنەمای رێزگرتنی مرۆڤ و جێنشین ناساندنی لەسەر ئەم زەمینە بڕیاری داوە، پاشان بڕیاری ئەوەی داوە کەبڕوادارانی راستەقینە دواجار ئەوان سەرکەوتوون ئەم سەرزەمینە بەجێنشینایەتی ئەوان دەبرێت، ئەو دینەو ئەو دەسەڵاتەی ئەوان ویست و خواستیان بۆی هەیە بەدەستی دەهێنن، پاشان لەدوای ئەوە ئەو ترس و نائارامیەی هەیانە دەی گۆرێت بە ئارامی ئاسایش بۆیان.

هەروەها لە بنەمای ئازادیدا پێویستی ئازادی تەواو بۆ مرۆڤ لەهەموو جۆرە بەندایەتی و کۆیلایەتیەك بۆ غەیری خوا، بەتایبەت لەبەندایەتی

ستەمكارو پاشا و چەوسێنەرە تاغوتەكان و پیاوانی ئاینی، پاشان بریاردان لەسەر بنەمای برایەتی مرۆیی بۆ هەموان و لەهەموو ئەرك و مافێكدا، هەموو جۆرەجیاكاری بە بەرز بزانین و پێوەرێك بۆ جیاكاری لەنێوان مرۆڤەكاندا هەڵبگیرێت، گوتاری پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیە وسلّم) هات وەك درێژەپێدەرو روونكەرەوەی ئەو گوتارە قورئانییە و بنەمای جێنشینایەتی و راوێژ،ئەوەش وەك سیتمێكی سیاسی كەدەربری ئەو بنەما بیروباوەڕیانەیە كە لەگوتاری قورئانیدا بریاریان لەسەردراوە و ماناكانیان دەدرەوشێنەوە و بەم گوتاری پێغەمبەرایەتیە خواست و ناواخنیان بەدەردەكەوێت و بەدیدێت، بۆیە ناگونجێت ئەم گوتارە قورئانییە بریار لەسەر سیستمی پاشایەتی پشتاوپشتی بۆماوەیی بدات، چونكە رێك پێچەوانەی بنەما بیروباوەڕیەكانە، چونكە هیچ پادشایەكی راستەقینە لەم سەرزەمینە بونی نییە بێجگە لەخوا و هیچ كەسێك خاوەنداری راستەقینەی مرۆڤەكان نییە بێجگە لەخوا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (رب الناس، ملك الناس) وەك عوروەی كوڕی زوبەیر دەڵێت: (شایەتیدەدەم كە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیە وسلّم) بڕیاری جێبەجێكردنی ئەمانەی دا: زەوی زەوی خوایە، بەندەكانیش (مرۆڤەكان) بەندەی خوان، هەروەها عوروە دەڵێت: ئەوەمان لە پێغەمبەرەوە پێگەیشت لەوانەی كە درودیان بۆئەو دەنارد.[1].

---

[1]– ابوداود في السنن ج ٣٠٧٦ باسناد صحيح. الى عروة بن زبير ومن طريق البيهقي ج ١رقم١٥٥٣.

هیچ کەسێك مافی نییە و هی جۆرە شایستەییەك تیایدا بوونی نییە لە ئیسلامدا کەوا ببێت بە پاشای موسڵمانان، یان لەسەر زەوی موسڵمانان ئەو مافە بەخۆی بدات، هەروەها بەهیچ شێوەیەك ناگونجێت دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بە پشتاوپشت بێت و بنەماڵەیی بێت، چونکە لەوبابەتی پشتاو پشتەدا تەنها پاشایەتی و بابەتی شایستەبوون بە فەرمانڕەواییەوە لە خەڵکی تر دەسەنرێتەوە و بۆنەوەکانی دوای خۆی و بنەماڵەکەی، وەك سیستمی پاشایەتی کەباوبوە تا بەئیمڕۆش نموونەی ماوە و لەئیسلامدا بەتەواوی رەتکراوەتەوە، چونکە وەك وتمان ئەوبابەتی فەرمانڕەواییە دەچێتە کەستەکی شایستەبوون و مافەوە بەم شێوازە ماف لەخەڵکانی تر دەسەنرێتەوە، لە ئیسلامیشدا ئەوە جێگیرکراوە کە پرسی فەرمانداری پەیوەستنەکراوە بەهیچ کەس و بنەماڵەیەکە و مافی هەموو مرۆڤێکە و نابێت جیاکاری بکرێت و ئەوە موڵك و مافی هەموو گەلە هەموو تاکەکان وەك یەك خاوەنماف و خاوەن ئەرکن تیایدا. بۆیە نەپاشایەتی و نە جێنشینایەتی قۆرخ نەکراون بۆ چینێك یان بنەماڵەیەك، چونکە ئەم زەمینە هی هەموو مرۆڤەکانە بێجیاوازی، فەرمانداری و دەسەڵاتداری تیاکردنیشی هەموو تاکێکیان مافی بەسەرەوەهەیەو نابێت بەهیچ جۆرێك قۆرخ بکرێت، چونکە لەوجۆرە بەکاربردن و قۆرخکاریەدا ستەم و چەوساندنەوە پەراوێ.خستن و دەرپەراندن و ململانێی ناشەریفانە دێتە ئاراوە، کە ئەمە هەمووی پێچەوانەی گوتاری قورئانی و پێغەمبەرایەتیە، گوتاری سیاسی ئیسلامی بە سیستمێکی راوێژی و هەمەگیری و مافی سیاسی

بەخشین بەهەموان هاتوە بەپێشەوایەتی و بەراوێژ هاتوە، کە لە جیهانێکدا و سەردەمێکدا سیستمێکی هاوشێوەی بەخۆوەنەدیوە، کە ئەمە بەخششێکی خوایی بوە لە ئاسمانەوە بۆ مرۆڤەکان وەك خوای گەورە دەفەرموێت لە قورئاندا: (ان هذا القرآن يهدي للتي هي أقوم)[1]، واتە ئەوانەی زیاتر توانای راوەستانێکی رێکوپێکیان هەیە و بەردەوامیان لەبەرێوەبردنی کاروبارەکانی ژیانی مرۆڤەکاندا هەیە، هەروەها لەوەی کە بەختەوەری زیاترو چاکەو چاکویستی زیاتر فەراهەم دەکات و دادو یەکسانی زیاتر لە کۆمەڵگەدا پەرە پێدەدات وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (كِتَابٌ أنزلناه إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ الناس مِنَ الظلمات إِلَى النور بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إلى صِرَاطِ العزيز الحميداللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الآرْضِ).[٢]

دیارە ئەوە سەرکەوتنی پێغەمبەری خودا (صلّ الله عليه وسلّم) بوو لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی پێغەمبەری لە مەدینە، بەپایتەختکردنی مەدینە بۆ دەوڵەتەکەی، پاش ئەوەی ١٣ ساڵ لەمەککەی پیرۆز بانگەوازی بۆ ئاینەکەی و ئەو دەوڵەتەکرد، پاشان سەرکەوتنی لە ماوەی دەساڵی دەوڵەتداریکەیدا لە یەکخستنی هۆزە عەرەبەکان و یەکخستنی دورگەی عەرەبی، لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینییە وە،هەروەها ڕوودانی گۆڕانێکی ریشەیی لە ژیانی عەرەبدا لە هەموو بوارەکانەوە کە نموونەی لەمێژوودا نەبووە، بەشێوازێك کەکۆمەڵگەیەکی

---

[1]– الاسراء.٩.

[2]ابراهیم/ ١–٢.

کۆچەری (بەدەوی) دواکەوتووی گۆری بۆ کۆمەڵگەیەکی شارستانی کەبتوانێت حوکمداری و بەرێوەبردن لەوێوە بەسەر دەوروبەریدا بکات، هەروەها پاش دەساڵ دوای ئەو دەیەی دوای کۆچ دەبنین چەندین هەرێمی سەر بە ئیمپراتۆریەکانی فارسی و زۆرینەی هەرێمەکانی سەربەئیمبراتۆری رۆمانی سنووری ئاسیای عەرەبی و ئەفریقیا بخرێنە سەر ئەو دەسەڵاتە نوێیەی ئیسلام، ئەوەش باشترین بەڵگەیە لەسەر سروشتی ئەو بانگەوازو گوتارە سیاسیەی کە لە مەککە دەستیپێکرا، واتە رۆشنی بنەماو رێنمونی و ئامانجەکانی دەردەخات، کە ئەگەر وەها رۆشن نەبونایە لای پێغەمبەرو لای یارانی پێش ئەوەی کۆچ بکەن و بەو شێوازەو بەو شێوەیە وەها سەرکەوتنی مسەوگەر نەدەکرد و فەتحی ولاتانی پێنەدەکرا، کەتیایدا دادگەری دابمەزرێنێت و مرۆڤەکان ئازادبکەن. باوەرناکرێت کەوا ئەگەر گوتاری مەککە تەنها خۆی لە بەندایەتی کردن و پەرستشی خوادا کورت بکرایەتەوە و تەنها دوورکەوتنەوە لە بت و بتخانەکان بوایە، ئەوا لەو کتوپرەدا یەکسەری پێغەمبەر بەگەیشتنی بەمەدینە بیری لەدرووستکردنی وەها دەوڵەتێکی دەکردەوەو پاشان هەنگاوی هەڵدەگرت بۆ یەکخستنی هەموو دورگەی عەرەبی، پاشان ئەو دەوڵەتە پەرەی وەها پێدەدرا کە ببێتە وارسی دەسەڵات و زەویەکانی ژێر رکێفی فارس و رۆم– کە لەکاتێکدا ئەوان خۆیان بەخاوەن شارستانی و سیستم دەزانی– تیایدا سیستمێکی نوێ و دەوڵەتێکی نوێ دابمەزرێنێت و تاوەکو ئیدارەی کاروباری ئەم گەلە نوێیە بکات، بۆیە پێش ئەوە روبدات دیارە کە گوتاری سیاسی

ڕۆشنبوەتەوە بەتەواوی بۆیان کەخاوەنی کۆمەڵێك بنەماو پرانسیپ و ئامانج ە کە ئەم شوێنکەوتوانە باوەڕیان پێیەتی و کاری بۆدەکەن و ئەوان هەڵگری گوتارێکن کە بنەماو پرەنسیپ و سیستم و ئەحکامی بەڕێوەبردنی هەیە و بەوشێوازەش پیادەی دەکەن لەناو ئەو دەوڵەتە نوێیەدا.

## سروشتی جێنشینایەتی و ئەحکامەکانی:

گوتاری پێغەمبەرایەتی بە وردەکاریەوە ڕێوشوێنەکان وپایەکانی جێنشینایەتی دیاریکردوە، هەروەها بنەماکانی و مەرجەکانی و ئەحکامەکانی و چۆنییەتی هەڵبژاردنی جێنشین و دەسەڵاتەکانی دەستنیشانکردوە، هەروەها چۆنییەتی چاودێریکردنی لەلایەن گەلەوە لەچەندین فەرمودەی متەواتیر کە لەبابەتەکانیادا موتەواتیری مەعنەوین باسی لێوەکراوە، کەوایکرد دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) ئەو پرسی هەڵبژاردنەی بە ئاسانی حەسم بکەن، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە هاوەڵانی پێغەمبەر چەندە بابەتی جێنشینایەتیان لەلا ڕۆشن بوە، کە چەندین فەرمودە هاتون تیایاندا چەمکی جێنشین و پێشەواو باسی تیاکراوە لەوانەش:

## جێنشینایەتی و بەڕێوەبردنی گەل:

فەرمودەی یەکەم: لە ئەبی هورەیرەوە بە مەرفوعی لە پێغەمبەری خواوە گێراویەتیەوە: (نەوەکانی ئیسرائیل پێغەمبەرەکانیان ئەرکی بەرێوەبردنی گەلەکەیانیان لە ئەستۆ گرتبوو، هەر پێغەمبەرێك کۆتایی دەهات پێغەمبەرێکی تر جێگەی دەگرتەوە، بەڵام من لەدوای خۆم

پێغەمبەر نایەت، لەدوای من جێنشینەکان دێن، وتیان بە چی لەوبارەوە فەرمانمان پێدەدەی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوەی بەیعەتی یەکەمی پێدراو هەڵبژێرا ئەوە پێشەنگەو یەکەمە، مافی خۆی پێبدەن، خوای گەورە پرسیاریان لێدەکات لەوەی کە سەرپەرشتیان کردوە)[(١)].

لە ریوایەتێکی تردا هاتوە (دوای من هیچ پێغەمبەرێك بوونی نابێت، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەوکات چی دەبێت؟ فەرمووی جێنشینەکان زۆر دەبن، وتیان ئەی ئێمە لەوکاتەدا چی بکەین؟ فەرمووی: با دەستبگرن بەو پەیمانەی کە بەیەکەم کەس دەیدەن وەفای پێوەبکەن، ئەوەی لەسەرشانی خۆتانە جێبەجێی بکەن، ئەوانیش بەرپرسیاردەبن لەبەردەم خودادا سەبارەت بەوەی لەسەریانە ئەنجامی بدەن)[(٢)].

لەم فەرمودە صەحیحەدا باس لەسروشتی دەسەڵاتداری کراوە پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کۆچی دوایی دەکات، سیستمی دەسەڵات جێنشینایەتی دێت، پاشان جێنشینی تر بەدویدادێن، ئەرکیان بریتیە لەسیاسەت و بەرێوەبردنی کاروباری گەل و دەوڵەتداری پاش پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم)

دیارە چەمکی (خەلیفە–جێنشین) لەو چەمکە ئیسلامیانەیە کە عەرەب پێشتر ئاگاداری لێنەبوەو لێی نەزانیون لە سەردەمی نەفامیدا، بەڵکو چەمکەکانی پاش و ئەمیر ی بیستون، هەرچی چەمکی خەلافەیە

---

[1] رواه البخاری رقم ٣٤٥٥ رواه مسلم في صحيحه ج ١٨٤٣.

[2] ابن ماجه ج ٢٨٧١.

ئەمە چەمكێكی شەرعی وقورئانی نوییە وەك خوای گەورەدەفەرموێت: (إني جاعل في الارض خليفة)[1] . ئەم جێنشینایەتیكردنە بۆ جۆری مرۆییی بەگشتی، بەمەبەستی ئاوەدانكردنەوەی زەمین، خوای گەورە دەفەرموێـت: (وعدالله الذين آمنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الارض)[2] .

ئەمەش جێگیركردن و جێنشینایەتیكردنی تایبەتە بۆكۆمەڵگەی باوەردار بۆ ئەوەی حوكمی خواو ئەو دادگەریەی كە لەكتێبەكەیدا ناردوویەتی دابمەزرێت، پاشان لەگەڵیشدا پێغەمبەری ناردوە، وەك خوای گەورە لەبارەی پێغەمبەر داودەوە دەفەرموێت: (يا داود إنا جعلناك خليفة فاحكم بين الناس بالحق)[3] .

دیارە ئامانج لە جێنشینایەتی وەك سیستمێكی سیاسی بریتیە لە دامەزراندن و چەسپاندنی راستی و دەسەڵاتداریەكی دادگەر، ئیمامی سەرخەسی لە (المبسوط)دا دەڵێت: بزانە كە بریادان و دادگایی بە حەق لە بەهێزترینی فەرائیزەكانە پاش باوەر بەخوای پەروەردگار، لە باشترینەكانی پەرستشەكانە كە لەپێناویدا خوای پەروەردگار ناوی جێنشینی بەسەر باوكە ئادەمدا (سەلامی خوای لێبێت) بەخشی، وەك دەفەرموێـت: (إني جاعل في الارض خليفة) هەروەها ئەونازناوەش بەسەر پێغەمبەر داود (سەلامی خوای لێبێت) بڕا لەلایەن خوای

[1] البقرة٣٠.

[2] النور٥٥.

[3] سورة ص٢٦.

پەروەردگارەوە ناوی لێنرا وەك دەفەرموێت: (يا داود إنا جعلناك خليفة في الارض) هەروەها بەو کارەی ئەوان پێی هەستاون وەك ئەرکێك بەسەر هەموو پێغەمبەراندا پێیسپاردوون تەنانەت کۆتا پێغەمبەریش موحەمەد (صلّ الله عليه وسلّم) وەك خوا خۆی دەفەرموێت: (إنا أنزلنا التوراة فيها هدى و نور يحكم بها النبيون) هەروەها دەفەرموێت: (وأن احكم بينهم بما أنزل الله ولا تتبع أهوائهم) ئەوەش لەبەرئەوەیە کە دادگایی کردن و بریاردان بەهەق و بەرێوەبردنی کاروباری گەل بە شێوەیەکی راستەقینەیی دادگەری تیادا بەرقەراردەبێت، بێگومان بەدادگەریش ئەم ئاسمان و زەمینە وەستاون، بەدادگەری ستەم لەسەربەندەکان هەڵدەگیرێت، ئەوەش ئەو خواست و یستەیە کە هەموو مرۆڤێگی خاوەن ژیری داوایەتی. هەموو چەوساوەیەك بە ئاواتەوەیەوە کە پێی رزگاری بێت لەستەمکارێك، لەرێیەوە مافی راستەقینە بگەرێتەوە لای خاوەن ماف، هەروەها داوای چاکویستی و بەرگیر لەخراپە، دیارە پێغەمبەرانیش هەمووی لەو پێناوەدا نێرراون و جێنشینە راستەقینەکانیش بەرێچکەی ئەواندا رۆیشتوون).

ئیمامی سەرخەسی مەبەستی دامەزراندنی جێنشینایەتی لەسەر زەوی دیارکردوە، کە ئامانجی لەکارکردنە بە حوکمی خواو و چەسپاندنی دادگەریە لەنێوان بەندەکانی خوادا لەرێگەی ئەوجێبەجێکردنی ئەوشەریعەتەوە کە ناردویەتی. هەروەها مەبەست لەجێنشینایەتی بڕواداران ئەوەیە کەبەڵگەیەك بێت لەسەرخەڵکی بەگشتی، کاتێك پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) کۆتا پێغەمبەرەو

بەپەیامی ئاسمانییە وە، بۆیە جێنشینایەتی بۆ گەلەکەی بریوەتەوە لە دوای خۆی بەوەی کەلە رێگەی پەیامە ئاسمانییەکەی و رێنمونییەکانییەوە تارۆژی دووایی، تاوەکو حوججەو بیانوویەکی خوای گەورە بێت لەسەر بەندەکانی کە دەفەرموێت: (وكذلك جعلناكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ويكون الرسول عليكم شهيدا)[1].

ئیبنو خەلدوون لە (مقدمە)کەیدا دەڵێت: (بەشی بیست و پێنج: سەبارەت بەواتای جێنشینایەتی و پێشەوایەتی: کاتێك ئەو راستیە بەدەرکەوت بوونی پاشاو سەرهەڵدانی لەوەوەیە کە بەکۆمەڵبوون و ژیانی کۆمەڵی مرۆڤەکان پێویستیەکی مرۆیی بووەو، لەنێو ئەم بەکۆمەڵی ژیانەدا خۆسەپاندن و توندونیژی نواندن بەرامبەر بەوانی دی هەڵگرتوە، کەئەمەش لە شوێنەوارەکانی توڕەیی و بەشە ئاژەڵیەکەی مرۆڤە، ئەمانە جۆرە یاسایەك بوون لەگەڵیدا بەزۆری راستی تیایاندا ژێرپێخڕاوە، ئەوانەی کەلەسەروتر بوون لە دەسەڵات و پێگەوە لەناو ئەو کۆمەڵگانەداهەردەم زەوتکار بوون بێ بەزەییانە مامەڵەیان لەگەڵ خوار خۆیان کردوە، بەوەی کەشتانێکی وەهایان خستوەتە سەرشانیان کە نەمافو نەئەرك بوە لەسەریان ئەوەش بەهۆی ئەو هەواو هەوەسەوە کە لە دەروونیاندا بوە، دیارە بەمەش جیاوازی مەبەست و خواست لە پێشکەوتوو لە پاشکەوتوو کەوتوەتەوەو وایکردوە بابەتی ملکەچی نواندن و گوێرایەڵیکردن بۆ ئەم جۆرە قورس بێت لەسەریان، لێرەوە

---

[1] سورة البقرة١٤٣.

دەمارگیری و عەصەبیەت سەریهەڵداوەو بەرەوو خوێنرشتن و کوشت و کوشتار رۆیشتوون، بۆ چارەسەری ئەمەش واپێویست بوە بگەڕێنەوە بۆ دانانی یاساو رێساوەکی سەپێنراو کەهەموان بەڵێی بۆبکەن وملکەچی بنوێنن بۆ بریاروەکانی، وەك ئەوە لەپێشتر لای فارسەکان کۆمەڵێك لەگەلانی تر بوونی هەیووە، ئەگەر دەوڵەتێك بەلای ئەم شێوازە لەسیاسەتکردن رۆیشتبێت کاروباری بۆ رێکنەخراوە، هەروەها نەتوانراوە بەسانایی لێوەرنەگیراوەتەوە:(سنة الله في الذين خلو من قبل) ئەگەر ئەم یاسایانە پێویستکراو بن لەلایەن خوای گەورەوە بەسەر عاقڵ و گەورەکانی دەوڵەتدو رۆشنبیرەکانی ئەوا یاسای سیاسی و هۆشمەندی بوون، خۆئەگەر ئەویاسایانە پێویستکرابن لەلایەن خوای گەورەوە لەرێگەی یاسادانەرێك کەبریاریان لەسەربدات و بیانکات بەتەشریع ئەوا یاسای ئاینی و سیاسی سودمەند بوون بۆ ژیانی دونیایی و پاشەرۆژی، چونکە درووستکردنی بوونەوەرەکان بەمرۆڤیشەوە تەنها بەمەبەستی دونیایی خەلق نەکراوە، ئەگەر وابوایە ئەوکات هەمووی پوچ و بێ مایەدەبوو دواجار ئامانجی مردن و تیاچوونی هەموان دەردەچوو وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (افحسبتم أنما خلقناكم عبثا) مەبەست لێی ئەوەبوە کەئەو دینە بەرەو بەختەوەری لەژیانی دوارۆژدا بیانبات لەپاڵ باشکردنی بارودۆخی ئەم دونیایەیان، (صراط الله الذي له مافي السموات وما في الارض) دیارە هەموو شەریعەتەکان هەڵگری ئەم بیرە بوون لە هەموو بارودۆخێکی بەندایەتی و مامەڵەکردن، تەنانەت لای ئەو پاشایەتیەی کەوا کۆبوونەوەی مرۆیی بە شێوەیەکی

سرووشتی بوەو لەسەر پەیڕەوی شەریعەت ڕۆیشتوە، تاوەکو بەتێڕوانینی یاسادانەر ببێتە چوارچێوەیەك کە سنورێك بۆ خۆسەپاندن و ستەم و هێزوی دەمارگیری و خراپەکاری و دوژمنایەتی دابنێت و خەصڵەتە خرابەکان ببنە شتێکی بێزراو تیایدا، وەك چۆن ئەو شەریعەتەش هەڵگری دانایی سیاسی یە، خۆئەگەر دانایی سیاسی لە بڕیارو داڕشتە کردەییەکانی دا نەبێت دووبارە بەبێزراو لەقەڵەم دەدرێت، (ومن لم یجعل الله نورا فماله من نور)، چونکە یاسادانەری راستەقینە (خوای پەروەردگار) زاناترە بەسەر بەرژەوەندیەکانی هەمواندا و لای ئەو کارو مامەڵەی دوارۆژیشیان زانراوەو پەنهانە، کردەی مرۆڤەکان هەموویان دێنەوە سەر رێگەی لەرۆژی دواییدا لە دەسەڵات بێت یان هەرچی تر، پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: (إنما هي أعمالكم ترد علیکم)، دیارە ئەو بڕیارانەی سیاسین هەموویان لەبۆ بەرژەوەندی دونیایی دەدرێن، (یعلمون ظاهرا من الحياة الدنيا) مەبەستی یاسادانەری راستەقینە (خوا) بۆ خەڵکی باش بوونیانە بۆ رۆژی دوایی، بۆیە پێویستە بەپێی شەریعەتەکان هەموو بریارە شەرعیەکان لە باری دونیایی و دوارۆژیدا لەکۆڵبگرن، ئەمە ئەو بریارەیە کە بۆ ئەهلی شەریعەت و خەمودااوای پێغەمبەران وئەوەی کەوەك ئەوان و شوێنکەوتەو لاساییکەرەوەی ئەوان لە جێنشینەکان دەیخاتە سەرشانی. لێرەوە بۆت ڕوون بوویەوە کە واتای جێنشینایەتی چیە، دیارە پاشایەتی و دەسەڵاتدارێتی سرووشتی لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەوشتانەیەکە تێڕوانینی عەقڵانی لەخۆی دەگرێت بۆ هێنانی

بەرژەوەندیگشتی و دوورخستنەوەی زیان و کێشەکان لە کۆمەڵگە، بەڵام جێنشینایەتی هەڵگرتن و لەبەرچاوگرتنی تێڕوانینی شەرعیانە بۆ هەرچی ئەوەی بەرژەوەندی دونیایی و دوارۆژیە کە بەدەستبهێنرێت بۆ کۆمەڵگە، لەدۆخێکدا بارودۆخ و ژیانی دونیایی لەلای خوای پەروەردگار وەك کێڵگەیەك بۆ بۆبەدەستخستنی بەرژەوەندی دوایی لەبەرچاوگیراوە، ئەوکات لەراستیدا جێنشینایەتی دەبێت لەخزمەت و پارێزگاری ئاین و یاساکانی و بەرێوەبردنی دونیادا بێت.؟[(١)].

چەمکی (جێنشینایەتی– الخلافة) چەمکێکی قورئانی و پێغەمبەری باوە لەگوتاری پێغەمبەریدا بە شێوەی موتەواتر هاتوە، وەك لەچەندین فەرمودەدا هاتوە: (پاشان جێنشینایەتی بەرقەراردەبێت لە سەر پەیرەوی پێغەمبەرایەتی)[(٢)].

پاشان فەرمودەی (جێنشینایەتی دوای من سیە) لە ریوایەتێکی تردا (جێنشینایەتی پاش من سی ساڵ دەگوزەرێت)٢. گوتراوە بە جێنشین جێنشینایەتی، بەو پێیەی کە جێنشینی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) دەبێت لەکاروباری سیاسی و گەلدا، هەروەها دەوڵەت و دەسەڵات دادەمەزرێنێت، دیارە جێنشینایەتی بریتیە لە میرایەتیکردنی بڕواداران وهەستان بە بەڕێوەبردن و جێبەجێکردنی سیاسەتی کاروباری دەوڵەت، چەسپاندنی ئەحکامەکانی ئاین، ئیمامی ماوەردی پێناسیەی خەلافەت و پێشەوایەتی ئیسلامی بەم شێوازەکردوە دەڵێت: (پێشەوایەتی بابەتی

---

[1] مقدمة ابن الخلدوون١،٢٣٧.

[2]–رواه احمد في المسند ٢٧٣/٤

جێنشینایەتی پێغەمبەرە بۆ پارێزگاری لە ئاین و بەڕێوەبردنی کاروباری دونیاو سیاسەتکردن، ئەمەش پەیمانێکە دەدرێت بەوەی کە بەو ئەرکە هەڵدەستێت رایدەپەڕێنێت لە نێوگەلدا کە بۆخۆی واجبێکە بەکۆرای زانایانی ئیسلام).[1]

هەروەهاوەك ئیبن وعەقیلی حەنبەلی سیاسەتی شەرعی پێناسە کردوە بە (هەموو کردەیەکە کە لە چاکویستی و بەرەوچاکەبردنی خەڵکانەوە نزیك بێت و تێپەڕی نەکات لەوەی کەلە قورئان و ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمانی پێکردوە و هێناویەتی). جێنشین و جێنشینایەتی چەمکانێکن کە ئاماژەیەکیان تێدا نییە کە واتای خاوەن موڵکی و خاوەن بڕیاری رەهاو یان خۆسەپاندن بدەن، هیچ کات ئەو واتایانە نادەن کە ئیسلام لەبنچینەدا بۆ رادانی ئەو چەمکانە هاتوە، بۆ فڕێدان و دوورخستنەویان لەکۆڵی خەڵکی رەوانەکراوە، لەبەر ئەوە ئیسلام هاتوە چەمکی نوێی هێناوە کە شێوازێکی تری بەدیل لە حوکمرانی و بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکی کەتیایدا هاتنەوەی تەواویان لەگەڵ گوتاری قورئانی و ئاسمانی بنەماو رێنمونییە کانی بێت، لەبەرئەوە چەمکی (پاشا– الملك)ی بەکارنەهێناوە کەواتای بەموڵککردنی مرۆڤەکان و شتەکانە بۆ تاکەکەسێك دەدات و مافی دەستوەردان و بەکارهێنانی هەموو کاروبارو شتێکی ناودەوڵەتی هەبێت، هەروەها چەمکی سوڵتانی بەکارنەبردوە کە

---

[1] الاحكام الصلطانية ص ٥.

مانای دەسەڵاتداری خاوەن هێزو چەوسێنەر بدات، بەڵکو چەکێکی وەهای بەکاربردوە کەهیچ کات ئەو واتایانەی لێنافامرێتەوە، بەڵکو ئەم جۆرە واتایانەی خوارەوە دەبەخشێت:

یەکەم: چەمکی جێنشین و جێنشینایەتی بریتیە لەوەی کە کەسێك جێگەی کەسێکی تری پێش خۆی دەگرێتەوە.

دووەم: چەمکی (پێشەوایەتی و پێشەوایی– الامام والامامة) ئەوەیە کەپێشدەخرێت بۆ سەرکردایەتیکردن، وەك پێشەوایەك (ئیمام) دەچێتە پێشەوە بۆ نوێژی جەماعەت. ئیبنو خەلدوون لەسەر سیستمی جێنیشنایەتی دەڵێت: (بریتیە لەجێگرایەتی لەجێگەی خاوەنی شەریعەت کە بتوانێت پارێزگاری لە ئاین و سیاسەتی دونیا بکات پێی، پێدەوترێت جێنشینایەتی و پێشەوایەتی، ئەوەی پێی هەستێت هەم جێنشینەو هەم پێشەوا، بەڵام ئەوەی پێیدەوترێت پێشەوا بەوەی کە دەچوێنرێت بە ئیمامی نوێژ کەئەوەی لەدوایەوەتی شوێنی دەکەوێت و ئەوەی ئەو دەیکات جێبەجێی دەکات، لەبەر ئەوە پێی دەوترێت پێشەوایەتی گەورە، هەرچی ناولێنانە بەجێنشین لەوەوەیە کە دوای پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) هەمان ئەرکی ئەو لەگەڵ گەلەکەی جێبەجێی دەکات، بۆیە دەکرێت بوترێت جێنشین بەتەنیا یان جێنشینی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم).[1].

[1] مقدمة ابن خلدون١/٢٣٩.

سێیەم: چەمکی (ئەمیرایەتی– الإمارة) ئەمیر بریتیە لەوکەسەی کەخاوەنی بریارە و خاوەن پێگەیەکە کە بڕیاری تیادەدات، هەروەها واتای راوێژکاریش دەگەیەنێت،لە فەرهەنگی لسان العرب دا هاتوە: (الامیر: خاوەن فەرمان.. الائتمار والاستئمار: واتە راوێژکاری، هەروەها التآمر واتا راوێژکردن، وآمرە في أمرە واستأمرە بەواتای راوێژی پێکرد، دێت دیسان وآمرتە مؤامرة دیسان واتای راوێژکردن دێت، هەرکەسێك کە پەنا بەراوێژپێکردن و گەرانەوە بۆلای بۆ جێبەجێکردنی کارێك ببرێت ئەوە ئیتر پێی دەوترێت ئەمیر، هەروەها لە فەرمودەدا هاتوە: (آمروا النساء في أنفسهن) واتە راوێژیان پێبکەن، لەفەرمودیەکی تردا هاتوە: (کچ مۆڵەتی بۆ وەردەگیرێت، و بێوەژن راوێژی پێدەکرێت) ئەمیر سەرکردەیە و اولو الامر بریتیە سەرۆك و خەڵکی زانا، خوای گەورە دەفەرموێت: (أن الملأ یاتمرون بك) واتە راوێژدەکەن سەبارەت بە کاروبارەکانت، هەروەها (وتآمروا علی الامر وائتمروا) واتە راوێژدەکەن و کۆرایەك بەهەمویانەوە دەردەکەن.

لێرەوە (أمیر المؤمنین– ئەمیری بڕواداران) سەرکردەی بڕوادارانەو راوێژکاریانە لەو کاروبارانەی کەئەو بەرێوەی دەبات، وەك چۆن ئەویش پرس و راوێژ دەکات بەوان، داوای راوێژی لێدەکەن و داوای راوێژ لەوان دەکات لە هەموو کاروبارێکدا کەپەیوەست بێت بەگشتەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وامرهم شوری بینهم) ئەوە ئەوەیە کە هەڵیانبژاردوەو پاش ئەوەی پرس و راوێژ لەنێوانیاندا گوزەریوە و کۆڕایان لەسەری دروستکردوە، وەك ئیمامی عومەر دەفەرموێت

(پێشەوایی و سەرکردایەتی بەراوێژی نێوان موسڵمانان دەبێت). ئەم هەموو چەمکانە وەك وتمان واتایەکی تێدانییە بچێت بەدەوری واتای (پاشا– ملك) و خۆسەپێنەرو یان ئەوەی گوایە تەنها سەرۆکایەتی موستەهەقی بنەماڵەیەکە، یان کەسێکە، یان باچەوسێنەرو بەهێزو...هتد، لە لایەن گوتاری ئیسلامی قورئانی و پێغەمبەریەوە دەربرابێت، بەڵکو بەجوانترین شێواز چەمکی جێنشینایەتی و ئەمیرایەتی و پێشەوایەتی دەربراون، کە ماناو مەغزای گوتاری راستەقینەو مرۆڤدۆستانە تێدایەو لەگەڵ ئامانجی و مەبەستی گوتارەکەدا دێنەوە.

هەروەها گوتاری پێغەمبەرایەتی بریاری داوە لەسەر ئەوەی کەبڕواداران دەبێت یەك جێنشینیان هەبێت، لە ئەگەری هەبوونی دوو پێشەوا یان جێنشین لەیەك کاتدا، پێچەوانەی ئەو گوتارەیە کە واجبی کردوە کە کۆمەڵ و هاوپەیمانییە تی نێو مرۆڤەکان بوونی هەبێت، هەروەها حەرامی کردوە کە لێکترازان و جیابوونەوەو جیاوازی درووستکردن، کە نیشانەو دۆخی سەردەمی نەفامی بوون، بوونی هەبێت، بۆیە ئیسلام هاتوە تامرۆڤەکان کۆبکاتەوە لەسەر بنەمای هاوکاری و پێکەوەژیان و یەکتاپەرستی، کە دەفەرموێت: (واعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا واذكروا نعمة الله عليكم اذكنتم أعداء فألف بين قلوبكم فاصبحتم بنعمته اخوانا).

ئیبن و کەسیر لە تەفسیرەکەیدا بۆ ئایتی (إني جاعل في الارض خليفة)[1]. دەڵێـت: (دەسەڵات گرتنەدەستی دوو پێشەوا یان زیاتر رەوانییە، بەفەرمودەی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) کە دەفەرموێـت: (ئەوەی هاتە لاتان و فەرمانی بەهەموتان کرد، کەیەکێکی تر بکەن سەررکی خۆتان بەدەر لەوەی خۆتان هەڵتان بژاردیوو ئەوا بیکوژن هەرکەس و هەرچۆن هەبوو) ئەمەش گوتەی جەماوەری زانایانە، دەوترێت کۆرای زانایانی لەسەرە، بێجگە لە پێشەوای حەرەمەینی پیرۆز.).

ئیمامی نەوەوی لە راڤەی ئەم فەرمودەیەدا (سیکون خلفاء فیکثرون) دەفەرموێت (زانایان کۆڕان لەسەر ئەوەی کە ناکرێت و رەوانییە کە پەیمان بدرێتە دوو جێنشین و دووان هەبن لەیەك کاتدا، جا ئەگەر دارولئیسلام فراوان بووبوو یان نا، ئیمامی حەرەمەین لەکتێبەکەیدا (الارشاد) دەڵێت: هاوەڵانمان پێیان وتوین کە رەوانییە لەیەککاتدا پەیمان بە دوو کەس بدرێت وەك جێنشین، بەرای منیش رەوانییە پەیمان بدرێتە دوان لە یەك شوێنا، ئەوەش کۆرای زانایانی لەسەرە، ئەگەر دووریەك لەنێوان ئەو دوو پێشەوایەدا هەبوو، ئەو دووریە وایکردبوو نێوەندێکی جیاکەرەوە هەبێت ئەوە دەگونجێت بوارێك بۆ ئەوە هەبێت، ئەمەش لە دەرەوەی بەڵگە یەکلاکەرەوەکانەوەیە.

---

[1] البقرة٣٠.

ئیمامی نەوەوی ئەم دەستەواژەیەی کۆتایی راستکردوەتەوە، حوکمی پووچەڵی بۆ چەندێتی جێنشینی داوە ئەگەرچی دوورە وڵاتایش بن، بەوتەی (ئەوە وتەیەکی پووچە، پێچەوانەی پێشینەکان وپاشینەکان و ڕووکاری فەرمودەکانە.)

ئیبنوحەزم لە خستنەڕووی پووچەڵی فرەیی پێشەوادا دەڵێت: (تێکرا ئەو زانایانەی ئاماژەمان پێدان و کە لەسەر پێویستی پێشەوا کۆکن، ئەوان وایدەبینن کە ناکرێت لەیەك کاتدا دوو پێشەوا هەبن لە جیهاندا، بەڵکو یەك پێشەوا دەبێت هەبێت، تەنیا موحەمەد کوڕی سجستانی و ئەبو صەباحی سەمەرقەندی و هاورێکانی، ئەوان ڕێیانداوە بەهەبوونی دوو پێشەواو زیاتر لەیەك کاتدا ئەوانیش پشتیان بەوەبەستوە کە پشتیوانەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) لە رۆژی سەقیفە بە کۆچەرەکانیان وت (منا أمیر ومنکم أمیر) هەروەها بەڵگەی ئەوەی کە ئیمامی عەلی و ئیمامی حەسەن لەیەك کاتدا مەعاویەش هەبوو (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەبو موحەمەدی کوڕی حەزم ووتویەتی: ئەوانە هیچ کام نابنە بەڵگە، پێویستی بەرپەرچدانەوەی ئەوەی کە کێشەیان لەسەری دروستکردوە، بۆ ئەوەی کەخوای گەورە پێویستی کردوە کە بۆی بگەڕێتەوە لەکاتی ئەو کێشەیەدا، وەك ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: (فان تنازعتم في شيء فردوه الى الله والرسول ان كنتم تؤمنون بالله واليوم الاخر) ئەگەر سەرنج بدەین لەوە دەبینین لەوبارە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتویەتی: (اذا بويع لامامين فاقتلوا الاخر منهما)، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:

(ولاتكونوا كالذين تفرقوا واختلفوا)، هەروەها دەفەرموێـت: (ولا تنازعوا فتفشلوا وتذهب ريحكم) خوای گەورە ناكۆكی كێشەنانەوەی نێوان موسڵمانانی حەرامكردوە، دیارە ئەگەر دوو پێشەوا هەبن ئەوە كێشە درووستدەبێـت و دواجار ناكۆكی و ململانێ و ڕوودانی سەرپێچیكردن ولادان لەفەرمانی خوای لێ دێتە ئاراوە، وتمان ئەوەی كە حەڵاڵ نەكراوە بۆمان، یان ئەوەیە لە ڕێگەی سەرنج و بەرژەوەندی تەماشای دەكەین، ئەگەر ڕێپێدراوبوو دوو پێشەوا هەبن ئەوا ڕێگەدراویشە كە سیان و چوارو زیاتریش هەبن، خۆ ئەگەر ڕێگری كرابوو لەوە ئەوە ئیتر پێویست بەقسەو بەبەڵگەهێنانەوەی بێ ئەرزش ناكات و ئەوە شتێكی پووچە و هیچ وتەیەكی بۆ كەس نەهێشتوەتەوە.

ئەگەر ڕێپێدراو بوایە، ئەوا كاردەگەیشتە ئەوەی هەموو شارێك پێشەوایەكی دەبوو، یان هەموو گوندێك پێشەوایەكی دەبوو كاردەگەشتە ئەوەی هەموو خانەوادەیەك جێنشینی بۆدیاریدەكرا، ئەمەش لادان و تێكدان و بەهیلاكبردنی دین و دونیایە،

ئەوە ڕاستە كە ئەنصاریەكان وتویانە (مننا أمير ومنكم أمير) ئەوە تەنها گوتەیەكی سەهوو بوو، لێیگەرانەوە و ڕاستیانكردەوە، خوای گەورە پاراستنی لەوەی درێژەی پێبدەن و لەسەری برۆن، پاشان ئەوەی سەبارەت بە ئیمامی عەلی و حەسەن و مەعاویە (ر.خ) ڕاستە پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) ئاگاداری دابوو لەوەی كە یەكێكی دەرچوو لەو دوو تاقمە دەچێتەدەرەوە یەكێكیان كوشتاری لەگەڵ دەكات كە ئەو لەسەر حەقە، دیارە كوشتاركەری ئەم خەوارجانە لەدەستەی ئیمامی عەلی

بوون، کەئەو خاوەن ماف بوو بێگومان، هەروەها پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ئاگاداری دابوو کە عەماری کوڕی یاسر بەدەستی تاقمێکی یاخی دەکوژرێت، ئەوەش ئەوەی راستترکردەوە کە دەستەی ئیمامی عەلی لەسەر حەقە، و ئەو پێشترکەوتوە لەوەی کە پێشەوایەتی پێرەوابینراوەو هەڵبژێراوە، راستە مەعاویەش دواتر کراوە بەپێشەوا، هەروەها ئەوەی کێشەی لەگەڵیدا درووستکردوە ئەو بوەو هەڵەبوە، بۆیە مەعاویە هەڵەکارێکی پاداشت دراوەبوە (ماجور) لەلایەك چونکە ئیجتیهادی کردوە، و لەلاکەی ترەوە پێویست بە بەڵگەهێنانەوە بۆ هەڵەکار نییە، لەبەرئەوە گوتەی ئەوانەی دەڵێن رەوایە دوو پێشەوا هەبێت بەم نموونانە نمونەکانیان پووچەڵن، هەروەها گوتەی ئەنصاریەکان کە وتویانە (منا أمیر ومنکم أمیر) ئەوە تەنها مەبەستیان بوو کە والیش لەوان هەبێت دوای ئەوان، ئەگەر لەکۆچەرەکان پێشەوا مرد با لەوانیش دوای کەسێك بکرێتە پێشەوا، نەك وەك ئەوەی بڵێن بالەیەك کاتدا دوو پێشەوا هەبن، ئەوە رواڵەتی وتەکەی ئەوانیشە زیاتر، سەبارەت بە عەلی و مەعاویە (ر.خ) هیچکامیان ملیان نەدا بۆ هیچکامیان و هەریەکەیان لای خۆیەوە خۆی بەراست دەزانی، هەروەها سەبارەت بەحەسەن (ر.خ) ئەو پێشەوایەتی تەسلیم بە مەعاویەکرد، ئیستە ئەگەر ئەوەبێت کەواتە گوتەی زانایان راستە و پوچەڵی بۆ گوتەکەی ئیبن و کیرام و ئەبی صەباح دەبێت، وەهەرچی تر کە لەسەر قسەی ئەوان زیادکراوێکی هەبێت. [1]

---

[1] الفصل فی الملل و النحل٤/٧٤.

## حەرامکردنی چەند پێشەوایی و بەرگیری لێکردنی:

فەرمودەی دووەم کەلە ئەبوسەعیدی خودریەوە بەمەرفوعی هاتوە: (ئەگەر بەیعەتدرا بە دوو جێنشین بایەکێك لەوان بکوژن)[1].

لەم فەرمودەیەدا ئەوە چەسپاوە کە لە مافی گەلە هەڵبژاردنی جێنشین، ئەوەش لەرێگەی پەیمانەوە دەبێت، ئەوەی پەیمانەکە درووستدەکات و پەیمانەکە دەدات بریتیە لەگەل، (کرداری ئەم فەرمودەیە (بویع) بە بکەر نادیار هاتوە، بکەر دیار کە بریتیە لە (گەل–امە) لابراوە، ئەوەش مانای ئەوەیە کە بکەرەکە (گەل) زۆر دیارترە لەناو هێنانەکەی، حوکەکەشی لەسەر پەیماندان وەستاوە، بەمانا ئەگەر ئەوان پەیمانی پێنەدەن جێنشین نییە، نەلەپێش و نەلەپاشیش، وەك چۆن چۆن مافی ئەوە دراوە بەگەل خۆی هەستێت تەنانەت بە کوشتنی و لادانی جێنشینی دووەم، هەروەها ئەمە ڕووی قسە لەم فەرمودەیە لە (گەلە) کە دووەم بەسەر ئەودا دەستدرێژی کردوەو بێ پرسی و راوێژی ئەو خۆی کردوە بە جێنشین، لەکاتێکدا خوای گەورە ئەو دەسەڵاتەی داوە بەگەل و بۆ ئەوی جێهێشتوە کەکێ بکات بەجێنشین، ئەم شێوازی "ڕووی قسەکردن لەلایەك" سەرەتای جۆرێك لە ئەحکام شەرعی گشتیە.

فەرموودەی سێیەم: لەعەبدوڵای کوڕی عومەرەوە بەمەرفوعی هاتوە: (ئەوەی بەیعەتی بە پێشەوایەك دا، دەستی پەیمانی خستە ناو

---

[1] مسلم فی صحیحه ح١٨٥٣.

دەستی، بەدڵسوزی و نییە تپاکی خۆی، ئەوا پێویستە گوێرایەڵی بکات هەرچەندە توانی، ئەگەر کەسێکی تر هات و بەرامبەرکێی لەگەڵ کرد بۆ ئەوەی ریبدات، با لەگەردنی کەسی دوەم بدات)[1].

لەم فەرمودەیەدا ئاماژەیەکی تێدایە کەلە فەرمودەکەی پێشوتردا نییە ئەویش ناوهێنانی جێنشینە بە (پێشەوا) هەروەها باس لە بڕیاری واجب بوونی گوێرایەڵی تێدایە لە سەر ئەو بەڵێنەی کە بەویستی خۆی داویەتی لەکاتی بەیعەتەکەدا، کە بریتیە لەدەستخستنە ناو دەستی دوولایەن، پاشان پێشەوایەتی و جێنشینایەتی ئەوەنییە لەلایەنێکەوە دیاری بکرێت و تەنها مافی کەسێك یان بنەماڵەیەك بێت، بەڵکو جەخت لەوە کراوەتەوە کەگەل تەنها بۆخۆی خاوەنی ئەو مافەیەو کێ بەشایەنی ئەو پێگەیەو دەزانێت و متمانەی پێدەبەخشێت، بۆیە بۆیان هەیە بە پێچەوانەوە ئەوەی نەیانەوێت نەیکەن، کەئەمە لە ناواخن و دارشتەی بەشی یەکەمی فەرمودەکەدا بەروونی دەردەکەوێت، ئەو هەموو دەسەڵاتە دیاری دەکات کە بۆ کێ یە و کام شایەنە دیاری بکات وەك ئەوەی شایەنی جێنشینایەتی بێت، ئەوەی مەرجانەی کە ئەو دیاریکردوە تیایاندا یە بیانکات بەپێشەوای خۆی، بەڵام بەرەهاییش نا.وەك خوای گەورە بە ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) دەفەرموێت: (إني جاعلك للناس اماما قال ومن زريتي قال لاينال عهد الظالمين) قورتوبی لە راڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت: کۆمەڵێك لەزانایان

[1] مسلم فی صحیحه ح١٨٤٤.

ئەم ئایەتەیان کردوە بەڵگە بۆ ئەوەی کە پێویستە پێشەوا لە خەڵکانی چاك و چاکویستان بێت، لەگەڵ بەهێزی خاوەن شایستەیی بەو کارەی کە پێی هەڵدەستێت، ئەوەش ئەو فەرمانەیە کەپێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) دەیکات، دەفەرموێت کە ناکۆکی مەنوێنن لەسەر پرسی دەسەڵات و ئەوەی کە ئەهلی ئەوەیە، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، دیارە خەڵکانی ستەمکارو لەرێدەرچووو تاوانبار شایستەی ئەو ئەرکە نین، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (لا ینال عهد الظالمین) لەبەر ئەوەبوو ئیبن و زوبەریرو حەسەنی کوڕی عەلی (ر.خ) دژی دەسەڵاتی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی راپەرین، هەروەها کەسە دیارو زاناکانی خەڵکی عێراق بەهەمان شێوە دژی حەجاج راپەرین، هەروەها خەڵکی مەدینە لەدژی نەوەی ئومەییە و ئەوەی ئەنجامی دەدا، راپەرین ئەوەبوو ڕووداوەکەی (حەررە) ڕووی دا موسلیمی کوڕی عەقەبە دای بەسەریاندا.

## ئارامگرتن لەسەر مامەڵەکاری دەسەڵات و پێدانی مافەکانی:

وەك لە ئیبنو مەسعودەوە هاتوە: پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) پێی فەرموین: (ئێوە پاش من خەڵکانێکی بۆخۆویست ودەسەڵاتدارانێکی تەنها بۆخۆویست دەبینن کە ئێوە ناتانەوێنو رقتان لێیانە) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) چ فەرمانێکمان پێدەکەی بۆ ئەوکاتە، فەرمووی: (ئێوە مافی خۆیانیان بدەنێ و لەخواش

داوای مافی خۆتان بکەن)[1]. لە ریوایەتی بوخاریدا بەم شێوازە هاتوە: (ئێوە ئەو مافەی بەسەرتانەوە بۆ ئەوان جێبەجێی دەکەن، داواش لەخودا دەکەن لەسەر ئەو مافەی کە لەسەریانە جێبەجێ بکەن)[2].

لەم فەرمودیەدا پێغەمبەری خوا "صلّ الله علیه وسلّم) ڕووی گوتەکانی بەرەو هاوەڵانییە تی و هەواڵیان دەداتێ کە ئەوان دەسەڵاتی خۆسەپێنەر دەبینن، خۆسەپێنەریش واتە دەستبەسەرگرتنی شتێك (کە هی هەموانە) بۆخود، بەخۆکردن، دیارەپێغەمبەری خوا لەعەقەبەدا پەیمانی لێوەرگرتن لەسەر (گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆفەرمانەکان لە خۆشی و ناخۆشی، ئەوپەیمانە بخەینە پێش خۆمان و پاشگەزنەبینەوە).

دیارە رەفتارەکانی دەسەڵات جیاناکرێنەوە لەخۆویستیەکەی و بەویستی خۆکارکردنەکەی، پێشەواو تاقمەکەی خۆی هەڵیدەبژێرێت، ئەمیرەکان و سەرکردەسوپاییەکان ئەمانە خۆی هەڵیاندەبژێرێت، ئەوەش کۆمەڵێکی تایبەت دەکات بۆ ئەوبوارەو پێشیان دەخات بەسەرخەڵکانی تردا، کۆمەڵە خەڵکێکی کەم رەزامەند دەبن لەوانەی کەهەڵینەبژاردوون، ئەوان واهەستدەکەن کە فیڵیان لێکراوە، راستی پێشێلکراوە، بەڵام لەم سەروەختەدا ئارامگری بەپێویست زانراوە، هەروەها پێشەوا ئەوەی قەدەغە لێکراوە کە کاروبار بداتە دەست نزیکەکانی خۆی لەبەر نزیکیان، بەڵکو پێویستە شیاوترینی کەس

---

[1] صحیح البخاری ح ٧٠٥٢.

[2] - صحیح البخاری ج ٣٦٠٣، ومیلم ١٨٤٣.

لەموسڵمانان هەڵبژێرێت، و جیاکاری نەکات. بەڵام دیارە ئەم واناکات لە باشترین دۆخیشدا کەسێك هەڵدەبژێرێت کەنزیکی و هاتنەوەی لەگەڵیدا هەبێت و ملکەچی زیاتری بۆبکات، چونکە بەمە دەیەوێت ئەو پێگەیە و ئەو پێگانەی دەسەڵات بەتایبەتی بکرێن و تەنها هی خۆی بن و بەدەس کەسی ترەوە نەبن، ئەمش پێی دەوترێت (الاثرة) واتە تەنها بۆخۆویستن خۆسەپاندن، دیارە لەزمانی عەرەبیدا وشەی (الاثرة) بەمانای (پێش خستن و بەباشتر زانین و بەتایبەتی کردنی شتێك دێت، بۆنمونە لە چیرۆکی براکانی یوسفدا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (قالوا تالله لقد آثرك الله علينا) واتە تۆی تایبەتمەندکردوە و فەزڵی زیاتری پێداوی، ئەوەش ئەو مانایەیە کە لە فەرمودەکەدا هاتوە لە پەیمان بەستنی عەقەبە لەگەڵ پشتیوانان (الانصار) کە داوای گوێرایەڵی و (اثرة)ی لێکردن بۆخۆی، واگومان نەبرێت کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) کارێکی وەها بکات و بکەوێتە ناویەوە تاوەکو لەوان پەیمان وەربگرێت کە ئارامیان هەبێت لەسەری، بەڵکو ئەوە مانای ئەوەیە کە دەسەڵات هەردەم پێویستی بە گوێرایەڵی هەیە، هەروەها ئارامگرتن لەسەر ئەو ئەرکخستنە سەرشانیانەی خۆی لەکاروباری گەل و ئەرکی گشتی ئەنجامی دەدات، پاشان بەردەوام فەزلی هەندێکیان دەدات بەسەر ویستی و خواستی هەندێکی ترو هەندێکیان پێشدەخات، لەمەشەوە رق و رژدی لەنێوان ئەوان هاو ئاستن درووست دەبێت، بۆیە ئارامگرتن بە پێویست گیراوە لە سەر ئەم جۆرە تایبەتمەندی و پێشخستنانەو بۆهەندێك ویستانە، کاتێك دەسەڵات مامەڵەی لەگەڵیدا

نەپچراند، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) بەڵێنی لێوەرگرتن لەسەر ئارامگرتن لەسەر (الاثرة) کە لەدەسەڵاتەوە دەکەوێتەوە، کاتێك تايبەت دەکرێت بەهەندێکيان و بۆکاروباری هەموان بەکاردەبرێت و بەشێکی تريش بیّ بەشدەکرێن.

## پارێزگاريکردن لە پێشەوا و بەحەرامگرتنی را پەرین لێی:

وەك لە ئيبن و عومەرەوە بە مەرفوعی فەرمودەکەهاتوە دەفەرموێت(ئەوەی دەست بەربدات لە گوێرايەڵی کردنی پێشەوا، لەبەردەم خوای گەورەدا دەوەستێنرێت و بیّ ئەوەی وەڵامێکی هەبێت، ئەوەی مرد و لەگەردنيدا پەيمانێك نەبوو ئەوە وەك مردنی نەفاميانە مردوە).[(١)]

لەم فەرمودەيەدا بنەمايەکی گەورە لە بنەماکانی گوتاری پێغەمبەرايەتی بوونی هەيە، ئەويش رانەپەرين دژی دەسەڵات، پاش ئەوەی کە پەيماننامە و بەيعەت ئەنجامدرا، و پێويستە گوێرايەڵی بکرێت و هيچ بيانوويەك بەدەستەوە نييە بۆ ئەوەی کە راپەرێت لە دژی، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر بەراوێژ لەنێو موسڵمانانداو هەڵبژاردن بۆ دەسەڵاتدرا ئەنجامدرا، بۆيە ئەوە پێويستی بەراوێژو شورايەکی ديکە وکۆبونەوەيەکی ديکە دەبێت بۆ گۆڕينی و يان لەکارلادانی. بۆيە بۆهيچ کەسێك نييە دەست بکێشێتەوە لەو بەيعەتە شەرعيە راستەقينەيەی

---

[1] مسلم فی صحيحه ح ١٨٥١.

کەداویەتی، بەبێ ئەوەی شوراو راوێژی گەل دووبارە بڕیارلەوبارەوە دەرنەکات، وەك ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین کە بیری نەفامیەو گەراوەتەوە ناو کۆمەڵگەکان.

هەروەها لەفەرمودەی دووەم بنەمایەکی تر بوونی هەیە ئەویش پێویستی ژیان بەکۆمەڵو لەگەڵ کۆمەڵبوونە، هەروەها باوەر بوون بەگوێرایەڵی و ملکەچی، لێرەوە رێپێدراونییە بۆ موسڵمان کەلە کۆمەڵ بچێتە دەروەو دژی کۆمەڵ بێتەوە وەك ئەوەی ئیمرۆ دەیبینین.

مەبەست لەوە بەگشتی ئەوەیە کە ئەگەر لەدۆخێکدا کۆبونەوە لەسەر ئەوەی یەك پێشەوایان هەبێت، هیچ جیاییەك و کێشەو جیاوازیەك لەوبارەوە لەئارادا نەبوو، بەڵام ئەگەر لەسەردەمی کێشەو فیتنەدابوو وەك ئەوەی لەم رۆدا دەیبینین، ئەوە هیچ بەیعەتێك گەلی موسڵمان مولزیم ناکات بۆ یەکێك لەو هەموە جیاوازانە. جارێکیان پرسیان لە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەسەر ئەو فەرموودیە، (من مات وليس في عنقه بيعة) فەرمووی (ئایا دەزانن ئەوەکێیە؟ ئەوە ئەوکەسەیە کە پێویستە لەسەر هەمووموسڵمانێك بەیعەتی پێبدات هەموو موسڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەوە پێشەوای موسڵمانانە بەراستی) لە ریوایەتێکی تردا هاتوە فەرموویەتی: ئەزانن کێیە پێشەوا ؟ ئەوەیە پێشەوا کە تێکرای بڕواداران کۆك دەکاتەوە و تێکرا دەڵێن ئەوە پێشەوایە، ئەوە ماناکەیەتی)[1]. ئەویش بەکردەی ئیبن و عومەر بەڵگە دەهێنێـتەوە، کەئەو فەرمودەیەی

---

[1] رواه الخلال في السنة أثر رقم ١٠، باسناد صحيح عن امام مسلم احكام سلطانية للقاضى ابي يعلى ص ٢٣.

ریوایەت کردوە بەوەی کەوتویەتی (من بەیعەتی خۆم نادەم بە تاقمێکی جیاوازیخەرەوە، بەرگیریش لەبەیعتێك ناکەم بۆ کۆمەڵێکی راستەقینە) لە ئەبوسەعیدی کوڕی حەربی ئەلعەبدی یەوە وتویەتی (جارێکیان لە کۆری عەبدوڵای کوڕی عومەر دانیشتبووم لەمزگەوتی پێغەمبەر، سەروەختی ئیبنو زوبەیر بوو، دیارە لەوانەی ملکەچی ئیبن و زوبەیر بوبون لەسەرانی خەوارج بەناوی نافعی کوڕی ئەزرەق و عەتیەی کوڕی ئەسوەد و نەجدە هەبوون، یەك دوو گەنجیان ناردبوو بۆلای ئیبن و عومەر پرسیاریان لێکرد بۆچی بەیعەت بەو نادەی؟ چ هۆکارێك لەپشت بەیعەت نەدانتەوە هەیە بۆ ئیبن و زوبەیر وەك ئەمیری ئیمانداران؟ من بینیم لەوکاتەدا دەستە لەرزۆکەکانی راکێشا بۆیان پێیانی وت: سویند بەخوا من لەوانە نەبووم کەبەیعەت بدەم بۆ تاقمێك و بەرگیری بکەم لەوەی نەیدەم بە کۆمەڵێك)[1].

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی صەفوان پرسیاریلێکرد (ئەی باوکی عەبدورەحمان چی بەرگیریت لێدەکات کە بەیعەت بە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر نەدەیت؟ لەکاتێکدا خەڵکی عەروز و عیراق وزۆرێك لەخەڵکی شام بەیعەتیان پێداوە؟ ئەویش لەوڵامدا وتی: سوێند بەخوا من بەیعەتتان نادەمێ لەکاتێکدا ئێوە شمشێرتان روەو گەردنی یەك کردوە، بەدەستی یەکتر خوێنی ئیمانداران دەرێژن)[2].

---

[1] رواه البخاری فی تاریخ الصغیر رقم ٧٩٤، بیهقي في النن الکری ١٩٣/٨. باسناد حسن.

[2] رواه البیهقی فی السنن الکبری١٩٢/٨ بان عساکر في تاریخ دمشق ١٩٠/٣١.

کاتێك ناکۆکی کەوتە نێوان ئیمامی عەلی و مەعاویەوە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پەیوەست بوو بە ماڵەکەی خۆیەوە و بەیعەتی بەهیچ کام نەدا، تائەوکاتەی ئیتر کێشەکە یەکلابوویەوە و بۆ مەعاویە، هەروەها بەیعەتی بە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر نەدا کاتێ پێچەوانەی عەبدولمەلیك بوویەوە، تا ئەوکاتەی کە پرسەکە یەکلابوویەوە بۆ عەبدولمەلیك و خەڵکان گشت بەیعەتیان بەودا. (ئەمە مەزهەبی موحەمەدی کوڕی عەلیە، کە بە (مەزهەبی کوڕی حەنیفە مەشهورە)، کاتێك ئیبنو زوبەیر داوای لێکرد کە بەیعەتی بداتێ بەڵام ملی نەدا بۆی، هەروەها عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان بەهەمانشێوە داوای لێکرد، بەڵام ئەو بەنامەیەك وەڵامی دایەوە کە ئەمەدەقەکەیەتی: (بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، لە موحەمەدی کوڕی عەلیەوە بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان، سلاوتان لێبێت، من پاش سوباس وسەنای ئەو خودایە، کە هیچ پەرستراوێکی تر نییە  بێجگە لەئەو، پێتان رادەگەیەنم کەبەرێزتان راوبۆچوونی منتان پێشتر زانیوە، من لەوانە نیم ئەو رایەی خۆمم بەکەم زانیبێ و لەیادم چوبێتەوە لەبەرکەسێکی تر، سوێند بەخوا ئەگەر ئەم گەلە هەمووی کۆبێتەوە بۆم تەنها بنەماڵەی ژنەچاوشینەکە نەبێت، من لەگەڵیان ناجەنگێم، بەڵکو من کەنارگیردەبم تاوەکو هەمووتان کۆدەبنەوە، من لە مەکە رامکرد لەبەرئەوانەی لەوێ بوون، هاوسێیەتی ئیبن و زوبەیرم کرد هاوسێیەتی باشی نەکردم ویستی بەیعەتی بدەمێ، بەڵام من رەتم کردەوە، تاوەکو خەڵکی هەمووی کۆدەبنەوەلەسەر تۆ یان پشتیوانی ئەو، پاشان من دێمە ناو ئەوەی کە هەموو خەڵك بەلایدا دەشکێتەوە وەك یەکێك لەو خەڵکانە.[(1)].

[1] طبقات ابن سعد٥/١٠٨.

له عرفجەوە بە مەرفوعی هاتوە کەپێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) دەفەرموێـت (دواتر کەسانێك دێن کە خەڵکانی هینن، مەبەستی ئەوەیە لەرێدەرچوو خرابن، ئەوەی ویستی کە جوداخوازی بخەنە ناو ئەم گەلەوە، لەکاتێکدا کۆمەڵبوون، بیانکوژن هەرچۆن بۆتان کرا) لە ریوایەتێکی تردا (ئەوەی هاتە لاتان و ئێوە کۆمەڵ و یەکدەنگ بوون لەسەردەسەڵاتدان بەکەسێك بەڵام ئەو ویستی جیاخوازی بخاتە نێوانتان درز بخاتە داردەستەکەتانەوە یان کۆمەڵکەکەتان پەرش و بڵاو بکات بیکوژن).[1]

له ئەبوسەعیدی خودریەوە بەمەرفوعی هاتوە: (ئەگەر بەیعەتدرا بە دوو جێنشین بایەکێك لەوان بکوژن).[2]

له عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە بە مەرفوعی هاتوە: (ئەوەی بەیعەتی بە پێشەوایەك دا، دەستی پەیمانی خستە ناو دەستی، بەدڵسوزی و نییەت باشی خۆی، ئەوا پێویستە گوێرایەڵی بکات هەرچەندە توانی، ئەگەر کەسێکی تر هات و بەرامبەرکێی لەگەڵکرد بۆ ئەوەی رییدات، بالەگەردنی کەسی دوەم بدات).[3]

ئەم سێ فەرموودەیە ئەوە رۆشن دەکەنەوە کە یەکبوونی گەل و دەوڵەت پێویستین، هەروەها بەرگرتن واجبە لەسەر موسڵمانان لەوکەسەی کە دەیەوێت جیاوازی بخاتە نێو ریزی بوادارانەوەو توشی چەند گوتاریان بکات،

---

[1] مسلم فی صحیحه ح ١٨٥٢.

[2] مسلم فی صحیحه ح ١٨٥٣.

[3] مسلم فی صحیحه ح ١٨٤٤.

کۆمەڵیان پەرتەوازە بکات، پاشان دەستەواژەی (اضربوا- اقتلوا) جەختکردنەوەن لەسەر ئەوەی کە گەل خاوەن بریارەو هەڵبژاردن و رادانی مافی ئەوە، ئەویش بەرپرسیارە لەپاراستن و هێشتنەوەی بەشێوەیەکی سیستماتیکی جێنشینایەتی و پێشەوایەتی، لەبەرئەوە ئیسلام گەلی راسپاردوە بەو ئەرکە، کاتێك هاتوە دەفەرموێت: (فإن جاء آخر ينازعه) بەلگەیە لەسەر ئەوەی کەپێشەوایەتی بە ناکۆکی و جەنگ و خۆشەپاندن نادرێت، وەك لەپەیمانی عەقەبەدا فەرمووی: (وأن لاننازع الامر أهله) ئەوەی کە ناکۆکی جەنگی خستەوە لەپێناویدا ئەوە شایستە بەکوشتنە و بیکوژن، بەوپێیە کە مافی گەلی پێشێلکردوە، تەهدیدی کیانی گەلی کردوە، بەوەی کە ناکۆکی و جەنگی بەرامبەر پێشەواکەی و هەڵبژێراوەکەی خۆی کەبەرەزامەندی خۆی دیاریکردوە بۆ ئەو شوێنە هەڵگیرساندوە، لەکاتێکدا کەگەل رێو شوێنی راوێژی لەبەردەمە بۆ دیاریکردنی پێشەوا نەك بەزۆرەملێ.

هەروەها فەرمودەی پێغەمبەر (فاقتلوه) واتە (اضربوه) هەروەها بەرگری لێبکەن، وەك لە ریوایەتی دوەمدا خراوەتە ڕوو، لێرەدا کوشتنەکە مەبەستی لێدانییە تی، وەك لەم فەرمویەدا هاتوە (اذا قاتل أحدكم أخاه قليجتنب وجه).(1) واتە ئەگەر لێتاندا واتە لەبراکەتان دا با لەدەمو چاوی نەدەن لەبەر رێزی مرۆڤ..

---

1 مسلم ح رقم ٢٦١٢.

## مافی گەل لە ڕا پەڕین دژی پێشەواكان:

لە ئوم ئەلسەلەمەوە (ر.خ) لە مەرفوعی هاتو::(ڕۆژانێك دێت دەسەلاتدارنێك فەرمانڕەواییتان دەكەن، هەتانە دەزانێت كە ئەوەی پێی هەڵدەستێت هەڵەیە، هەتانە ئینكاری دەكات لەوەی كەئەوەی ئەنجامی دەدەن تاوان و هەڵەبێت، ئەوەی زانی پێشەوا هەڵەكارەو خۆی بەدوورگرت لەوەی هاوشێوەی بكات و هەوڵی گۆرینی دا، ئەوە بێگوناهەو تاوانی لەسەر نییە، خۆئەوەش كەمزانەو وادەزانێت كە پاشا هەڵەی نەكردوە، ئەوە ئەویش پارێزراوە لە تاوانەكەی ئەو. بەلام ئەوەی زانی فەرمانداری هەڵەدەكات و شوێنی دەكەوێت ئەوە تاوانبارەو سزای خۆی دەبێت، فەرموویان ئەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) دەست نەدەینە شمشێر بۆیان فەرمووی: نەخێر مادام هێشتا نوێژدەكەن.

لەریوایەتێكی تردا كە سەنەدی صەحیحترە هاتوە: كە كاروبارتان لەلایەن كۆمەڵێك فەرماندارەوە بەرێوەدەچێت كە هەتانە دەزانێت كە ئەوەی پێی هەڵدەستێت هەڵەیە، هەشتانە ئینكاری دەكات لەوەی كەئەوەی ئەنجامی دەدەن تاوان و هەڵەبێـت، ئەوەی زانی پێشەوا هەڵەكارەو رقی لێهات لەكردەكەی و لەوەی هاوشێوەی بكات و هەوڵی گۆرینی دا، ئەوە بەریەو بێگوناهەو تاوانی لەسەر نییە، خۆئەوەش كەمزانەو وادەزانێت كە پاشا هەڵەی نەكردوە ئەوە ئەویش پارێزراوە لە تاوانەكەی ئەو. بەلام ئەوەی زانی فەرمانداری بەهەڵەدەكات و شوێنی كەوت ئەوە تاوانیارەو سزای خۆی دەبێت، فەرموویان ئەی پێغەمبەری

خوا (صلّ الله عليه وسلّم) ئێمە نەجەنگێین لەگەڵیاندا؟ فەرمووی: نەخێر مادام هێشتا نوێژدەکەن.[1]

لەم فەرمودەیەدا ئەوەی بەرچاوخستوە کە بەدواکەوتنی دەسەڵات لەوکاتەی خەریکە لادەدات کارێکی رێگەپێدراوە، بەڵام حەرامکراوە کە رازی بیت بەولادانە ئەگەر زانیت ئەولادانە ستەم و یان زیادەرەوی و لادان بوو لەراستی بوو، لێرەدا دەستگرتن بە ویستێکی بەرزو چاکەوەو هەولّی رێگریکردنی بدرێت، دان نەنرێت بەو کارەیەدا بەوەی کە راستەو بەڵکو بەهەڵە بزانرێت و بریاری خوای لەوبارەوە بۆ رۆشنتر بکرێتەوە، هەرچی لەتوانادا هەبو بۆگۆرینی هەولّی بۆ بدرێت، وەك ئەبی سەعیدی خودری لە صەحیحی موسلّیمدا بە مەرفوعی دەیهێنێت کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (ئەوەی کە لادانێکی لەراستی بینی با هەولّی گۆڕینی بدات بەدەستی، ئەگەر نەیتوانی بەزمانی ئەگەر نەیتوانی بەدڵ پێی ناخۆش بێت) دیارە ئەبوسەعید ئەمە دەکاتە بیانو بەڵگەیەك بەدەستیەوە کاتێك کەسێك هەستاو بەرامبەر خەلیفەی ئەمەوی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان قسەی کردو بە لادەر لەراستی وەصفی کرد، ئەبو سەعید وتی ئەم پیاوە تەنها ئەوەی لەسەری بوو جێبەجێیکرد، چونکە من لەپێغەمبەری خواوە ئەمەم بیستوەو ئەم فەرمودەیەی گێرایەوە.[2]. هەروەها لەو فەرمودەیەدا بریارێکی بنچینەیی بوونی هەیە وەك بنەمایەکی گوتاری سیاسی پێغەمبەرایەتی

---

[1] مسلم فی صحیحه ح رقم ١٨٥٤.

[2] مسلم فی صحیحه ح رقم ٤٩.

ئەویش بەرامبەر بوونەوەی دەسەڵاتداران و پاشاکان تەنها مافی گەلە ئەگەر بەبەکارهێنانی هێزیش بێت.

دەستەواژەی (نەجەنگێین لەگەڵیان؟) و دەستەواژەی (نەخێر مادام نوێژ دەکەن)، بەڵگەن لەسەر رەوایەتی مافی گەل لەبەرامبەر دەسەڵاتداران و بەرگیری گرتن لێیان لەکاتی لەراستی دەرچوونیان تابگاتە جەنگ وراپەرین لەدژیان لەهەندێ بارودۆخدا، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) رێگری لەکوشتن گرتوە مەگەر لە بارودۆخێکی زۆر سەختدا نەبێت، و لەکاتی پێویستدا نەبێت، خۆ ئەگەر راپەرین بە یەکجاری حەرام بوایە ئەوا پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) موڵەتی ئەوەی نەدەدا بەجەنگان لەگەڵی لەکاتی وازهێنانی لەنوێژ، ئەم فەرمودەیە و هاوشێوەکانی بنەمایەکن بۆ رەوایی دان بە گەل لەچاودێری و لێپرسینەوەی تەنانەت راستکردنەوەیان ئەگەر بەجەنگیش بێت دەسەڵاتدارو پێشەواکانی هەیە. ئیمامی نەوەوی لەراڤەی ئەم فەرمودەیە کە ئیمامی موسلم ریوایەتی کردوە، دەفەرموێت: رەوانییە بۆ گەل راپەرێت لەپێشەواو جێنشینەکان بەتەنها لادانێك و یان ستەمێ، ئەگەر ئەو کردەیان دەری نەپەراندبن لە بنەما سەرەکیەکانی ئیسلام).

لەم فەرمودەیەدا شێوازێکی رەوانبێژی بەرز لەم دەسەتەواژەیەدا هەیە کەدەفەرموێـت: (فمن أنكر فقد سلم)، (ومن كره بريئ) ئەوەی یەکەمی بێزیان دەرکردوەو هیچ شتێکی تووش نابێت و پارێزراودەبێـت لە خراپەو ستەمی دەسەڵاتداران، هەرچی دووەمە بەریەو، (البرء) بەری

بوون ڕوونادات تەنها پاش ئەوە نەبێت کە عیلەتێ و یان نەخۆشیەك ئەگەری دەدرێتە پاڵی و پاشان بریاری بەری بوونی دەدرێت، ئەوەش پاش ئەوەی ئەو ستەمە دەپەرێتە سەری و کاریگەری ئەو ئینکاری نەکردنە وە رق لێبونەوەیەی لەوەی بەلادان زانیویەتی.

هەروەها لەفەرمودەکەی تری هاوشێوەی کە لەئیبن و عەباسەوە بەمەرفوعی هاتوە (سیکون امراء تعرفون و تنکرون، فمن نابذهم نجا، ومن اعتزلهم سلم، ومن خالطهم هلك).[1]

المنابذة: لەزماندا لایەنگیری هەریەك لەو تیمانەیە لەجەنگدا، ئەوەی کە لەوان جیابوویەوە خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگاندن لەگەڵی ئەوە رزگاری بوە، ئەوەی خۆی لیێ کەنارگرتن ئەوە پارێزراو بێزیان دەبێت، ئەوەی تێکەڵاوی کردن و بەشداربوو لەگەڵیان ئەوە بەهیلاکا چووە.

ئەمەش جەخت کردنەوە لەسەر ئەوەی کە گەل مافی راپەرینی دژی پێشەواکانی هەیە لەکاتێکدا لەرێ دەرچوون و لایاندا لەراستی و بەرەو ستەم. لە فەرمودەی ئبن و مەسعود کە صەحیحە هاتوە کەپێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) دەفەرموێـت: (هیچ پێغەمبەرێك خوای گەورە نەیناردوە پێش من ئیلا لەناو ئومەتەکەیدا هاوەڵ و هاورێی نموونەیی هەن، دەست دەگرن بەسونەتەکەیەوە، لەسەر رێو رچەی ئەو دەرۆن، پاشان لەدوای ئەوانیش کۆمەڵێك جێگەیان دەگرنەوە- لەهەندێ ریوایەتدا جێگرەوەی لە دەسەلاتداران- گوتەی حەق دەڵێن و ئەنجامی

---

[1] صحيح الجامع للالباني ح ٣٦٦١.

نادەن، ئەوەی فەرمانی پێنەکراوە ئەنجامی دەدەن،ئەوەی جیهادی بەرامبەر کردن بەدەستی ئەوە بروادارە، ئەوەی بەزمانی بەرەنگاریان بوەوە ئەوەش بروادارە، ئەوەش بەرەنگاریان بوەوە بە دڵی ئەوەش بروادارە، لەدوای ئەوە هیچ بروایەك بوونی نییە بە ئەندازەی تۆوی خەرتەلەیەك.)[1]. ئەمە ئاماژەیەکە بۆ رەوایی دان لەبەرەنگاربوونەوەی دەست و کە باڵاترینی پلەی بروادارییە.

پاشان بەرچاوخستنێکی تری تێدایە لەبارەی ئەوسوننەتە پیرۆزەی کە پێویستە شوێنهەڵگری بین و رێنمونیکەربێت ئەویش سونەتی پێغەمبەرە لەبارەی پێشەوایەتی و جێنیشینایەتی و کاروباری گەل و ئومەتەوە. لەبەرئەوە ئەم سونەتەپیرۆزە هەواڵی پێداوین کە پێشەواو دەسەڵاتدارانی لەرێدەرچوو ئەوانەن کەلە سوننەت و رێنموونەیە پێغەمبەرایەتیەکان لایانداوە، لاش دەدەن، ئاشکرایە کە دەسەڵاتداران تیایاندا هەیە بەدڵنیاییەوە کەوتوەتە ناو ستەم و کاری چەساندنەوەوە.

---

[1] مسلم فی صحیحه خ ٥٠ واللفظ له.واحمد في المسند١، ٤٦٢

## بنەمای شەشەم لە بنەماکانی گوتاری سیاسی پێغەمبەرایەتی

## پاراستنی سامانی دارایی وئابووی و دابەشکردنی بەیەکسانی

دیارە وەك چۆن گوتاری سیاسی قورئانی و پێغەمبەرایەتی بۆ چارەسەرکردنی پرسی دەسەڵات هاتوە، لە چۆنییەتی هەڵبژاردنی و سنووری گوێرایەڵی و بەهەمان شێوەش بۆ چارەسەری پرسی سامان و دارایی هاتوە، بە پرەنسیپی دابەشکردنەکەی و رێگریکردن لەبەردەم چینێکی سەرمایەداری بەسەریدا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت(كي لايكون دولة بين الاغنياء منكم)[1]، بابەتی ماڵو سامان لەدەوڵەت و لەکۆمەڵگەدا بەیەکێك لەو سێ پرسە سەرەکیانە دەزانرێت ئەوانیش (دین – دەسەڵات ـ دارایی) کە هەموو فەلسەفە دانراوەکانی زەمین و سیستمە سیاسیەکان لەهەوڵی بەرەنگاربوونەوەیان و دانانی چارەسەربوون بۆی، کە بتوانن چارەسەری کۆمەڵی گریمان و گومان و تێکئالاّن بکات، چونکە لەخۆیدا هەڵگرو هۆکاری ململانێی سەرەکی نێوان مرۆڤەکان، هۆکاری سەرهەڵدانی شەڕی نێوان گەل و دەوڵەتەکانە، بەڵکو تەنانەت لەنێوان تاقم و دەستەکانی یەك کۆمەڵگە، مێژووی گەلان و نەتەوەکان و رووداوە گەورەکان هەموویان دەورو خولی یەکێك یان زیاتری ئەم سێ پرسەوەن.

هەروەها وەك چۆن لەگوتاری سیاسی قورئانی فرەیی ئاینی بە پرەنسیپی (لا اكراه في الدين) چەسپاوەو بریاری لەسەردراوە، بۆ ئەوەی

---

[1] الحشر ٧.

چارەسەری توندوتیژی ئاینی و جەنگە ئاینییەکان بکات، ئەو ستەمەی بەناوی ئاینەوە پیاوانی ئاینی و کەسە خاوەن بیروباوەڕەکان بەرامبەر ئەوانەی کە لە ئاین و بیروباوەڕو بیرکردنەوەی ئەوان نین ئەیکەن ئەنجامی دەدەن، جا ئیتر ئەو ئاینە ئاینی ئاسمانی بێت یان ئاینێکی دانراوی مرۆیی بێت.

هەروەها وەك چۆن ئەو گوتارە بە بنەمای راوێژەوە هاتوە، بۆ ئەوەی دەسەڵات و دەوڵەت نەبێتە داردەستی تاقمێك و بنەماڵەیەك یان پارتێکی دیاریکراو، بەڵکو بوار بکرێـتەوە لەبەردەم فرەیی و پلورالیزم، و ئاڵوگۆری ئاشتیانەی دەسەڵات، وەك لەقورئانی پیرۆزدا هاتوە، (وامرهم شوری بینهم) تاوەکو ئاڵوگۆری دەسەڵات لەنێوان دانەکانی گەل بە پێی ۆەزامەندی گشتی ئەنجام بدرێـت، بەبێئەوەی لایەك زاڵبێت بەسەر لایەکی تردا، بەبێ خۆسەپاندن وداگیرکردنی ماڤ گەل لەلایەن کەسێك یان تاقمێکەوە، پاشان وەك رێگریەکیش لەبەردەم درووستبوونی دەسەڵاتێکی ملهوڕو خۆسەپێنەری دکتاتۆر کە کۆمەڵگەو پنتەکانی دەسەڵات تێکرا کۆنترۆڵ بکات.

بەهەمانشێوەش ئەوگوتارە بریاری لەسەر پرسی سامان ودارایی داوە پرانسیپی (کي لایکون دولة بین الاغنیاء منکم) دیاریکردوە، بۆ ئەوەی ئاڵو وێری ماڵو سامان و بەشینەوەی لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا ببێت، رێگیری بکرێت لە پیاوانی سەرمایەدارو خاوەن سەرمایە کەدەست بەسەر سەروەت و سامانی گشتی کۆمەڵگەدا بگرن و ئابووریەکەی کۆنترۆڵبکەن لەبەرژەوەندی تەنها خۆیاندا.

بەمەش گوتاری قورئانی و پێغەمبەرایەتی، (پیاوانی دەسەڵات و پیاوانی ئاینی و کەسانی سەرمایەدار) زیادەڕەوویەکانیان سەرکوت دەکات و دەیوەستێنێت، کەئەمانە لەخراپترینی شێوازەکانی زیادەرەوی و ستەمکاری و قۆرخکاری دەخەنەوە، کە مەترسی تەواویان لەسەرژیان و ئاسایش و پاشەرۆژی کۆمەڵگەکان هەیە، قورئانی پیرۆز فیرعەون بۆزیادەرەوی و لەسنووردەرچونو ستەم لەدەسەڵاتدا و هامان لەبواری ئاینی و قاروون لەبواری دارایی دەهێنێتەوە بەنموونە کەخراپترینی شێوازی سنورلادانیان لەوسێ بوارەدا ئەنجامداوە.

ئەگەر سەرنج بدەین، هەمو ئەحکامە شەریعەتیەکان لە بواری دارایی و ئابووریدا هاتوون، وەك زەکات و بابەتی میرات و خەراج و سەرانەو مامەڵەی دارایی و بازرگانی و کە باس لە حەرامی و حەراڵی و ئەحکامەکانی بەوردی کراوەو بە ئامانجی ئەو هاتوون، کە ئەویش پارێزگاری ماڵ و سامان و گەشەپێدان و وەبەرهێنانی و دابەشینەوەی بەسەر تاکەکانی کۆمەڵدا بە پێی پێداویستیەکانیان و بەپێی ئیستحقاقی خۆیان بە دادگەری و یەکسانی، هەروەها بەرگیری لەخواردنی ماڵوسامانی خەڵکی بەستەم و دەستبەسەراگرتن. دیارە ئەرکی دەسەڵاتیش بریتیە لەکارکردن بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە، ئەوەش بنەمایەکی بنچینەیی شەرعیە، و چەند ڕێسایەکی کارلەسەرکراوە کەخۆی لەمانە دەبینێتەوە:

**ڕێسای یەکەم: لە سەر پێشەوایانی گەلە پاراستن و دەستنەدان لە ماڵو موڵکی گەل تەنها لەکاتی پێویست و بەئامانجەوە نەبێت و بە پێی پێویستی نەبێت.**

نە دەسەڵات نە پێشەوا مافی بەسەر ماڵ و موڵکی گەلەوە نییە، نە زەوی، نەسەروەت وسامان، تەنانەت لە بەیتولماڵیش، تەنها بەپێی پێویستی نەبێت، بەئەندازەی ئەوەی کەکاری بۆکردوەو. پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) جەختی لەسەر ئەم بنەمایە کردوەتەوە، دەفەرموێت: (هیچم پێنەداون و هیچیشتان لێناسێنم و رێگریشتان لێ ناکەم، بەڵکو تەنیا من دابەشکارێکم وەك ئەوەی فەرمانم پێکراوە) لە ریوایەتێکی تردا (من تەنها دابەشکارو بەگەنجینەکەرم، خودا خۆی بەخشەرو پێدەری ماڵو سامانە)[1]. لەفەرمودەیەکی تردا (من وەك دابەشکارێك هاتووم تەنها کارم بەشینەوەی ماڵ و سەروەت و سامانە بەسەرتاندا)[2]. بۆ خودی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) ماف نەدراوە کە دەستوەرداتە ماڵ و سامانی خەڵکان تەنها ئەوە نەبێت کە خوای پەروەردگار لە قورئانەکەی کۆمەڵێك رێوشوێن واجباتی دیاریکردوە، ئەویش بەپێی ئەوە کاری بەشینەوەی سەروەت و سامان لەنێو باوەڕداراندا ئەنجام دەدات و رێنموونی باوەرداران دەکات لەوبارەوە. خوای پەروەردگار خۆی بەخشەری ماڵ و سامانە و هەرکەس بەپێی مافی خۆی پێی دەبەخشێت، ئەوە بڕیار لەسەر مافەکان دەدات و دیاریان

---

[1] صحیح البخاری ح رقم (٣١١٧)، و مسلم ح(١٠٣٧).

[2] صحیح البخاری ح ٣١١٤، ومسلم ح ٢١٣٣، وانظر فتح الباری ٢١٨/٦.

دەکات، ئیتر لە بابەتی زەکات بێت و یان میرات یان باج و خەراج و سەرانەو غەنیمەت و هەرشتێکی تر کە بگەڕێتەوە بۆ سەرخەزێنەی دەوڵەت (بەیتولمال) لە زەوی و کانزاکانی و بەروبوم و دانەوێڵەو بەرهەمی میوەو بازرگانی و دەستکەوتەکانی و ئاژەڵ و بەروبوم و بەرهەمەکانی.

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) جارێکیان –نەویەوە تاڵێك مووی لەپشتی وشترەکەی کردەوە خستیە ناو پەنجەکانییە وە– فەرموی:– ئەی خەڵکینە! لەمماڵە بە قەد ئەم تاڵە مووە بۆ من نابێت و نییە – ئاماژەی بەتاڵە موەکەی نێو پەنجەکانی کرد– تەنها پێنج یەك نەبێت– پێنج یەکیش دەبێتە پاشەکەوت بۆتان)[1]. دیارە پێنجیەکیش لە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە: (واعلموا أنما غنمتم من شيئ فان لله خمسه و للرسول ولذي القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل.)[2]

جارێکیان پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) سەبارەت بە غەنیمەت کرد: فەرمووی: (پێنج یەکی بۆ خوای گەورەیە، ئەو چواربەشەکەیشی بۆ سوپایە) کابرا وتی: کەسێك لەپێشترە لەوی تر؟ فەرمووی: نەخێر تەنانەت ئەو تیرەی بەلاقەدتەوەیە، تۆ لەپێشتر نیت لە برا موسڵمانەکەت کەبەزیادە بدرێتە تۆ)[3]. بۆیە ماڵ و سامان هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ گەل بە بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەی، ماف بۆکەس نییە تەنها ئەوە نەبێت کە خوای گەورە واجبی کردوە.

---

[1] رواه ابو داود ح رقم (٢٦٩٤)، ومالك فى الموطا ٤٥٨/٢.

[2] الانفال٤١.

[3] رواه البيهقى فى السنن واورده ابن كثير في تفسير هذه الاية.وقال اسناده صحيح.

**ڕێسای دووەم: بەرپرسیارێتی دەسەڵات لە چاودێریکردنی تاکەکان لە دەوڵەتەکەیدا:**

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بەرپرسیارێتی دەسەڵاتی لە چاودێریکردنی تاکەکان لە دەوڵەت دیاریکردەوەو بیمە و پێداویستیەکانیانی بۆ دەستەبەر دەکات و دەفەرموێت: (ئەوەی ماڵێکی بەجێهێشت لەپاش خۆی ئەوە بۆ میراتگرەکانی دەبێت، ئەوەی پاش خۆی مافێکی پێنەدرابوەوەو بەجێی هێشت و یان ماڵو مناڵو خێزانی بەجێهێشت ئەوە بۆمن دەگەرێتەوەو لەسەرمنە چارەسەری بکەم.)[1]

ئەگەر مرۆڤێك مرد پاش خۆی ماڵ و سامانێکی بەجێهێشت ئەوە بۆ میراتگرەکان دەبێت، بە پشك و بەپێی نزیك و دوری و ئەوەی کە لە قورئانی پیرۆزدا دیاریکراوە، ئەگەر کەسێك ماڵ و مناڵی بەجێهێشت، ئەوە لەسەر دەسەڵاتە کە هەڵگری خەرجی و تێچوونی پێداویستیەکانی ژیانی ئەو ماڵو مناڵە بێت و لەئەستۆی بگرێت.و بیمەو پێداویستی و ژیانیان بۆ مسۆگەر بکات، تا ئەوکاتەی کەدەتوانن خۆیان ژیان بۆخۆیان مسۆگەر بکەن.

**ڕێسای سێیەم:** بەرپرسیارێتی دەوڵەت لە کارمەند و فەرمانبەرەکانی و ئەنجامدانی لێپرسینەوە لەگەڵیان. پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بۆ کارمەندو فەرمانبەرانی دەوڵەتەکەی ئەوەی پێداویستی بۆژیان بۆی دابین کردبوون، بۆ ئەوەی ئەوەی خراوەتە سەرشانیان لە

---

[1] البخاری٨/٥١٧. رقم ٤٧٨ ورواه مسلم ٢/٥٩٢

ئەرك بەباشی و وەك پێویستە جێبەجێی بکەن، لەخزمەتی گەل و هاولاتیاندا بن، کاتێك پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ئەو کارەی دەکرد لەبەر بەرژەوەندی گەل و کۆمەڵگەدا بوایە (ئەرکی هاوسەرگیری دەگرتە ئەستۆ بۆ ئەو کەسەی کە رەبەن بوو، ئەرکی پەیداکردنی شوێنگەی حەسانەوەو خانووی دەگرتە ئەستۆی بۆ ئەوەی کە خانووی نەبوو، ئەرکی دابینکردنی ولاغی سواری دەخستە سەرشان بۆ ئەوەی کە ولاغی سواری نەیبوو)[1]، لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: (ئەوەی کارێکی لە ئەستۆگرت و ماڵی نەبوو ماڵی بدەنێ، ئەگەر هاوسەری نەبوو بۆی پەیدابکەن، ئەگەر بەردەستی نەبوو پێویستی بوو بۆی ئامادەکەن، ئەگەر سواری نەبوو با ولاغێکی سواری بۆ پەیدا بکەن، ئەوەی زیاتر لەوەی بۆخۆی پەیداکرد لەو کارەیدا یان دەوڵەمەند بوە یان دزی کردوە.[2]

ئەو مافەشی خستوەتە سەر بەیتولماڵ و گەنجینەی دەوڵەت کە بەو کارەو بەرژەوەندیەی گەل هەستێت.

هەروەها وەك لەفەرمودەدا هاتوە پێغەمبەری خوا لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەو کاربەدەست کارمەندو فەرمانبەرانە دەکرد لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکەکەیاندا وەك لەفەرمودەدا هاتوە: (پێغەمبەری

---

[1] ابو داود فی السنن ح ٢٩٤٥

[2] احمد فی المسند٤/٢٢٩ باسناد حسن.

خوا(صلّ الله عليه وسلّم) پیاوێکی کردبوە سەرپەرشتیاری بەخشینەکانی بەنی سولەیم کاتێك هات لێپرسینەوەی لەگەڵ کرد)[1].

هەروەها فەرمویەتی: (ئەوەی خستمانە سەرکارێك و ئەرکێکمان خستەسەرشانی، ئێمە رۆزیەکمان بۆ بڕیەوە، ئەگەرلەوە زیاتر ببات لەوەی بۆی دیاریکراوە، ئەوە ناپاکی ئەنجامداوە.)[2].

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) حەرامیکردوە لەفەرمانبەرانی دەوڵەت و کارمەندانی کەبەهیچ شێوەیەك (بەخشش- هدیە) وەرنەگرن لەکات و سەروبەندی کارەکەیاندا و پێویستیکردوە لەسەریان کەرەتی بکەنەوە یان بیگێرنەوە بۆ بەیتولماڵو گەنجینەی دەوڵەت، وەك لەفەرمودەدا هاتوە: (پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) کەسێکی کردە فەرمانبەر کە ئەرکی کۆکردنەوەی (صدقة- خێروبەخشین) کاتێك هات و وتی ئەوە بۆ ئێوەیە، ئەوەش بەخششەو بەخۆمیان داوە، پێغەمبەری خوا هەستایەوەو دەستی کرد بەوتارو فەرمووی: ئەوە بۆ فەرمانبەرێك نییە ئەوە بکات و وەریبگرێت، لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: (کاتیَ من کەسانێك دەکەمە فەرمانبەر بۆ بەرێوەبردنی کاروبارێك کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووم بەوە- کەچی دێتەوەو دەڵێت: ئەوە هی ئێوەیەو ئەوەش بۆخۆمە هەدیەیان کردووم؟ مەگەر ئەوە بە بەخشش دەمدەیتی؟ مەگەر ئەو کەسە لەماڵی باویك یان دایکی دابنیشتایە ئەو بەخششەیان بۆ دەهێنا؟ سوێند بەوەی

[1] عبد الرزاق فى المصنف٤/٥٤ وابن خزيمة في صحيحه ج ٢٣٤٠

[2] ابو داود ح ٢٩٤٣ باسناد صحيح.

که گیانی موحەمەدی بەدەستە، هیچ شتێك بۆی ناهێنن و وەریناگرێت – لە ریوایەتێکی تردا: هیچکامتان شتیٔ وەرناگرێت بە غەیری مافی خۆی کەپێشتر دیاریکراوە– ئیلا لە رۆژی دواییدا دەیبەسنە ملی دەیهێنن بۆ بەردەم پەروەردگار، خوایەگیان ئەوە من گەیاندم خوایەگیان تۆ شاهیدبە).[1]

ئەو دەستەواژەیەی پێغەمبەری خوا: (کاتیٔ من بە رەزامەندی خوا بومەتە پێشەواو کەسانێك دەکەمە فەرمانبەر بۆ بەرێوەبردنی کاروبارێك) ئەوە ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ سروشتی ئەرکە سیاسیەکەی، کە ئەو فەرماندارەو پێشەوایی گەلێك دەکات، فەرمانداری فەرماندەکانی دەکات، و کارمەندەکانی کۆکەرەوەی باج و خەراج دەستنیشاندەکات، حوکمی خەڵکان بەدادگەری و یەکسانی دەکات و بێجیاوازی، ئەوە ئەو ئیسلامەیە کە ئەوی ناردوە پێی و دەیگەیەنێت بەهەموو مرۆڤایەتی.

ڕێسای چوارەم: پاراستنی زەوی ودەرفەتدان بەزیندو راگرتنی وچاککردنی و وەبەرهێنانی:

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بڕیاریداوە کە هیچ شتێك قۆرخ ناکرێت و قەدەغە ناکرێت لەزەوی تەنها بۆ خواو پێغەمبەرەکەی نەبێت واتە تەنها بۆ بەرژەوەندی گەل و کۆمەڵگە نەبێت، لێرەوە قۆرخکردنی زەوی و تەلبەندکردنی زەویەك تەنها بۆخۆ، بیجگە بەرژەوەندی گشتی، ئەوەشی لەدەسەڵات قەدەغەکردوە تەنها بۆ بەرژەوەندی گشتی نەبێت،

---

[1] صحیح البخاری ح٧١٧٤و٧١٩٧،ومسلم ح١٨٣٢.

بۆ پێشەواش نییە سودە لەپێگەکەی وەربگرێت و تەنانەت یەك بست زەوی داگیربکات و قۆرخی بکات بۆخۆی، هەروەها بۆی نییە هیچ شتێك لەسەرزەوی بەناوی قۆرخکردن بۆخۆی و تایبەت بەخۆی داگیر بکات، وەك لە فەرمودەدا هاتوە (لا حمی الا لله ولرسوله)[1].

بەیهەقی لەمبارەوە دەڵێت: ئەوە بەڵگەیەکی ڕوونە کە بێجگە لە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بۆ کەس نییە هیچ شتێکی ئەم زەویە قۆرخبکات بۆخۆی، هەروەها بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کە ئەو دەستەواژەیەی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم): (لاحمی الا لله)، مەبەست لێی ئەوەیە هیچ قۆرخکاریەك ڕەوانییە مەگەر ئەو شێوازە نەبێت کەپێغەمبەری خوا بۆ بەرژەوەندی گەل وموسڵمانان بەکاری بردوە.)[2]

وەك پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بریاری داوە کە (ئەوەی زەویەکی داکەوتەو مردوو، زیندوو دەکاتەوە ئەوە بۆخۆیەتی، نەك کەسێك لە زەوی کەسێکی تر کشتوکاڵی تیابکات بێ ڕەزامەندی خاوەنەکەی)[3].

لە فەرمودەکەی عورەوەی کوڕی زوبەیر دەڵێت: (شایەتیدەدەم کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بریاری جێبەجێکردنی ئەمانەی دا: زەوی زەوی خوایە، بەندەکانیش (مرۆڤەکان) بەندەی خوان، ئەوەی

---

[1] صحیح البخاری ح٢٣٧٠.

[2] البیهقی فی السنن الکبری– ط عطا–١٤٧/٦.

[3] ابو داود ح٣٠٧٣–٣٠٧٧ من طرق کثیرة صحیحة.

شوێنێکی چۆڵەوانی (زەویەکی داکەوتە) ئاوەدان بکاتەوە ئەوە مافی بەخاوەنبوونی زیاتر بۆ ئەوە، هەروەها عورووە دەڵێت: ئەوەمان لە پێغەمبەرەوە پێگەیشت لەوانەی کە درودیان بۆئەو دەنارد[1].

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بریاری داوە کە زەوی هی گەلە، ئەوەی زەویەکی مردوو زیندوبکاتەوە ئەوە بۆ کەس نییە داوای خاوەندارێتی بکات بیجگە لەوەی کەزیندووی کردوەتەوە، هەروەها ماف بەکەس نەدراوە زەوی کەسێکی تر بکات بەکشتوکاڵ یان بەکاری بهێنێت بیّ رەزامەندی خاوەنی و ئەوە ستەمە، بەڵکو پێویستە ئەو زەویە داگیرکراوە بگەرێنرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، و ستەم و داگیرکاریەکە پووچەڵ بکرێتەوە.

هەروەها هەرچیەك لە ئەحکامی شەرعی هاتوە لە بواری پەرستش و مامەڵەی دارایی لە فیقهدا وەك زەکات، کرین و فرۆشتن، پرۆژەو کۆمپانیا، کرێدان و ئەوشتانەی کرین و فرۆشتنیان سنوردار دەکرێت، ئیفلاس، پێدان و بەخشین و میرات و وەسیەت و باج و خەراج و بووجەو هەرچی تر لەم وبارەدا هەیە، هەموویان لە دەورو خولی چواربنەمای سەرەکیدان کە ئەمانەن:

---

[1] ابو داود ح ٣٠٧٦باسناد صحیح علی شرط الشیخین الی عروةبن الزبیر.

## یەکەم: پێویستی پاراستنی ماڵ و دارایی

دیارە دارایی کۆڵەکەی ژیانی کۆمەڵگە مرۆییەکانە، وەك خولی گەورە دەفەرموێت: (ولا تؤتوا السفهاء أموالكم التي جعل الله لكم قياما وارزقوهم فيها واكسوهم)[1]. خوای پەروەردگار ماڵ ودارایی بۆ گەل گێڕاوە بەوەی کە کۆڵەکەی ژیاندانییە تی و بژێوی و ژیانی لەسەر ئەو وەستاوە، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: (وانفقوا مما جعلكم مستخلفين فيه)[2]، وەك ئەوەی ئەوان جێنشین بن لەسەرزەوی، و هاوبەش بن لەدەسەڵاتداریەتیدا، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: (وعدالله الذين آمنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الارض) هەربەوشێوەیەش جێنشینن و گێراون بە سەرپەرشتیاری ماڵ و هاوبەش تیایدا، دیارە شەریعەت بۆ رۆشنکردنەوەی ئەو ئەحکامانەی لەبارەی ئەوەی دەگوزەرێت سەبارەت بەسەرپەرشتیاری و بریکاریکردن لەدەسەڵات و ساماندا، لەبەرئەوەیە کە (حجر– دەستگرتنەوە لە خەرجی) دەخرێتە سەر ئەو کەسانەی کە نازانن ماڵ و سامانیان خەرجبکەن و مامەڵەی تەندروستی پێوەبکەن، لەوێوە بە بێ ئەوەی ئەو ئیتر مامەڵە بتوانێت بەو سامان و داراییەوەیەوە بکات، لەهەمانکاتدا باج و زەکاتی لێوەردەگیرێت لە ماڵەکەی، تاوەکو یان دەگەرێتەوە دۆخی پێگەیشتووی عەقڵانی خۆی یان منداڵە یان شێتی کاتیە دەگەرێتەوە دۆخی روشدو ئاسایی خۆی و دەتوانێت

---

[1] النساء ٥.

[2] الحديد٧.

بەشێوەیەکی باش ئیدارەی بکات، لەبەرمەترسی بابەتی سامان و دارایی، بەوپێییەی ماڵو سامان حەقی ڕووت و قووتی ئەو نییە، بەڵکو مافی کەسانی تریشی بەسەرەوەیەو پشکی دیاریکراوی لەسەر ئەوماڵە وەك زەکات و هاوشێوەکانی، پاشان مافی گشتی کۆمەڵگە لەناو ئەو سامانەدا هەیە.

بۆیە خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی هەردەم بابەتی زیادەرەوی و بەفیڕۆدانی ماڵ و سامانیان بەحەرام ناساندوە، هەچ بەخەرجدانێکی بێسوودی ماڵ و سامانیان حەرامکردوە لەسەر بڕواداران، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وکلوا واشربوا ولاتسرفوا)[1]، هەروەها لەفەرمودەدا هاتوە(خوای گەورە نەهی کردوە لێتان لەوەی کە پرسیاری زۆرو بەفیڕۆدانی ماڵ)[2]. چونکە ماڵ و سامان لە بنچینەدا ماڵی خودایە، ئەوماڵەش بۆ هەموانی درووستکردوە گێراویەتی بۆ گەل بەحوکمی ئەوەی بۆگشتە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (أموالکم التي جعل الله لکم قیاما)، بەڵکو تاکەکان کاتێ خاوەندارێتی ئەو ماڵە مولکداریەکی وابەستەیە بەوەی کەبەشێوەیەکی چاك مامەڵەی لەگەڵ ئەو ماڵەدابکەن، و ئەو مافەی لەسەری هەیە بەشێوەیەکی تەندرووست بۆخاوەنە پشکدارەکانی بەپێی ئایەتی قورئانی پیرۆز هاتوە بۆزەکات بیدات کە دەفەرموێت: (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ

[1] الاعراف٣١.

[2] البخاری فی صحیحه ح ٧٢٩٢.

فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ)،(١) هەروەها لە فەرمودەدا هاتووە: خوای پەروەردگار رازی نابێت بە بریاری هیچ پێغەمبەرێك یان غەیری ئەو لە بابەتی صەدەقاتدا تاوەکو ئەو حوکمەی تیادا نەدرێت و کە بۆ هەشت بەش دابەشکراوە، ئەگەر تۆ لەو بەشانە بوویت ئەوە مافی خۆتت داوەتی)(٢).

## دووەم: بەشینەوەی ماڵ و دارایی و دابەشکردنی بەشێوەیەکی دادگەرانە:

وەك ئەوەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (كي لايكون دولة بين الاغنياء منكم) لەبەر ئەوە واجب کراوە مافی پێدانی خەراج و باج و سەرانە بە هەژاران و نەداران و هەتیوو رێبوار، ئەوەی کە بەهێزەکان پەیدایدەکەن لەوە دەدرێت بە بێهێزەکان، وەك چۆن واجب کراوە زەکات لەو ماڵ و کەسابەتەی کە دەوڵەمەنەکان پەیدایان کردوە بدرێت بە چینە نەدارو خاوەن پێویستیەکان، بەوپێیەی ماڵ وسامانی بازرگان و سەرمایەدارەکان بەوە بوونەتە خاوەنی کە ئاڵ و وێر و کڕین و فرۆشتنیان کردوە کە لەسەر خەڵەتاندن وەستاوە، لەسەر هەلقۆستنەوەی باش، خۆ ئەگەر کڕیاری نەبێت و لەکاتی فرۆشتنەوەی، پێویستی کریارو رەزامەندی ئەو نەبێت بەوخستنەسەریەی سەرشمەکە کەبەناوی قازانجەوە وەریدەگرێت و دەیبات بۆخۆی ئەوان چۆن

---

[1] التوبة ٦٠.

[2] ابوداود ح١٦٣٠ باسناد مقبول.

دەوڵەمەند دەبوون و دەبونە بازرگان، بۆیە بۆئەو هەشت دەستە هەژارو خاوەن پێویستیانە بە ماڵ و پارە بەشیان لێدەسەنرێت لەو ماڵە، تاوەکو خولی سورانەوەی پارەو سامان نەوەستێت و هەمووی لە شوێنێکدا خڕبێتەوە، هەمووی لای چینێك یان توێژێك کەڵەکە بێت، ئەو کات زیان بەماڵەکە بکەوێت و هەروەها هەژارو نەداران زیانمەند بن، لێرەوە چینە هەژارەکانی کۆمەڵگە بەجۆرێ لەجۆرەکان دەبنەوە بەشداری توێژە باڵادەست و بەهێزەکان لەوەی لەباج و خەراج و دەستکەوت دەستیان دەکەوێت، هەروەها بەشداری دەوڵەمەندو سەرمایەدارەکان دەبن لەوەی کەدەستیان دەکەوێت لەو بازرگانی و کشتوکاڵ و ئاژەڵداریەی کە ئەنجامی دەدەن، لەبەر ئەوە لە فەرمودەدا هاتوە (هیچ بەش و پشکێکی ئەوانی تیانییە ـ واتە لە زەکاتدا ـ دەوڵەمەندو بەهێزەکان) لە ڕێوایەتێکی تردا (خاوەن عەقڵ و داهێنەرە تەندروستەکان)[1]. لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە (ئێوە سەردەکەون و دەبنە خاوەنی ڕۆزی بە خۆی بێهێز و تواناکانتانەوە)[2].

ئەگەر لە شەڕو جەنگەکان بەهێزەکان بچنە پێشەوەو شەڕەکان ببەنەوە دیارە بەپشتیوانی ئەوانەی بێهێز بوون لە پشتیانەوە بوون، ئەگەر بەهاندانێك یان پارانەوە نزایەك بێت، بۆیە بەشداری لە غەنیمەت و ئەو خەراج و باجانە دەکەن کە بەدەستی دەهێنن، هەروەها دەوڵەمەندەکان ڕۆزی و ماڵ و سامانیان دەستدەکەوێت بەوەی کە

---

[1] ابو داود ح ١٦٣٣ و١٦٣٤

[2] البخاری ح ٢٨٩٦.

هەلی باش لەبەردەم ئەواندا دەهێڵنەوە بۆ ئەوەی ئەوان زیاتر هەلە ئابووریەکان بقۆزنەوە بۆخۆیان، هەروەها ئەمانیش دەبنە ساغکەرەوەی ماڵ و سامان و بەردەستێکی باشی ئەوان بۆ کاروبارەکانیان، لەبەر ئەوە دەتوانن بەشداری بکەن.

## سێیەم: پاراستنی ماڵ و سامان لە دەستدرێژیەکان.

دیارە زۆرینەی ئەو ئەحکامە داراییانەی لە شەریعەت دا هەن لە سەر ئەم بنەمایە هاتوون، بۆ بەدیهێنانی ئەمە وەك ئامانجێکی باڵا، لەبەر ئەوەیە کە بۆنموونە حەرامکراوە دەست بۆ ماڵی هەتیو ببرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (ولا تقربوا مال اليتيم الا بالتي هي أحسن حتى يبلغ اشدة)[1]، هەروەها دەفەرموێت: (ان الذين ياكلون أموال اليتامى إنما ياكلون في بطونهم نار وسيصلون سعيرا)[2]، هەروەها دەفەرموێـت: (وآتو اليتامى أموالهم ولا تتبدلوا الخبيث بالطيب ولا تاكلوا اموالهم الى أموالكم إنه كان حوبا كبيرا)[3]، هەروەها دەفەرموێـت: (وَابْتَلُوا الْيَتَامَىٰ حَتَّىٰ إِذَا بَلَغُوا النِّكَاحَ فَإِنْ آنَسْتُمْ مِنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ ۖ وَلَا تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَنْ يَكْبَرُوا ۚ وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ

[1] الانعام ١٥٢،والاسراء ٣٤.

[2] النساء١٠.

[3] النساء٢.

وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ ۚ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْأَمْوَالَهُمْ فَأَشْهِدُوا عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا)[١].

هەروەها حەرامیکردوە دەستدرێژیکردن بۆ سەرماڵی ئافرەت وەك لەقورئاندا سەبارەت بەمارەیی و پێدراوە بەخششیەکانی دەفەرموێت: (وآتوا النساء صدقاتهن نحلة فان طبن لكم عن شيء منه نفسا فكلوه هنيئا)[٢]. هەروەها دەفەرموێت: (لايحل لكم أن ترثوا النساء كرها ولاتعضلوا هن لتضهبوا ببعض ما آتيتمواهن)[٣]، هەروەها دەفەرموێت: (وآتيتم إحداهم قنطارا فلا تأخذوا منه شيئا أتأخذونه بهتانا واثما مبينا)[٤]، هەروەها دەفەرموێت: (وآتوهن أجورهن فريضة)[٥]، (وآتوهن أجورهن بالمعروف)[٦].

قورئانی پیرۆز جەخت لەسەر پاراستنی ماڵ و سامانی هەتیوو ژنان دەکاتەوە بەوپێیەی توێژێکی بێهیزترن لە چاو توێژەکانی تر لە کۆمەڵگەدا، لەبەرئەوەیە پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) پێش کۆچیدوایی وەسیەتی دەکرد کەپشتیوانی بیٚ هێزەکان بن لەوانە ئافرەت، وەك لەفەرمودەدا هاتوە (خوايی من، من زۆر سەردەخەمە

---

[1] النساء٦.

[2] النساء٤.

[3] النساء١٩.

[4] النساء٢٠.

[5] النساء٢٤.

[6] النساء٢٥.

سەری خەڵکی، بەتەواوی زۆر جەخت لەسەر مافی ئەو دووتوێژە بێهێزە دەکەمەوە ئەوانیش ئافرەت و هەتیون)[1].

هەروەها دەستدرێژی لەسەر ماڵ و سامانی گشتی حەرامکراوە، وەك چۆن حەرامکراوە خواردنی بە بێ ئەوەی ڕوویەکی حەقیقەت هەبێت بۆ روخسەت پێدانی، خوای گەورە لەوبارەوە دەفەرموێت: (ولا تاكلوا أموالكم بينكم بالباطل وتدلوا بها الى الحكام لتأكلوا فريقا من أموال الناس بالاثم وأنتم تعلمون)[2].

هەروەها دەفەرموێتت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ ۚ وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا)[3].

خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەستدرێژی کردنە سەر ماڵ و سامانی بردۆتە پاڵ تاوانی کوشتنەوە ئەو کوشتنەی کە بەبێ حەق و خوای پەروەردگار بتوندی حەرامی کردوە، پاشان سزای ئەوانەی کە ماڵ و سەروەت و سامانی خەڵکی دەخۆن بە بێ هیچ مافێك، لەگەڵ ناوانی بکوژانی مرۆڤە بێتاوانەکان لەیەك بۆتەدا کۆکردوەتەوە کە هەمان سزایە، هەموو ئەوانەش واتای حەرامکردنی تەواوەتی دەدەن، کە بەدژایەتیەکی شاروارە کە لە فێڵ و بەرتیل و یان بەکرین و فرشتنی

---

[1] رواه احمد٢/٤٣٩.

[2] البقرة١٨٨.

[3] النساء٢٩-٣٠.

سودگەرانە یان پەیوەستنامە وەك پەیوەستنامەی قومارو و ئەو چەشنانە.

هەروەها هەموو جۆرە دەستدرێژەیەکی بۆسەر ماڵ وسامانی خەڵکی و گشتی رەتکردۆتەوە بەتایبەت بەناوی دین و بەناوی دەسەلاتداری ئاینی مەعنەویەوە، وەك لە قورئاندا هاتوە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيرًا مِنَ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ * يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنْفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنْتُمْ تَكْنِزُونَ)[1].

ئیبنو کەسیر لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (ئەوانە ویستویانە بەناوی دینەوە دونیا بخۆن، بەوپلەو پێگە ئاینی و کۆمەلایەتیەیان لەناو خەڵکدا هەیانبوە، دەستیان کردوە بە خواردنی ماڵی خەڵکی و ماڵی گشتی، نموونەش پیاوەئاینییە کانی جوولەکە لەناو خەڵکی نەفامیدا پێگەوپایەیەکی ریزلێگیراویان هەبوو، لەمەشەوە بەخشش و باج و سەوقاتیان بۆ دەبردن، تاکاتی هاتنی پێغەمبەریش ئەمە هەربەردەوام بوو، بۆیە دژایەتی ئاینیان دەکرد لەبەرئەوەی بەناو ئەو ئاینەیانەوە پێگەو پارەو ماڵ و جایان دەسکەوتبوو، حەزیان بەبەردەوامی و لەدەستنەدانی ئەو پێگەو دەسەلاتەیان هەبوو.

---

[1] التوبة

## چوارەم: پێویستی وەبەرهێنانی ماڵ و دارایی و گەشە پێدانی

دەقی قورئانی و فەرمووده لەم بارەوە زۆر هاتوو، بە ئەحكامی شەرعی و رۆشنەوە، كە ئامانج لێیان بەجێهێنانی ئەم بنەما دارایی و ئابووریەیە. لەوانە:

١- واجب كردنی زەكات لەماڵ و سامانێكی پەرسەندوودا: وەك زەكاتی زێڕو زیو پارە، و زەكاتی ئاژەڵ و بەروبووم و كشتوكاڵ و كەلوپەلی بازرگانی و زەكاتی كانزاو گەنجینە، هەروەها باج دەخرێتە سەر هەموو ئەو ماڵ و داراییەی كە توانای پەرپێدان و قازانجلێكردنی هەیە، خوای گەورە بۆ هەریەكەیان ئەندازەو رێژەیەكی دیاریكردوە لەزەكات بە پێی سودو پەرەسەندنی، بۆ زەكات لە پارەو بازرگانی چارەكێك لەسەد كەدەكاتە دوونیو لەسەد، بۆزەكاتی بەروبوم كشتوكاڵی لەسەدا پێنجی بۆ دیاریكراوە واتە نیوەی دەیەك، لەوەی كە لەلایەن مرۆڤەوە ئاودێری دەكرێت و سەرپەرشتی ئاودانی دەكرێت، دەیەكیش بۆ ئەوەی كە خۆرسكەو یان بە ئاوی باران ئاودەدرێت. هەروەها لە ئاژەڵ و چوارپێكاندا بە پێی تێچوون و جۆری زیادبوونی ئەندازەكەی دیاریكراوە. ئەمە هەمووی بۆ جوڵەو خولی گەرانەوەی سامان و داراییە، تاوەكو ماڵو سامان تەنها لای دەوڵەمەندەكان خڕنەبێتەوە، پاشان دووبارە بەگەرخستنەوەی جوڵەی پارەو دارایی و وەبەرهێنانی بە پێی پێویست.

٢- خوای گەورەو پێغەمبەرەكەی فەرمانیانكردوە بە كێڵانی زەوی دووبارە كیلان و زیندووكردنەوەیو ئامادەكردنەوەی بۆ كشتوكاڵ تیاكردنی. پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: (هەر موسڵمانێك نەمامێك

دەروێنێت، یاخود بەروبومێ دەچێنێتت، کە پەلەوەرێك یان مرۆڤێك یان ئاژەڵێك لێی بخوات ئیلا لای خوای پەروەردگار چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت وپاداشتی دەدرێتەوە.[1]. هەروەها دەفەرموێت: (ئەگەر رۆژی دووایی هەڵساو کەسێکتان چڵە نەمامێکی بەدەستەوە بوو بیروێنێت، با بیروێنی)[2].

٣- فەرمانکراوە کە ئەگەر کەسێك زەویەکی هەبوو پێویستە بیکات بەکشتوکاڵ، یان بیدات بەکەسێك کەبیکات بەکشتوکاڵ، بەباهیری نەیهێلێتەوە[(٣)].

٤- بریاردراوە لە سەرموسڵمان کە هەستێت بەزیندوکرنەوەی زەوی: (ئەوەی زەویەك ئاوەدان دەکاتەوە کەهی کەس نییە و مەتروکەیە ئەو ماف بەوە کە پێبدرێت)[(٤)]. ئەوەی زەویەکی داکەوتەی زیندوبکاتەوە ئەوە هی خۆیەتی.

٥- حەرامکردنی کانی وسەرچاوە ئاویەکان بەدیوارو قەدەعەکردنیان لەخەڵکی: پێغەمبەری خوا دەفەرموێتت: نەکەن رێگری بکەن لە ئاو و سەرچاوە ئاویانە پریبەکەوە یان بەربەستی بکەن نەکاتە لەوەرگاکان)، یان لە ریوایەتێکی تردا: نەکەن سەرچاوە ئاویەکان بفرۆشن واتە کانی و کارێزەکان و روبارەکان تاوەکو لەوەرگاکانیش بەهۆیەوە بفرۆشرێن.٥.

---

[1] صحیح البخاری ح٢٣٢٠،ومسلم ح١٥٥٣.

[2] رواه احمد٣/١٨٤.

[3] صحیح البخاری ح٢٣٣٥.

[4] صحیحاالبخاری ح ٢٣٥٤،ومسلم ح ١٥٦٦.

٦- هاندان له سەر پرۆژەو پرۆژەی هاوبەش و لەبازرگانی کارو مامەڵەدا: وەك له فەرمودەدا هاتوه: خوای گەورە دەفەرموێت من سێیەمی ئەو دوو کەسەم کە هاوبەشی دەکەن بۆ پرۆژەیەکی ئابووری، مادام یەکێکیان ناپاکی بەرامبەر ئەوی ترناکات بەرامبەر هاوڕێکەی)[1].

٧- بەکرێدانی زەوی بۆ کشتوکاڵ به باش نەزانراوە بەرامبەر بەکرێیەکی دیاری کراو، بەڵکو هەردەم زەوی به زارعی رێگەی پێدراوە، وەك ئیبن و قەییم دەفەرموێت: (کشتوکاڵکردن بەزارعی واته هاوبەشی له داهاتدا و لەسەر داهات رێککەوتن گونجاوترو شەرعی ترە، به بەراورد بەکرێدانی زەوی و قۆنتەراتی ساڵانە، چونکە ئەوەیان زیاتر داگەری تیایە، چونکه خاوەنی زەویەکەو ئەوەش زارعی کردوە هەردوکیان وەك یەك له سودو قازانجدا بەشدار دەبن و لەبەرومدا وەك یەك سودمەند یان زیان مەند دەبن، دەگونجێت خاوەن ماڵ بەقۆنتەرات زەویەك بدات بەگشتیارێك کەچی ئەو ساڵە هیچ بەرهەمی نەبێت)[2].

ئەمانە کۆمەڵێك بنەماو ڕێسای ئابووری و دارایی سەرەکین که لەگوتاری سیاسی قورئانی و پێغەمبەرایەتیدا هاتوون بۆ چارەسەرکردنی بابەتی ماڵ و سامان و دارایی و پاراستنی له کۆمەڵگەدا، هەروەها ئابووریانە مامەڵەکردن لەگەڵیداو بەخەرجنەدانی و بەفیرۆنەدانی، هەروەها لەپێناو چاککردن و گەشەپێدانی و وەبەرهێنانی ئەو ماڵ و داراییەی کەلەکۆمەڵگەدا بوونی هەیە، پاشان حەرامکردنی

---

[1] ابو داود ح ٣٣٨٣.

[2] الطرق الحكمية ٢٣١.

هەردەستدرێژیەك بكرێتە سەرماڵی كەسان و ماڵی گشتی و بەهەرجۆرێك بێت و لەژێر هەربیانوو پاساوێكی دەسەلآت و دەولّەت و پیاوانی ئاین و دەولّەت بێت، یان پاساوێكی سیاسی و یان دادگایی یان یاسایی یان هەر هەواو ئارەزوویەكی تاكەكەسی بێت.

هەروەها دابەشكردنی ماڵ و دارایی و سامان بەشێوەیەكی داگەرانەو رێك و یەكسان ببەشرێتەوە، هەموو كەس بەپێی پێویستی خۆی، هەروەها بەپێی پێویستی گەل بۆی، وەك لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە: (ئەوەی لەخۆی زیاتری پێیە لەولآخی سواری بابیداتە ئەو كەسەی كە ولآخی پیّ نییە بە پیّ رێدەكات، ئەوەشی لەخۆی زیاتری لە خواردن و بۆ خۆی لەخۆی و ولآخەكەی پێیە، بابیدات بەوەی كەپێی نییە) كێرەرەوەی ئەم فەرمودەیە (ئەبوسەعیدی خودری) دەفەرموێت(پێغەمبەری خوا هەرچی پێوترا لە ناوهێنانی جۆرەكانی سامان و دارایی ئاماژەی پێدا وتی، تا واگومانمان برد كەئیتر نابێت هیچ كاممان لە پێداویستی خۆمان زیاترمان بێت)[١].

دیارە چەند ئایەت و فەرمودە لەبارەی دارایی و ئابووریەوە لە قورئان فەرمودەدا هاتوون، بەدرێژی باسی ئەحكامەكانی ئەم بوارە دەكەن، كەوای كردوە كە فەرهەنگی فیقهی ئیسلامی لەم بوارەوە زۆر فراوان و وردو رێك وپێك هاتوە، كەتیایدا مافی تاكەكان بەتەواوی لە ڕووی ماڵو كەرەستە داراییەكانیان لەبەرچاو گیراوە. ئەمەبەدەر لەوەی كە مافی گەل و ئەركی دارایی و كۆمەلآیەتی لەلایەكی دیكەوە بەتەواوی لەبەرچاو گیراوە.

---

[1] صحیح مسلم ح١٧٢٠/٤٥١٧.

## بنەمای شەشەم: پێویستی جیهاد بۆ سەرخستنی راستی و ئازادکردنی مرۆیی

خوای گەورە جیهادی داناوەو فەرزی کردوەتە سەر باوەڕداران لەپێناو ئامانجی گەورەی مرۆیی، هەروەها بۆ کۆمەڵە مەبەستێکی بەرز کە خۆی لەمانە دەبینێتەوە:

مەبەستی یەکەم: بەرپەرچدانەوەی دوژمنان و دەستدرێژی کەران بۆ سەرگیان و زەوی و ناموس:

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلا أَنْ يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ وَلَوْلا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا وَلَيَنْصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الأُمُورِ)[1].

ئەم ئایەتە یەکەم ئایەتی رێگەپێدانە بەموسڵمانان کە لەپێناو خوادا جیهاد و کوشتار بکەن، لەسەروەختی کۆچکردنی پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) بۆ مەدینە، ئەم ئایەتە هۆکارو حیکمەتی رەواییدان بەجیهاد و کوشتار رۆشن دەکاتەوە، ئەویش ئەویش سەپاندنی ئەو ستەم و دوژمنایەتیەی کافرەکان بوو بەرامبەر موسڵمانان نواندیان لە زەوی وشوێنی دانیشتنیان دەریان کردن،- ئەویش لە کوشتنی مرۆڤ

---

[1] الحج٣٩-٤١.

قورسترە– هەروەها ستەمێکە بەناهەق کراوەتە سەریان، بەم ئایەتەش ڕێگەدرا بەموسڵمانان کەوا بەرپەرچی ئەوستەمو زۆرداریەی ئەوان بدەنەوە، ئەوەش ناواخنی دادگەری خودایە، هەرچی حیکمەتی ئەم ئایەتەیە بەرگرییە لە نانەوەی فیتنەو ستەمکاری ئاینی، ڕێگەنەدان و بەرگرتنە لەو چەوساندنەوانەی کەلەستەمکارو خۆسەپێنەرەکان دەکەونەوە.

ئەوەش بەهۆی لەسنورلادان و زیادەرەویکردنی ئەهلی ئاینەکان، ستەمی هەندێکیان بەرامبەر ئەوانی تریان، هەروەها ئەوەی لەوان دەکەوێت و لەکەسانی تر دەکەوێت لە زیان ستەم و چەوساندنەوەو دوژنایەتی بەهۆی ئاین و بیروباوەڕ، خوای گەورە ڕەواییدا بە جەنگردن و بەرەنگاربوونەوەو جیهاد تاوەکو پارێزگاری لە بیروباوەرەکان سەرپاك بێ جیاوازی بکرێت، بەمانا تاوەکو ئاتەشگاکانی مەجوس و کەنیسەکانی فەلەو نوێژگاکانی جولەکە، و مزگەوتەکانی موسڵمانان نەڕۆخێنرێن و نەپوکێنەوە، چونکە دواجار هەموویان ناوی خوای گەورە تیایدا بەرزرادەگیرێت، وەك ئیبن و جەریری جەخت لەسەر ئەم دەکاتەوە لە تەفسیرەکەیدا[1] دەڵێت: خوای پەروەردگار کاتێك پێغەمبەری وەك سۆزو میهرەبانیەك بۆ جیهانیان ناردوە بەتێکڕا، تاوەکو دادگەری و بەزەیی لەنێو مرۆڤەکاندا بەرپا بکات، ئاشتی و ئاسایش و ئارامی بۆ کۆمەڵگە دابین بکات، هیچ زۆرو زۆرداریەك و

[1] الجامع١٨/٦٤٧.

زۆرەملێیەك لەسەر ئاینەكان نەمێنێت و بە زۆرەملێ بیرو باوەر نەسەپێنرێت بەسەر مرۆڤەكاندا، ئیتر ئەو پرسە بخرێتە رۆژی دوایی دادگای خوایی لەسەر ئەو جیاوازیەی هەیانە بریاربدات، هەروەها ئەوەی ئامانجی ئاینە سەركەوتن و جێگیری كۆتایی لەم سەرزەمینە بۆ ئەوانەبێت كەبروادارن و چاكویستیان بۆ كۆمەڵگەو مرۆڤایەتی دەوێت، دەتوانن دادگەری راستەقینە دابمەزرێنن و ستەم و ستەمكاری لەسر چەوساوەكان هەڵگرن، هەرچی زیادەرەوەی تاوانە لەكۆمەڵگەدا بەرەنگاری ببنەوە بەمەبستی نەهێشتنی، ئەمەش هەمووی لەنێو دەقی ئایەتی: (وأمروا بالمعروف ونهوا عن المنكر) هەربۆیە خوای گەورە فەرمویەتی كەدەستبگرنەوە لەجەنگ و كوشتاری ئەوانەی كە دەستدرێژی ناكەن و ستەم ستەمكاری پیشەیان نییە، كە دەفەرموێت: (وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولاتعتدوا ان الله لا يحب المعتدين)[1]، بەڵكو فەرمانی كردوە بەچاكەكردن و چاكویستی لەبۆیان تەنانەت ئەگەر لە ئایندا جیاوازبن و باوەریان بەئاینەكەی ئیوە نەبێت، كە دەفەرموێت: (لا يَنْهاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ، إِنَّما يَنْهاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيارِكُمْ وَظاهَرُوا عَلى إِخْراجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ فَأُولئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)[2]. خوای پەروەردگار نەهی كردوە لە جەنگردن و كوشتار بەرامبەر تاقمی

---

[1] البقرة ١٩٠.

[2] الممتحنة٨-٩.

یەکەم کە ئەوانەن راناپەرن و دژایەتی و جەنگ بەرامبەر موسڵمانان ناکەن و ناچنە دەرەوە بۆ لەماڵەکانیان بۆ جەنگ، هەروەها نابێت دژایەتیان بکرێت و بەزۆر واز لە ئاینەکانیان وبیروباوەرەکانیان بهێنن بەڵکو با لەسەر ئاینی خۆیانی بمێننەوە، بە داگەری و یەك چاو تەماشایان بکرێت و مامەڵەی چاك و گونجاویان لەگەڵ بکرێت چاك بن لەگەڵیان، هەروەها نەهی کراوە کە لایەنگری تاقمی دووەم بدرێت ئەوانەی کەستەمکارن و ئازاری موسڵمانانیان داوەو لەشوێنی خۆیان کردونیانەتە دەرەوەو دەستدرێژیانکردوەتە سەرگیان و ماڵی موسڵمانان و هۆکاری چەوساندنەوەیان بوون، خوای گەورەش فەرمانی بەدادگەری و یەکسانی کردوە، تەنانەت ئەم تاقمی دوەمە کە ستەمکار و چەوسێنەربوون و مۆڵەتی جەنگاندن و بەرەنگاربوونەوەیان دراوە، کەچی حەرامکراوە کە دەستدرێژیان بکرێتە سەرو ستەمیان بەرامبەر بکرێت، بۆیە مەبەست لەم جەنگکردن و بەرەنگاربونەوەیە تەنها بەرپەرچدانەوەی ئەو ستەمو چەوساندنەوەیە و هاڵگرتنی ئەو دوژمنایەتیەو چەسپاندنی راستیە، نەك وەك ئەوان بجوڵێرێنەوەو فەسادو ستەم بڵاوبکرێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت سەبارەت بە شەئنی ستەمکاری: (وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللّهُ لا يُحِبُّ الْفَسَادَ )[1]، لەبەرئەوە کاتێ پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) سوپایەکی رێکبخستایە رێنمایی پێدەدان بە: (بجەنگن

[1] البقرة٢٠٥.

تەنها لەبەر رەزامەندی خوا، زیادەرەوی مەکەن، غەدرو ناپاکی نەنوێن، نەکەن جەستەی کوژراوەکان بشێوێنن، منداڵنەکوژن، پیاوانی ئاینی و نێو پەرستگاکان نزیکیان مەکەون و نەیانکوژن)[1]، لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە: (پیاوی پیر نەکوژن،منالّ و مێردمنالّ و ژن نەکوژن)[2].

## مەبەستی دووەم: جەنگکردن لە پێناو چەوساوەکانی سەرزەوی

خوای گەورە واجبی کردوە لەسەر موسڵمانان سەرخستنی چەوساوەکان، هەلّگرتنی ئەو ستەم و چەوساندنەوەیەی لەسەریانە، جیهادو جەنگاندن لەپێناو بەجێهێنانی ئەم ئامانجەدا رێپێدراوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَما لَكُمْ لا تُقاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجالِ وَالنِّساءِ وَالْوِلْدانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنا أَخْرِجْنا مِنْ هذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُها وَاجْعَلْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا، الَّذِينَ آمَنُوا يُقاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقاتِلُوا أَوْلِياءَ الشَّيْطانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطانِ كانَ ضَعِيفًا)[3].

خوای گەورە جەنگان و جیهادی لەپێناو ئازادکردنی چەوساوەکان و هەلّگرتنی ستەم لەسەریان و رادانی ئازارو چەوساندنەوەیە لەسەریان، بە جیهادو تێکۆشان بۆخوا ناوی هێناوە، وەك چۆن بەدەمەوەچوون ویارمەتی دانیان و پێدانی زەکات بەوان هەربەهەمان شێوە بەرێگەی

---

[1]– صحيح مسلم ج ١٧٣١ واحمد في المسند.

[2] ابوداود ج ٢٦١٤.

[3]سورةالنساء ٧٥-٧٦

خودا ولەپێناو خودادا وەصفی کردوە، کە دەفەرموێت: (والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب أليم)[١].

دیارە لەپێناو خوداو لەرێگەی خودا جەنگکردن و بەرگریکردن لەهەژارو چەوساوەکان دەکرێتەوە، هەروەها بەخشین و یارمەتیدانی فەقیر و هەژاران دیسان هەربەرێگەی خودا ناوی هێناوە، کە دەفەرموێت: (وانفقوا في سبيل الله ولاتلقوا بايديكم الى التهلكة)[٢]. هەندێ لەپێشینانی ئەم ئاینە (سلف) وتویانە مەبەست بەخشین لەپێناو خوادا و رێگەی خوا بەخشینە بە هەژارو نەداران و ئەوانەی پێویستیان پێیە.

مەبەستی سێیەم: جەنگاندن بۆ ئەوەی کە (دین– ملکەچی) هەمووی تەنها بۆ خوای پەروەردگار بێت:

واتە لەپێناو ئەوەی کەملکەچی بۆ ستەمکاران و تاغوتان نەبێت و تەنها خەڵکان گوێرایەڵی خودابن، بۆ ئەوەی یەکسانی و دادپەروەری لەنێو خەڵکاندا بەرقەراربێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت (وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة ويكون الدين كلة لله)[٣]. هەروەها دەفەرموی: (وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة ويكون الدين كلة لله)[٤]، هەروەها دەفەرموێت:(وَأَخْرِجُوهُمْ مِنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ)[٥].

---

[1] سورة التوبة ٣٤.

[2] اسورة البقرة ١٩٥

[3] الانفال ٣٩.

[4] – البقرة ١٩٣

[5] البقرة ١٩١

هەروەها دەفەرموێت: (يَسْأَلونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِنْدَ اللَّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ)[١].

خوای پەروەردگار ئاژەوەگێری و فیتنەو شەرەنگێزی و چەوساندنەوەو پێشێلکاری ئاینی و ئازاردانی مرۆڤ بەهۆی ئاینەکەیەوە، وەك ئەوەی موشریکەکانی مەککە لەدژی بڕواداران ئەنجامیاندەدا،- ئان ئەشکەنجەدانی لەبەرئەوەی بانگەواز بۆ راستی دەکات یان بانگەشە بۆ دادپەروەری و یەکسانی و ئازادی بیرو ئازادی مرۆڤ دەکات وەك ئەوەی لەزیندانەکانی تاغوتان دەگوزەرێت- ئەوە گەورەترو توندترە لە کوشتن، لەبەرئەوە خوای گەورە جیهادی فەرز کرد لەپێناو رێگەکەی تاوەکو دەین- واتە گوێرایەڵی- ملکەچی - هەمووی بۆخوای پەروەردگار بێت، هەروەها وشەی (الله) باڵاو شەکاوەبێت، وشەی (چەوسێنەرو تاغوت و خۆبەزلزانەکان بنیشێتە زەوی، وەك لە فەرمودەی پێغەمبەردا هاتوە: ئەوەی جەنگا بۆ ئەوەی وشەی خوا(الله) بەرزو باڵابێت ئەوە لەپێناو خودایە.)[٢].

مەبەست لە دەستەواژەی (ويكون الدين كله لله) ئەوە نییە کە هەموو مرۆڤەکان دەبێت ببن بە موسڵمان، چونکە ئەگەر ئەوەی مەبەست بوایە ئەوە رێك پێچەوانەی ئایەتی (لا اكراه في الدين) دەبوویەوە، چونکە ئیسلام کاتێك بڕیاری لەسەر فرەیی و پلورالیزم داوە، مەگەر چۆن

---

1- البقرة ٢١٧.

2- صحيح البخاري ج ٢٨١٠ ومسلم ١٩٠٤ .

موڵەتی مان و فرەیی بەئاینەکانی تر نادات کە لە سایەی شەریعەت و دادی ئەودا بمێننەوە، بەڵکو مەبەست لەو ئایەتە ئەوەیە کە وشەی (الله) کە بریاری بەدادگەری و یەکسانی داوە با ئەو حاکم و دادوەر بێت لەنێو مرۆڤەکاندا بە بڕوادارو موشریکەوە، پاشان با ملکەچی و گویرایەڵی چەوساوە ستەمکاریەکان هەڵگیرێ و مرۆڤەکان بۆخۆیان ئازادبن و تەنها بۆ ئەو خوایە ملکەچ بکەن، وەگەرنا با ملکەچی تەنها هەربۆ ئەو بێ، وەگەرنا باهیچ کەسی دی وەك خوا مرۆڤە چەوسێنەرەکان و تاغوتەکان نەبێـت، جا گەر فیرعەنەکان بن یان کیساییەکان بن یان قەیسەریەکان یان دیکتاتۆرەکان بن یان پیاوانی ئاینی هەرئاینێك یان زانای ئاینی و باباو قەدیس و هەرچی دەرباری سوڵتان و سوڵتانەکان بن.

پرسیاریان لە ئیبن و عومەر(ر.خ)کرد سەبارەت بەو(فتنه)یەی کەوتە نێو موسڵمانان، وتیان بۆچی ناجەنگی لەکاتێکدا خودا فەرمویەتی بجەنگن تا فتنه رابدەن؟ کە دەفەرموێت: (وقاتلوا حتی لاتكون فتنه) فەرموی مەگەر ئێوەدەزانن فتنه چیە؟ جاران لە مەککە ئاین و ئایینداری لەژێر هەرەشەدابوو، یان دەبوو بکوژرایە، یان دەیاننارده زیندان، ئێمە جەنگاین تا ئەو فتنەیەمان لەکۆڵ بوویەوە، تاوەکو گوێرایەڵی تەنها بۆخوا بێت هەموو کەس ئاینداری بەئازادی بکات، بەڵام ئێوە دەتانەوێ بجەنگێن تاکو فتنه بەرپابێت و دین و ملکەچی بۆ بێجگە لەخوا و ئەوانی تر بێت؟ لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) جەنگی لەگەڵ موشریکین دەکرد، چونە ناو بازنەی

موشریكینەوە فتنە بوو، بەڵام ئەم جەنگەی ئێوە لەسەر ئەوە نییە،([1]) بەڵكو لەسەر موڵك و پاشایەتیە، لای ئیبنو عومەر جەنگ لەگەڵ مەلیكەكان بۆ دەستگرتن بەسەر موڵكدا لەو جەنگەیە كە فیتنە دەخاتەوە، ئەوكات دین و ملكەچی و گوێرایەڵی بۆ غەیری خوا پەرەدەسەنێت، هەمووی بۆخوا نابێت. لەم گوتەیەی ئیبنو عومەر بەڵگەیەكی رۆشن هەیە لەسەر واتای (دین) لەو ئایەتە پیرۆزەدا، كە بەواتای ملكەچی و گوێرایەڵی دێت، هەروەها هەرجەنگێك لە پێناو پاشاو موڵكایەتیدا بریتیە لەجەنگاندنێك كە دەرەنجامەكەی دین و ملكەچی بۆ پاشاكان دەبێت نەك بۆ خوای گەورە. ئەوانەی دەجەنگن لەگەڵ پاشاكان یان لەپشتیانەوە دەوەستن بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان فراوان بكەن بەسەرگەلەكەیاندا بەزۆرو خۆسەپێنی و بەناچاری، ئەوە جەنگان و پشتگیریكردنە دەچێتە كەستەكی ئەوەی كە دین و گوێرایەڵی لەخزمەتی پاشاكاندا بێت.

ئەوە ئەو هۆكارانە بوون كە لەپێناویدا خوای گەورە جیهادو كۆششی فەرز كردبوو، لەرێگەی ئەودا روخسەتی جەنگی دابوو، كەیان لەبۆ رادانی ستەم و دوژمنایەتی لەسەر بڕواداران، یان لەبۆ هڵگرتنی چەوساندنەوە لەسەر چەوساوەكان و ماف پێشێلكراوەكان، لە پیاو ئافرەت و منالو كەسەبێهێزە بێ دەرامەتەكان، یاخود بۆ ئەوەی گوتە راستی و شەی (اللە) بەرزو یالا بێـت، گوێرایەڵی و ملكەچی راستەقینە

---

[1]- صحيح البخاري ٤٥١٣ و٤٥١٤و ٤٦٥١

تەنها بۆ خوای پەروەردگار بێت، نەوەك گوێرایەڵی و ملكەچی و زەلیلبوون بۆ كەسانی ستەمكارو دیكتاتۆرەكان بێت.

خوای گەورە جیهادی فەرزكرد بۆ كوشتنی مرۆڤەكان نەبوو، بۆ ئازاردان و لەگیان خستنی تاكەكان نەبوو، بەڵكو بۆ بەرپەرچدانەوەی زوڵم و ستەم و پێشێلكاری ماف وئازادیەكان بوو لەلایەن تاغوتەكانەوە، بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێكی دادگەر بۆ چەسپاندن و بەرقەراركردنی ئازادی و یەكسانی بوو، كە ئایەتی: (واعدوا لهم ماستطعتم من قوة ومن رباط الخیل ترهبون به عدوالله وعدوكم)[1]. ئامانج لەخۆئامادەكردن و راهێنان بەجێهێنانی بەرگری لەخۆیە و ترساندنی دوژمنان، تاوەكو دەستدرێژی نەكەنە سەر موسڵمانان، وەك لەفەرمودەدا هاتوە: (ئاوات مەخوازن كە ڕووبەڕووی دوژمنەكانتان ببنەوە بجەنگن لەگەڵیدا، بەڵكو نزای خەیرو دووركەوتنەوە لەبەڵابكەن، خۆ ئەگەر ئەوەش ڕوویدا جەنگان لەگەڵ دوژمندا خۆڕاگربن)[2].

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە جەنگان و كوشتن مەبەستێك نییە لەخۆیدا، بەڵكو ئامانجەكەی لەدەرەوەی خۆیدا ئەویش سەرخستنی چەوساوەكان، بەرگیریە لە دەستدرێژی دەستدرێژكاران، بەرچاوخستنی ئەحكامەكانی دین، كە هاتوە خەڵكان دادگەری لەنێو خۆیاندا بەرپابكەن و بۆ خوا تەنها بەندایەتی بكەن، هیچ كامیان ستەم لەوی دی نەكات، كەسیان كەسیان سەرشۆر نەكات، هیچ كامیان ئەوی دی

---

1- الانفال ٦٠.

2- صحیح البخاري ج ٣٠٢٤ ومسلم ١٧٤١ و١٧٤٢ .

نەكوژێت، جولەكەیەك لەسایەی دادی ئیسلامدا جولەكەییەكەی بپاریزێت، فەلەیەك پارێزگاری لە ئاینەكەی بكات، مەجوسیەك و ئاگرپەرستێك بەئاینەكەی خۆیەوە بمێنێتەوە، صابئەیەك لەسەر رێچكە ئاینییە كەی ئیانداری خۆی بكات، لەرۆژی دواییدا دادوەری ئەمانە تەنها خوابێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێـت: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ وَالنَّصَارَى والذين اشركوا ان الله يقصل بينهم يوم القيامة)[1].

وەك لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلّ الله عليه وسلّم) لەگەلّ قەشەكانی نەجران و پیاوە ئاینییە كانی فەلەو ئەوانەی كە شوێنكەوتەی ئەوان وراهیبەكانیان و دینەكەیان بوو: (ئەوان ئەوەی لەژێردەستیان هەیە لەزۆرو كەم و لە كەنیسەكانیان و شوێنی نزاو نوێژگاكانیان خەلّوەتگاكانیان بۆ خۆیانە، بەلّێن و پەیمانی خواو پێغەمبەرەكەی بۆ ئەوانە، هیچ قەشەیەك لەقەشایەتی خۆی ناخرێـت و ئاینەكەی پیّ ناگۆرێت و نە هیچ راهیبێك لە راهیبی خۆی دەخرێـ، نەهیچ پیاوێكی ئاینی پێگەكەی پیّ دەگۆرن، وەهیچ مافێك لەمافەكانی خۆیان لێزەوت دەكرێت، نەدەسەلاّتیان كەمدەكرێتەوە، نەهیچ شتێك كەلەسەری بوون و رۆیشتوون لە ئامۆژگاری و چاكسازی رێگیریان لێدەكرێت و نەستەمیان لێدەكەین و نەدەهێلّین ستەمیان لێبكرێت)[2].

---

[1] الحج ١٧.

[2] – طبقات ابن اسعد١/٢٦٦.

خوای گەروە دەفەرموێت: (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ)[1].

جیهاد لەگەڵ ئەوەی کە مەینەت و قورسایی دەروونی هەیە، هەروەها هەوڵ و هیمەت و تێکۆشانی تێدایە، کە ئەمەش بەجۆرێك لەجۆرەکان بەسروشتی مرۆیی خۆی لەسەر دڵگران و قورسن، کەچی لەولاوە چاکەو سودی گشتی تیایە، هۆکاری پێویستی بۆ ژیانی کۆمەڵگای مرۆیی تێدایە، کە هیچ سەردەمێك خاڵی نابێت لە دەسەڵاتداری ستەمکارو بەخراپترین شێوە ستەم چەوساندنەوە دەکەنە قورگی گەلەکەیانەوە، و بڕواداران دەچەوسێننەوە، تووشی نەهامەتیان دەکەن و تۆمەت و بوختانیان بۆ دادەتاشن بۆ ئەوەی بیانوو بۆ ستەمکاریەکانیان بهێڵنەوە ستەمیان بەردەوام بێـت، دیارە تێکۆشان تا ڕۆژی دوایی بەردەوامی هەیە، بۆ ئەوەی بەرگیری لەوستەمە بکات، و ئەو پرۆژەو نەخشە ز ئامانجە نامرۆڤانەی ستەمکاران هەیە پووچەڵیان بکەنەوە، لەبەرئەوە لەفەرمودەدا هاتوە: (ئەوەی نەجەنگابێت و لای خۆشیەوە خۆی ئامادەنەکردبێت بۆ جەنگان لە پێناو خوادا ئەوە مردنێکی نەفامیانەی دەبێت، لە ریوایەتێکی تردا (مردنەکەی لەسەر ڕێرەوو لقێکی دووروەکان دەبێت). بۆ ئەوەی هەردەم بڕواداران ئامادەباشیان تێدابێت بۆ بەرنگاربوونەوەی ستەمکارو دیکتاتۆرەکان.[2]

---

[1] البقرة ٢١٦.

[2]– صحيح مسلم ج ١٩١٠.

لەمەوە ڕۆشن دەبێتەوە کە خوای گەورە فەرمانی بە بڕواداران کردوە کە بجەنگێن بەرامبەر کیسراو قەیسەر، دەفەرموێت: (يا أيها الذين آمنوا قاتلوا الذين يلونكم من الكفار وليجدوا فيكم غلظة واعلموا أن الله مع المتقين).[1]

دەستەواژەی (الذين يلونكم) واتای تایبەتێتی تیایە، هەروەها هاندان لەسەر جیهاد بەرامبەر ئەو دوو دەوڵەتە بەتایبەتی، ئەوە ئەو دۆخەی کە کیسراکانی فارس و قەیسەرەکانی رۆم لەقوستەنتەنییە و شام تێیدابوون، لە ستەم و چەوساندنەوە ئازارو ئەشکەنجەدانی ئەوانەی لەژێردەستیاندا بوون، و ئازارو مەینەتی هێنان بەسەر ئەو گەلانەی لەژێر رکێفی دەسەڵاتی ئەواندابوون، بۆیە رزگارکردنی ئەو گەلانەی لەژێردەسەڵاتی ئەواندا بوون ئامانجی سەرەکی موسڵمانان بوو، وەك لە چیرۆکی رەبعی کوڕی عامر کەلەگەڵ رۆستەمدا هەیەتی رۆشن دەردەکەوێت، کاتێك لێی پرسی بۆ چی هاتون و بۆ ئێوە ڕووتان کردوەتە ئەم ناوچەیەی ئێمە؟ئەویش وتی: (خوای گەورە ئێمەی ناردوە کە بەندەکان لە بەندایەتی بەندەوە دەربهێنێن و بیانکەینە بەندەی خوای تاکو تەنها و بەندایەتی تەنها بۆ ئەوبکەن، لەستەم و پێشێلکاری ئاینەکانەوە بۆ دادگەری ئیسلام) لەبەر ئەوە بەرەنگاربوونەوەی نێوان موسڵمانان و هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی فارسی و ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەگەورەترین و توندوتیژترین جۆری جەنگ و بەرەنگاربوونەوەکان بوون

[1]–التوبة ١٢٣.

لەمێژووی موسڵمانانددا، تەنانەت لە مێژووی جیهاندا، چونکە لەگەڵ حەبەشیەکان و تورکەکان و گەلەکانی تر بەم شێوەیە جەنگەکان توند نەبوون. دیارە پێغەمبەری خوا جۆرێك ئامادەکاری و دەستپێشخەری بۆ ئەو شەرانە کردبوو لەکاتی ژیانیدا، نزای کردبوو لای خوا لە کیسرا کە دەوڵەتەکەی پارچەپارچەبکات، فەرموو بووی بەهاوەڵانی کاتی کۆتایی و ئاوانی ئەوان نزیکە، (ئەگەر کیسرا تیابچێت ئیتر کیسرایەکی تر بەدوایەوە نابێت، ئەگەر قەیسەر تیاچوو ئیتر قەیسەری تر بەدوویدا نایەت، سوێند بەخوا رۆژێك دێت گەنجینەکانیان لەرێگەی خوادا دابەش دەکەن)[1]. وەك ئەوەی ئیتر هیچ کەسێك لەکیسرا و قەیسەر لە ستەم و پێشێلکاری لەوان زیاتر و خراپتر نەبوبێت، ئەگەر ئەو دوانە تیاچوون ئیتر سەردەمی چەساندنەوە و زۆرداری بەدەرکەوتنی ئیسلام کۆتایی دێت، هیچ کەسێکی تر ناتوانێت جێگەی ئەوان بگرێتەوە، دەبینین هەروەهاش بوو، کە کیسرا کۆتایی هات ئیتر شوێنگرەوەیەکی تری نەبوو تا بەئیمرۆ، هەروەها لە سەردەمی لەناوچوونی قەیسەرەوە شوێنگرەوەیەکی ئەویش تا بە ئیمڕۆ نەبوەو لە رووی ستەم و چەوساندنەوەو زۆرداری هەبووبێت، پاشای خوێنمژی وەها هاتبنە ئاراوە.

---

1– البخاري ج ومسلم ج ٢٩١٩.

# بەشی سێیەم:
# بنەماکانی گوتاری سیاسی خەلیەفەکانی راشیدین

ئەگەر گوتاری سیاسی قورئانی گوتارێکی ئاسمانی خودایی بێت، گوتاری پێغەمبەرایەتیش سروشێکی خودایی بە پراکتیکێکی مرۆیی بوبێت، ئەوا گوتاری راشیدین و سونەتی جێنشینانی راشیدین لە بواری پێشەوایەتی و بەرێوەبردنی گەل سیاسەتدا نموونەیەکی مرۆیی رووتە بۆ گوتاری ئیسلامی، پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمانی بەدەستپێوەگرتنی سوننەتی ئەوانی پاش خۆی کردوە، دەفەرموێت: (بەجێم هێشتوون لە سەر ئاینێکی رۆشن و پاك و سپی، ئەوەی لابدات لێی بەهیلاکدا دەچێت، ئەوەی لەئێوە بژی جیاوازی و لێکترازانی زۆر دەبینێت، لەکاتەدا ئێوەو سوننەتی من سوننەتی خولەفای راشیدین کەلەدوای من دێن، دەست بگرن پێوەیانەوە، بەددانەکانی پێشەوەتان ئەو سونەتە بگرن و بەری مەدەن، ئیوەو ئەوشتانەی بەناوی دینەوە

**دەخرێنە ناودین، چونکە هەموو ئەوشتەنوێیانە داهێنراون، هەموداهێنراوێکی دەستکرد سەرباری دین بکرێت، لادان و گومراییە، هەموو گومراییەکیش بەرەو دۆزەخ چوونە.** [(١)]

**فەرمودەیەکی تر بەمەرفوعی هاتوە: (جێنشینایەتی (خەلافەت) دوای من سی ساڵە)[(٢)]، لە ریوایەتێکی تردا، (جێنشینایەتی پێغەمبەر سی ساڵە، پاشان خوای گەورە دەسەڵات دەدات بەوانەی ویستی خۆی لەسەرە). سوفینە کە فەرمودەکەی ریوایەتکردوە دەڵێت: خەلافەتی ئەبوبەکر چوارساڵ و خەلافەتی عومەر دە ساڵ و خەلافەتی عوسمان دوانزە ساڵ و خەلافەتی عەلی شەش ساڵ).** [(٣)]

**پسپۆڕانی ئەم بوارە پێیان وایە کە هەر بەیعەتێك لە شاری مەدینەی پیرۆز ئەنجامدرابێت ئەوە بەخەلافەت هەژمارە، دیار کۆتا بەیعەتیش بەیعەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو، هەندێکیش دەڵێن سی ساڵەکە بە نیو ساڵ خەلافەتەکەی ئیمام حەسەنەوە دەبێتە سی ساڵی تەواو.**

**هەروەها دەستەواژەی (یؤتي الله الملك من یشاء) واتە جێنیشنایەتی و پاشایەتی، چونکە لە عورف و زماندا پێی دەوترێت پاشایەتی، کەلەراستی و شەرعیەوە راستیەکی نییە، وەك لە وتەی مەصعەبی**

---

[1] رواه ابوداو ج رقم (٤٦٠٧) والترمذي ج رقم (٢٦٧٨) وابن ماجة ح رقم (٤٢)وقال الترمذي حديث حسن.

[2] – ابوداو ح ٤٦٤٦، والترمذي ح ٢٢٢٦وحسنه، واحمد في المسند ٢٢٠/٥ وصححه كما في السنة للخلال رقم ٧٢٦.

[3] – ابوداود ح ٤٦٤٦، وقد اخلص الحديث قيه تصحيحا وتصعيفا.

کوڕی سەدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هاتوە کاتێك هات بۆ لای سەعدی باوکی و پێی وت: (ترکت الناس یتنازعون علی الملك بینهم)[1] واتە لەسەر خەلافەت و دەسەلآت، هەروەها ئەم فەرمودەیە ئاماژەیەکی تێدایە کەئەو خەلافەتە (کتوپری بە بیٚ ئەوەی زۆرەملێی تیابێت)، تیایدا لادانێك ڕوودەدات تیایدا لە خەلافەتی پێغەمبەرەوە دەگۆڕێت بۆ خەلافەتێك کە پاشای ستەمکارو بکوژی تیایە، هەروەها لەفەرمودەی صەحیحدا هاتوە کە دوازدە خەلیفە هەبوون کە هەموویان قورەیشی بوون، لەکاتێکدا لەو سی ساڵە تەنها چوار خەلیفە و حەسەن پێنجەمی، بۆیە ئەمە ئاماژەیە کە دەستەواژەی (یؤتي الله الملك من یشاء) واتە خەلافەت، بەلآم خەلافەتی پێغەمبەر نا بەڵکو خلافەی گشتی، کە هاوشێوەی خەلافەی خولەفای راشیدین بوون لە ڕووی پابەندی و بەبنەماکانی سیاسەتەوە، هەروەها گوتاری راشیدینەوە، بۆیە بەراشیدین ناودەبرێن ئەوانیش وەك خەلیفایەتی ئیبن و زوبەیرو عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو.. کەوەك دەسەلآتی پاشاکان کەبەخەلافەی پاشاکان ناودەبرێن چونکە هەمان لاسایی و رەوتی ئەوانیان گرتوە.

لەو فەرمودەیەی ئیبنو مەسعود کە ئیبن حیبان لە ریزی فەرمودە صەحیحەکاندا هێناویەتی هاتوە، دەفەرموێت: (بەرداشی ئیسلام دەورو خولی سی و پێنج یان سی و شەش ن ئەگەر تیاچوو ئەوە رێگەی

---

[1]– رواه مسلم ح ٢٩٦٩.

تیاچوون دەگرنەبەر، ئەگەر لەسەر دینەکەیان مان ئەوە دینەکەیان بۆ حەفتا ساڵ دەمێنن)[1].

لە ریوایەتێکی ئەحمەد و ئەبو داوود دا هاتوە: (سی و پێنج یان سی و شەش یان سی و حەوت)[2]، هەروەها تیایدا هاتوە کە (ئەگەر دینەکەیان دامەزران و بۆیان هەڵگیرا ئەوەبۆ حەفتا ساڵ درێژەی دەبێت).

ئیبنو حیبان دەڵێت: (سی و شەش ساڵ بەتەواو وەردەگیرێت).

لێرەدا دین مەبەستی گوێرایەڵی درووستکردن و دەسەڵات، وەك لە قورئاندا هاتوە لە چیرۆکی یوسف: (ماکان لیأخذ اخاه في دين الملك)[3]. واتە لەدەسەڵاتی پاشاو دەوڵەتەکەی، مەبەستی هەمان واتایە لەو فەرمودەیە.

لەم فەرمودانەدا ئەم خاڵانە دەست نیشان دەکرێن:

یەکەم: رۆشنە کە مەبەست لە خەلافە بریتی نییە لە خەلافەی راشدین و بەپێی پەیڕەوی پێغەمبەر، بەڵکو جێنشینایەتی چوار خەلیفەکانی راشیدینە، کە ماوەکەیان سی ساڵە پاش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر، پێنجەمیان حەسەنی کوڕی عەلیە، هەیانە جینشینایەتیەکەی هاوشێوەی خەلیفەکانی راشیدین نەبوە، بەدەر لەوەی کە تەمو مژ تا حەفتا ساڵی تێداهەیە، وەك لەفەرمودەکەی ئیبن و مەسعود دا هاتوە:

---

1 صحيح ابن حبان ح ٦٥٥٠.

2 رواه ابوداود ح ٤٢٥٤ باسناد صحيح.

3- يوسف /٦٧.

(بەرداشی ئیسلام دەورو خولی سی و پێنج یان سی و شەش ساڵیدایە، ئەگەر تیاچوو ئەوە ڕێگەی تیاچوون دەگرنەبەر، ئەگەر لەسەر دینەکەیان مان ئەوە دینەکەیان بۆ حەفتا ساڵ دەمێنن) ئەوەش لەکاتی هەبوونی ناکۆکی و جیاوازی را لەسەر ئیمامی عەلی (ر.خ) کەچی فیتنەو تەحکیمەکە لە سی و پێنج ساڵیدابوو، یان سی و شەش یان سی و حەوت وەك ئیبن و حیبان هێناویەتی.

پاشان کارەکە بەرەو لاسەنگی ڕۆیشت، و بەردەوام بوو تا حەفتا ساڵ، ئەوەش ماوەی خەلافەتی هاوەڵانی پێغەمبەرە پاش پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) مەبەستی ئەوانە لەو فەرمودەیەدا رووی فەرمودەکە لەوانە، دیارە کۆتا هاوەڵی پێغەمبەر عەبدوڵای کوڕی زوبەیر بوو، بۆیە دوای ئەو دەسەڵاتی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان وەدەرکەوت، وبویە پاشای عێراق و مەصعەبی کوڕی زوبەیری کوشت لە ساڵی حەفتاو یەکی کۆچی، حەجاجی سەقەفی عەبدوڵای کوڕی زوبەیری کوشت لەمەککە ساڵی حەفتاو سیٚ، بە کوشتنی ئەو ئیتر خەلافەت کۆتایی بەتەواوی و گۆرا — ئەوە پاش ئەوەی بە شێوەیەکی بەشەکی بە وازهێنانی حەسەنی کوڕی عەلی لەدەسەڵاتەکەی بۆ مەعاویە ئەمە ڕوویدابوو لە ساڵی ٤١. لەماوەی ٤٢ بۆ حەفتا بە شێوەی تەمو مژاوی مابوویەوە تاوەکو شەهید کردنی کۆتا هاوەڵی پێغەمبەر عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ساڵی ٧٣. لێرەوە خەلافەتی پاشایەتی توندرەو لە عەبدولمەلیکیی کوڕی مەروانەوە دەست پێدەکات، ئەو یەکەم پاشا بوو بەزەبری کوتەك و شمشێر بەیعەتی لەخەڵك سەند و بەپێچەوانەی

مەعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان پاش ئەوەی حەسەنی کوڕی عەلی تەنازولی بۆکرد، و بەیعەتی پێداو ئەهلی عێراق بەیعەتیان بەمەعاویەدا لەسەر بەیعەتەکەی حەسەنی کوڕی عەلی، ئەم شێوە خەلافەتەی ئەم نزیکەیچل ساڵ بەردەوامی هەبوو، پاشان بەیعەت درایە یەزیدی کوڕی جۆرێك تەم و مژاوی ئەوەش و گەل زۆرینەی نارەزایی لەلادرووست بوو، نەتوانرا هەمووی لەسەر یەك وشە کۆببنەوە، بەڵام بەردەوام نەبوو، ناویشی نەچوە ناو خەلیفەکانەوە. پاشان عەبدوڵای کوڕی زوبەیر گەل بەیعەتی پێدا کەبەیعەتێکی رەزامەندی و هەڵبژاردنی تیابوو، هیچ جۆرە زۆرەملێ و سەپاندنی تیانەبوو، ئەو لەمەککە بووو هەموو شارەکانی دەوروبەری مەککەوە هاتن بەیعەتیان پێدا، نزیکەی دە ساڵ ئەو خەلیفەیی خۆی کرد، تا لەکۆتاییدا بەشەهیدی سەری نایەوە بەدەستی حەجاج، بەکوشتنی ئەو ئیتر خەلافەت لەجیلی هاوەڵانەوە چوە ناو جیل و نەوەی شوێنکەوتوانی ئەوان (تابعین).

دووەم: وەك لەم فەرمودانەدا هاتوە، جۆرێك لەخستنەڕووی سیستمی دەسەڵاتداریە لە ئیسلامدا، ئەویش جێنیشنایەتی خولافاکانی راشیدین، وەك ئیبن و حیبان لە صەحیحەکەی خۆیدا هێناویەتی و هەوڵی داوە چارەسەری ڕواڵەتی نێوان دەستەواژە جیاکانی فەرمودەکان بکات وەك لەبارەی ئەو فەرمودەوە: (الخلافة بعدي ثلاثين وسائرهم ملوك): (مانای ئەم هەواڵە ئەوەیە کەپاش سی ساڵ دەکرێت بوترێت بەوان خەلیفە لە ڕووی ناچاریەوە، ئەگەرچی لە راستیشدا پاشاش بن، هەروەها کۆتا دوازدەهەمی خەلیفەکان عومەری کوڕی

عەبدولعەزیز بوو، کاتێك پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) ئاماژەی بە سی ساڵ کردوە، هەروەها کۆتا دوازدەهەمی خەلیفەکان عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بووە، ئەو لە خولەفای راشیدین بوە، ئەوەیە کە لەنێوان ئەو چوارەو دوازدەیەم وتراوە پێیان خەلیفە)[1].

ئیبن و حیبان دەروازەیەکی لە صەحیحەکەیدا جویٚ کردوەتەوە لەژێرناونیشانی: (البیان بان الملوك یطلق علیهم اسم الخلفاء في الضرورة) ئەو فەرمودەیەی تەخریج کردوە کە دەفەرموێت: (سیكون خلفاء یعملون مالا یعلمون، ویفعلون ما لا یؤمرون).[2]

پاشان خۆی لەراستیدا پاشکۆی (وسائرهم ملوك) لەوانە نییە جێگیر بێت و صەحیح بێت، چونکە زۆرینەی ریوایەتەکان ئەو دەستەواژەیان نییە و ئاماژەیان پێنەداوە، دەگونجێت راڤەو تێگەیشتنی یەکێك لەوانە بێت کە ریوایەتی کردوەو ئیبنو حیبان وای زانی بێت هی فەرمودەکەیەو ئەویش هێنابێتی لەمە زیاتر نییە.

هەروەها سەبارەت بە فەرمودەکەی ئیبن و مەسعود دەڵێت: (بەرداشی ئیسلام دەورو خولی سی و پێنج یان سی و شەش ساڵیدایە...): پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) لەگەڵ گەلەکەی هەرگیز لە سەر شتێك نەدواوە کە عەقڵی بۆی نەچووبێت، هەروەها لەسونەتەکەشیدا شتێك نەبوە واتاکەی نەزانرابێت، ئەوەی وابزانێت کە ئەو فەرمودانەی ئەگەر صەحیح بوون پێویستە ریوایەت بکرێن باوەریان

---

[1]– صحیح ابن حبان ٦٥٤٣

[2]صحیح ابن حبان ٦٥٤٤.

پێبهێنرێت به بێ ئەوەی راڤەیەکی عەقڵانی وەربگرن و مانایەکی لۆژیکی بدەن بەدەستەوە، ئەوە ئیتر دەرچوونە لەوپەیامە، ئەلاهومە مەگەر ئەو فەرمودانە لەو هەوالانە بن کە باسی صیفاتەکانی خوای پەروەردگار دەکات کە ئەوانە ناخرێنە ژێر چۆنی و چۆنییەتیەوە راڤەی ئەوتۆ وەرناگرن تەنها باوەرهێنان پێیان بەکۆتا دێت)(١).

هەروەها ئاماژە بەوەدەکات کە لەم فەرمودەدا مەبەستە ئەوەی کەلە فیتنەی کوشتنی عوسمان و جەنگی جەمەل و صەفین راستەوخۆ بڕیاری لەسەر ساڵی سییەم داوە.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل راڤەی ئەو فەرمودەیە دەکات بەوەی کە: سی و پێنج ساڵ پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) نەوەك پاش کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە، هەروەها فەرمانی پێکردون کە خۆراگربن لەسەر حەق و راستی ماوەی سی و پێنج ساڵ دیارە مەعاویە ماوەی پێنج ساڵ خەلیفەیی کردوە کەس ئینکاری لەوە نییە).(٢)

واتە ئەو دەورو خولەی دەسەڵاتی ئیسلام لەسەر ئیستیقامە تا ساڵی چل و پێنجی کۆچی بەردەوام دەبێت، لەوێوە ئیتر لادان دەست بەسەر دۆخەکەدا دەگرێت.

لە هەموو دۆخێکدا کەس لەبارەی ئەوەوە لە سەلەف و لە زانایانی ئومەتی ئیسلامی ناکۆك نییە کە خەلافەی پێغەمبەرایەتی سی ساڵ بوەو

---

[1] صحیح ابن حبان ٦٥٥٠

[2] السنة للخلال رقم ٦٣٩.

ئەو چوار خەلیەفەی یەکەم هاوەڵانی پێغەمبەر بەیعەتیان پێداون لەمەدینەی پیرۆز، ئەوانە نموونە پێشەنگی ئەهلی ئیسلامن پێویستە شوێنکەوتەیی دەستگرتن بە سونەت و کردەکانیانەوە چاولێکردنیانن ئەوانیش ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی، لە گەورە پیاوانی هاوەڵان و ئەهلی ئیسلامن، ماوەی خەلافەتیان سی ساڵ بوە، کەخەلافەتی راشیدین ناسراوەو وتراوە و لەدەقەکاندا ئاماژەی پێدراوە، هەروەها ئەوانە رێچکەی ئەوان دەگرن و لە بواری دەسەڵاتداری و پێشەوایەتیدا، کە هەڵبژاردنیان لە رێگەی رەزامەندی گەل و ۆاوێژەوە بووە، ئەوانە خەلیفەی راشیدینن، بەقیاس لەسەر ئەوان، هەروەها بە دەقی فەرمودەی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) وەك لە فەرمودەدا هاتوە: (پاش ئەوە خەلافەت لەسەر پەیرەوی پێغەمبەرایەتی و پاشان پاشای پێشیلکارو خوێنرێژ دێن و پاشان پاشای ستەمکارو خۆسەپێنەرەکان دێن پاش ئەوە خەلافەت دەگەرێتەوە سەر پەیرەوی پێغەمبەرایەتی).

**دیارە خەلافەتی پاش هەر چوار خەلیفەکان لەجیلی بچوکی هاوەڵان ئەمانە بوون:**

١- حەسەنی کوڕی عەلی: ماوەی خەلافەتە شەش مانگ بوو، ئەهلی لێکۆڵەر لەبارەی خولەفای راشیدین ئەم ماوەیە وەك خولەفای راشیدین هەژماری بۆدەکەن بەوپێییەی لە فەرمودەدا هاتوە(خەلافەتی پێغەمبەرایەتی سی ساڵە) بەم ماوەی خەلیفایەتیەوە دەبێتە سی ساڵ.

٢- مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، حەسەنی کوڕی عەلی ملکەچی دەسەڵاتی ئەو بوو بەیعەتی پێدا لە ساڵی ٤١ کۆچی، پاش ئەوە ئیتر

گەل هەمووی لەسەر بەیعەتەکەی حەسەن ئەوانیش بەیعەتیان پێدا ئەو ساڵە پێی وترا ساڵی کۆمەڵ، کاتێك هەموو موسڵمانان تێکرا کۆبوونەوە لەسەر بەیعەتدان بەیەك کەس پاش سێ ساڵ لەئاژاوەو شەڕی ناوخۆ، سەردەمی مەعاویە بیست ساڵی درێژەی کێشا، لەسەرەتای دەست بەکاربوونی وەك خەلیفەیەك لەسەر شێوازی عومەری کوڕی خەتتاب دەرۆیشت و لەهەمو جوڵەو کردەکانیادا لەو دەچوو، وەك زوهری دەڵێت: (مەعاویە رێچکەی عومەری کوڕی خەتابی گرتبوو چەند ساڵێك لەهیچ شتێك لێی لانەدەدا)[1].

٣- لە کۆتایی تەمەنیدا داوای لەخەڵکی کرد بەیعەت بە یەزیدی کوڕی بەڵام لە هاوەڵان نەبوو (صەحابە) بۆیە تەمو مژو دوکەڵو گێچەڵ دەستی پێکرد، کاتێك لە ساڵی ٦٠کۆچیدا مەعاویە کۆچی دوایی کرد ئیتر مشت ومر لەنێو خەڵکدا درووستبوو ئاژاوە کەوتەوە ناوگەل، کارەکە هێشتا تەواو نەبوو ئەو سەردەمەی ئەو ئاژاوەو فیتنە و جیاوازی پەرەی سەند، یەزید پاش چوار ساڵ کۆچی دوایی کرد واتە ساڵی ٦٤ی کۆچی، پەیمانی خەلافەتی بە باشی بۆ دەسەبەرنەکرا.

٤-پاشان بەیعەت درا بە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، بە رەزامەندی و راوێژ، خەلیفایەتیەکەی بۆ ماوەی نۆ ساڵ بەردەوام بوو واتە تاساڵی ٧٣ کۆچی، ئەو لەسەر رێچکەی خولەفای راشیدین دەرۆیشت تەنانەت هەندێك بە خەلیفەی پێنجەمی راشیدین ناویان دەهێنا.

---

[1] السنة للخلال اثر ٦٨٣باسناد صحيح.

ماوەی هاوەڵانی کەم تەمەن کە بریتی بوون لە حەسەن و مەعاویە و ئیبن و زوبەیر، سی ساڵ، کە ماوەی گشتیان دەبووە شەست ساڵ، لەگەڵ سەردەمی پێغەمبەر دە ساڵ ئەوەش دەبوە حەفتا ساڵ، وەك لە فەرمودەکەی ئیبنو مەسعودا هاتوە، ئەو دەسەڵاتو کارەیان درێژە پێداو بەخۆراگری، بەڵام هەندێك کەمو کورتی لە کۆتاییەکەیدا هەبوو، لێرەدا دەردەکەوێت جیاوازی چیە لەنێوان سەردەمی خولەفای راشیدین کە بۆ ۳۰ ساڵ درێژەی هەبوو، لەگەڵ ئەو ماوەو سەردەمەی کە گوتاری راشیدین پاشەکشەی کردبوو کە بۆ ۷۰ی کۆچی درێژەی کێشاو ماوەیەکی تەمو مژاوی بوو، تێکچوون و پشێوی تیابوو بەتایبەتی سەرەتاو کۆتاییەکانی، دیارە پاش حەفتا ساڵەکە سەردەمی گوتاری خەلیفەی راشیدین بەکۆتا گەیشتوە، کە نوێنەرایەتی گوتاری دابەزێنراوی دەکرد لەگەڵ کۆتا هاوەڵی پێغەمبەر عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، هەروەها پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) هەواڵی دابوو لە فەرمودەی لێکترازاندا باسی ئەوەی کردبوو کەراستەقینە لەوەدایە کە من و هاوەڵانم لەسەری دەرۆین، دیارە لەو کاتەوەی کە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان بە زەبری شمشێر و هێز نەك بەراوێژو رەزامەندی دەسەڵات دەگرێتە دەست ئیتر لەلای ئومەت و گەل ئەو گوتارە بەگوتاری پێغەمبەرایەتیو خولەفای نابینن.

دیارە ئەو خەلافەتە راشیدینەی کە لەسەر پەیرەوی پێغەمبەرایەتی رێکەی گرتوە دابەش دەبێت بوو ماوە ئەوانیش:

## ماوەو سەردەمی یەکەم:

## خەلافەتی هەردو گەورە هاوەڵی پێغەمبەر ئەبوبەکرو عومەر:

کە دەتوانین کۆمەڵێك تایبەتمەندی گرنگ هەن لەوانی تردا نین، ئەویش بە پاڵپشتی هەبوونی کۆمەڵێك فەرمووده سەبارەت ئەم دوو کەڵەپیاوەو شوێنکەوتنیان و دەستگرتن بە سوننەتی ئەوانەوە لەوبوارە، نمونە لەوبوارە فەرمودە هەیە (ئەوەی گویرایەڵی ئەبوبەکرو عومەر بکات رێنونیکراوە)[1] فەرمودەی (من نازانم چەند لەناوتاندا دەمێنمەوە ئێوە شوێنهەڵگری ئەوانەی دوای من بن ئەبوبەکرو عومەر).[2]

هەروەها چەرخ و سەردەمی ئەوان چەرخی کۆکبوون و هاوسۆزی بوو بۆیەکتر، ئەوکات هاوەڵانی گەورە لە مەدینە بوون، هیچ جۆرە جیاوازی و ناکۆکیەك و فیتنەیەك لەنێو موسڵمانانىدا بوونی نەبوو، بۆیە سەردەمی ئەم دوانە نموونەیی و زێڕین بوو، تەنانەت هاوەڵان بەیعەتیان بە عوسمان نەدەدا تا ئەو بەڵێنەیان وەرنەگرت لێی کە دەبێت وەك ئەو دووگەورەیە (ابوبكرو عمر) کارنەکات و رێچکەی ئەوان نەگرێت! بۆیە سوننەتی ئەم دوانەو رێچکەگرتنی کاری ئەو دوانە لە بواری پێشەوایەتیدا بە پێی گوتەو کۆرای زانایانی ئیسلام واجبە، ئەگەر لە سەردەمی ئەو دوانەدا لە بواری پێشەوایەتیدا، سوننەتێك ئەوان بریاریان لەسەر دابێت و لە دوای ئەوان پێچەوانە بوبێتەوە، ئەوا رێچکەگرتن و بەشوێن ئەواندا رۆیشتن لەپێشترە

---

1 رواه مسلم ح٦٨١ واحمد في المسند ٥/٢٩٨.

2 الترمذي ح ٣٦٦٢، وقال حدبث حسن، صحيح ابن حبان ٦٧٨٨ والحاكم وصححه ح ٤٤٥١ و٤٤٥٥.

تا ئەوەی دوای خۆیان، وەك عوبەیدەی سەلمانی فەقیهو زانای سەردەمی ئیمامی عەلی (ر.خ) کە عەلی ویستی لەسەر ئەوەبوو لە بواری دادوەریدا پێچەوانەی ئەوە بکات کە عومەر بریاری لەسەردابوو لە سەردەمی خۆیدا، بەڵام عوبەیدە بەرگیری لێکرد و پێی وت: (رای تۆ لەگەڵ عومەر لەناو کۆمەڵدا، پێمان خۆشترو باشترە لەو رایەی کەهەتە بەتەنها و لە جیابوونەوەتدایە) عەلی فەرمووی: (دادوەری بکەن وەك ئەو شێوازەی پێشتر کردوتانە، من دژی جیاوازی و جیابوونەوەم، بۆ ئەوەی خەڵکی کۆمەڵ بن و یان بمرم وەك ئەوەی هاوەڵانم مردن).[1]

بەمەش پێشینەی تەشریعی ئیجتیهادی لەسەردەمی ئەو دووگەورەیەدا (ئەبوبەکر و عومەر) بەتایبەتی لەبواری پێشەوایەتی سیاسی بەهێزترە و بە بەڵگەبوونی زیاترە لەوانی تر، لەبەرئەوەی ئەو کردەو شێوازی مامەڵەیە بە راوێژ و بریاری کۆمەڵی هاوەڵاندا گوزەری کردوە، پێش ئەوەی فیتنە و جیاوازی واڵا بێت، لەبەر ئەوە هاوەڵان بەمەرجیان گرتبو- وەك لە صەحیحدا هاتوە- لە عوسمان و عەلی پێش ئەوەی بەیعەتی لێوەربگرن بەوەی پابەند بێت بە (رێبازەکەی خوا سوننەتی پێغەمبەری خوا و سوننەتی هەردوو جێنشینەکەی دوای ئەو، ئەوەبوو عەبدورەحمان بەیعەتی بێدان و پاشان کۆچکەران و پشتیوانان و سەرکردەو سەرباز و موسڵمانان).[2] کاتێك ئەوەیان بە مەرج گرت،چونکە سوننەتی ئەوان هەمووی بەراوێژو کۆرای هاوەڵان بوو.

---

[1] البخاري خ ٣٧٠٧ وانظر فتح الباري ٧١/٧.

[2] صحيح البخاري ح ٧٢٠٧.

## سەردەمی دووەم:

## خەلافەتی هەردو زاواکەی پێغەمبەر (عوسمان و عەلی).

دیارە ئەو سەردەمەش هەر سەردەمی خەلافەی راشیدینە، سونەتی ئەم دوانە لە بواری پێشەوایەتیدا بۆ رێنماییەو پێویستە شوێنکەوتەیی، مەگەر ئەو سونەتەی کە پێچەوانەی دوو خەلیفەکەی پێشوە، کە بابەتی تەئویل هاتە ناوەوەو بوویە هۆکاری سەرهەڵدانی فیتنە، وەك ئەوەی عوسمان لە بواری ماڵ و داراییدا، و هەروەها عەلی لەبواری خوێن رژان دا کردیان– وەك لەدەقێکی ئیبن و تەیمیەدا هاتوە– ئەوان سونەتێکیان وەکو خولەفای راشیدین بۆ ئومەت دارشتوە، لە چۆنییە تی بەرەنگاربوونەوەی فیتنەو ئاژاوەوە کەدەکەوێتە نێوان موسڵمانان لە دەوڵەتی ئیسلامی، پێویستە شوێنپێ هەڵگریان بین.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل گوتویەتی: ئەبوبەکرو عومەر عوسمان و عەلی، ئەوانە پێشەوای دادگەری بوون، ئەوەی بەخشیان بەخشینەکەیان رێپێدراو بوو، عەلی پایەیەکی باڵای لە دادگەریدا هەبوە کە دنکە هەنارو تۆووی بەشکردوە نەیهێشتوە کەس زیاتر لەوی وەربگرێت).[1]

---

[1] السنة للخلال اثر ٦٢٦ باسناد صحيح عنه.

## بنەماکانی گوتاری ڕاشیدی و دەرکەوتە سیاسیەکانی:

دەرکەوتەکانی گوتاری راشیدی لە روداوە سەرەکیەکانی مێژووی ئیسلامدا بینران، کە بوونە هۆی لەرووی تیۆریە بچەسپێن و بەشێوەیەك نەتوانرێت نەڤی بکرێن بخرێنە کەنارەوە یان مانای تریان بۆ بدۆزرێتەوە. ئەمانە بۆ خۆیان ئامانجی بالآن لەکاتێك کەرێپێنەدراوە شتی تر قیاس بکرێتە سەریان، وەك لە گوتاری تەئویلکراو رویدا، دیارە ئەو روداوە سەرەکیانەی کە لە گوتاری راشیدی دەرکەوت لەبەرای روداوەکانەوە ئەمانە بوون:

### یەکەم: کۆچی دوایی پێغەمبەری (صلّ الله علیه وسلّم) بیّ ئەوەی کەسێکی دیاریکردبێت بۆ جێنشینی و راسپاردەیەکیش دانابێت:

دیارە سوننەتی خولەفای راشیدین راستەوخۆ لەدوای پێغەمبەرەوە دەستپێدەکات، بنەماکانی گوتاری سیاسی راشیدین سەرهەڵدەدات، هەندێکیش دەڵێن پێش کۆچی دوایی بەتایبەتی لەکاتی نەخۆشکەوتنییە وە کاتیّ نەخۆشیەکەی نیشانیدا کە رووەو چاکبوونەوە ناچێت، بۆیە هەر لەوکاتەوە ویستێك لەناو هاوەڵاندا هەبوو کە ئەو بابەتە حەسم بکرێت واتە (جێنشینایەتی)وتیان: ئەوە هەمەیان بۆ درووست بوو یان ئەو ویستەیان لادرووست بوو کە بنێرن بەشوێن ئەبوبەکر و کورەکەیدا بێن، بەڵێنیان بداتیّ کە ئەوەی ئەمان وتیان ئەویش دووبارەی بکاتەوە، ئەو خواستەی ئەمان هەیانە ئەویش بچێتە

سەرهەمان خواست، پاشان وتیان: خوای گەورە نەیویست ئاوابێت و ئیماندارانی گەراندەوە)[1].

لەریوایەتێکی تردا پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمووی بە عائیشە: (ئەبوبەکری باوکتم بۆ بانگ بکە، لەگەڵ براکەشت، تاوەکو نوسراوێکیان پێ بنووسم، من ترسی ئەوەم هەیە کە ئەوەی خوازیارە لەوە ویستەکەی بێتەدی، و ئەوەی دەیەوێت بڵێت، ئەوە بڵێت: من لە پێشتر بووم کەچی مەگەرخوا و بڕواداران کەسیان نەویست بێجگە لە ئەبووبەکر)[2].

پێغەمبەری خوا فەرمانیدا بە ئەبو بەکر کەنوێژ بۆ خەڵکی بکات، ئەو نوێژی لەبری پێغەمبەر کرد لە ڕۆژانی ئێش و ئازاردا بۆ ماوەی دەشەو، پاشان پێغەمبەر ویستی بێتە ناو خەڵکەوە راسپاردە بکات بۆیان، بەلێنیان لێوەربگرێت و ماڵ ئاواییان لێ بکات، لە ریوایەتێکدا کەلە عائشەوە دەگێرێتەوە کە ئازا زۆری بۆ هێناو تای بەرزبوویەوە فەرمووی: (لەناو (قیرەب– تەشتێ ئەوکاتەی ئاو)ێکدا حەوت جار ئاویی ساردم بەسەردا کەن تاوەکو تاکەم نەمێنێت راسپاردەیەك بدەم بە خەڵکان) پاشان چوە ناو خەڵکان (هاوەڵانەوە) نوێژی بۆکردن، وتارێکی بۆخوێندن[3] تیایدا پێی وتن: (ئەی خەڵکینە! ئاگر گەشبوەتەوە لەکلپەدایە، ئاژاوەو فیتنە وەك شەوی تاریك بەرێوەیە، سوێند بەخوا

---

[1] صحيح البخاري ح ٥٦٦٦ و٧٢١٧.

[2] رواه مسلم في صحيحه ح ٢٣٨٧ و٦١٨٧.

[3] صحيح البخاري ح ٤٤٤٢..

هیچ شتێکتان لەمنەوە وەرنەگرتوە، لەهی خۆمەوە بوبێت، بەڵکو ئەوەی لەمنەوە بەحەڵاڵ بە ئێوە وتراوە ناسێنراوە و کراوە ئەوە لەقورئانەوە بوەو ئەوەی حەرامیشکراوە من نەمکردوە بەڵکو ئەوە قورئان کردویەتی)[1].

ئەوەی بەم کورتیە ریوایەت کراوە لە (ئیبنو ئەبی ئەوفا) وە ئەوەبوە کەپێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) هەموو راسپاردەکەی ئەوە بوو دەستبگرن بە قورئانی پیرۆزەوە[2].

پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) ویستویەتی بیانگەرێنێتەوە ناوخۆیان و بەراوێژ کارەکەیان بکەن، چونکە قورئان بۆ ئەو پرسانە راوێژ و شورای دەستنیشانکردوە، بۆ گەرانەوە بۆ قورئان یانی بۆ راوێژ.

لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە هاتوە: (پێغەمبەری خوا ئازاری نەخۆشیەکەی زۆری بۆهێنا لە رۆژی پێنجشەمە بوو، فەرمووی بەوانەی چواردەوری: (شتێکم بۆم ئامادە بکەن کە بۆتان بنوسم نوسێنێك کە لە دوای من رێی پیّ ون نەکەن) هەندێکیان وتیان پێغەمبەری خوا ئازارو نەخۆشیەکە زۆری بۆهێناوە ئەوە، گەرنا ئەوەتا قورئانی بۆ ئێمە جێهێشتوە بەسمانە، بەڵام مشتومڕێك لەسەر ئەوە درووست بوو وتیان بەگوێی پێغەمبەر بکەن برۆن پەراوێك بهێنن بزانن چی وت بینووسن تاوەکو پاشتر ئێمە پێی لەرێ دەرنەچین، هەشیان بوو بەپێچەوانەوە دەیوت ئەوە نەخۆشیەکە زۆری بۆهێناوە وازبهێنن،

---

[1] ئیبن و اسحاق في المغازي و السيرة كما في مختصر ابن هشام.

[2] صحيح البخاري ح ٤٤٦٠

تا ئەوەبوو بووبە غەڵبە غەڵب لەناویاندا، پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمووی دەهەستن، ئیبن و عەباس دەڵێت: کێشە و مصیبەت بوو ئەوەی داویدەکردو کەبەراوێکی بۆئامادەبکەن بینوسێت و ئەوەی لە بارودۆخی نەخۆشی پێغەمبەردا و دەیانبینی پێیان باش نەبوو، بەهۆی ئەم جیاوازی و دەمەقاڵێیەوە)[1].

لەریوایەتێکی تردا لە ئیبنو عەباسەوە هاتوە کە (ئیمام عومەر فەرمووی: پێغەمبەری خوا ئازارو نەخۆشی شەکەتی کردوە، ئێمەش قورئانمان هەیە و بەسە، بەڵام مشتومڕ لەنێویاندا پەیدا بوو، تا قیڕە قیڕو دەنگ بەرزکردنەوەی تێداهات، پێغەمبەر فەرمووی وازبهێنن، دوورکەونەوە لێم، نامەوێت لەسەرئەمە کێشە بکەوێتە نێوانتانەوە)[2].

دیارە عومەر لەوبارەوە وتی: پێغەمبەری خوا پێشتر هاتە ناومان بەچەند شەوێك و بەدرێژی راسپاردەو رێنموونی کردین کەدەستبگرین بەقورئانی پیرۆزەوە کاری پێبکەین، وەپێی وتن: (وەمن سوێند بەخوا هیچ شتێکتان لەمنەوە وەرنەگرتوە، لەهی خۆمەوە بوبێت، بەڵکوو ئەوەی لەمنەوە بەحەڵاڵ بە ئێوە وتراوە ناسێنراوە و کراوە ئەوە لە قورئانەوە بوەو ئەوەی حەرامیشکراوە من نەمکردوە بەڵکو ئەوە قورئان کردویەتی)[3].

---

[1] صحيح البخاري ح ٤٤٣١,٤٤٣٢.

[2] صحيح البخاري ح ١١٤.

[3] ئیبن و اسحاق في المغازي و السيرة كما في مختصر ابن هشام.

دیاره ئیمام عومەر پێی ناخۆش بوو ئەزیەتی پێغەمبەری خوا لەوکاتی نەخۆشی و ئازاەیدا ئەوەندە تەکلیفی بخەنە سەر کەئەو بەنەخۆشیەوە دەتلایەوە، پاشان عومەر نەیدەزانی کەپێغەمبەر بەو نەخۆشیە کۆچی دوایی دەکات، هەر لەبەرئەوەش بوو کاتێ وەفاتی کرد فەرمووی ئەوەی بلێت پێغەمبەر مردوە دەیکوژم وەك دواتر باسی لێوەدەکەین.

لەریوایەتێکی تردا کە سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبن و عەباسەوە وەك ئەوەی پێشو گێرابوویەوە دەستەواژەی (فتنازعوا فقالوا هجر رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: وازبهێنن ئەوەی کەمنی لەسەرە چاکترە لەوەی ئێوە لەمنی داوا دەکەن، پاشان وەسیەتی بۆ سێ شت کرد، موشریکەکان لە جەزیرەی عەرەبی وەدەرنێن..)(١).

لەو دەستەواژەی کۆتایی کە لەریوایەتی کوڕی جوبەیرەوە هاتوە (فقالوا: ماله أهجر؟ استفهموه! فەرمووی: (وازبهێنن ئەوەی کەمنی لەسەرە چاکترە لەوەی ئێوە لەمنی داوا دەکەن، پاشان وەسیەتی بۆ سێ شت کردو فەرمانی کرد بەسێ شت، موشریکەکان لە جەزیرەی عەرەبی وەدەرنێن، نوێنەرو وەفدەکان بەردەوامی پێبدەن و ئامادەباشیان کەن وەك چۆن من دەمکرد، سێیەم: راوی دەفەرموێت یان بێدەنگ بوو یان ئەوەبوو بیری چوویەوە)(٢).

---

[1] صحيح البخاري ح٣٠٥٣.

[2] صحيح البخاري ح٣١٦٨.

لەراستیدا بابەتی خەلافە بوە، بەڵام بێدەنگ بووبوو لەسەری دوای ئەوەی خەریك بوو پەیمان وەرگرێت لێیان لەسەر ئەبووبەکر، پەراوێك لەوبارەوە بنوسێـت، خوای گەورە ویستیوابوو کە ئەوەنەکات، فەرمووی: (یابی الله والمؤمنون الا ابابکر) ئاراستەی قورئانی کردن لەوبارەوە تاوەکو ئەوەی واجبکراوە کە راوێژە ئەوە ئەنجام بدەن.

پاشان وتەی: (أهجر؟ پرسیارە کەدەکرێت هەواڵی بێت یان ئینکاری بێت، بەواتای مەگەر لەبەر ئێش و ئازارو نەخۆشیەکەیەوە لەهۆش خۆی چووبێت بیٚ ئاگا قسە بکات کەتێنەگەن؟

لە (لسان العرب)دا هاتوە: لەو فەرمودەیەی (چیەتی ئەوە مەگەر لەهۆش خۆی چووە؟ واتە مەگەر قسەی شێواوە بەهۆی نەخۆشیەکەوە بە شێوەی پرسیار، واتە ئایا گوتەکانی گۆراونو قسە تێکەڵ دەکات ).

ئەوەش ئەو تێگەیشتن و باوەرە بووە کە پێغەمبەریش (صلّ الله علیە وسلّم) وەك هەر مرۆڤێکی تر ئێش و ئازارو نەخۆشی تووشی جۆرێك لە هۆش خۆچوونی بکات و قسەی نارێك و شێواو لەدەمی بێتە دەرەوە.

هەروەها وشەی هجر بەواتای نکە نك و بەدەم خۆیەوە قسەدەکات تا لەهۆش خۆی بچێت، وەك ئەوەی پرسیار لەنێو خۆیاندا بکەن کاتیٚ پێغەمبەر بێدەنگ دەبوو، ئەو لەبەرخۆیەوە ئەوەی دەوتەوە کاتێك دەنگی (الی الرفیق الاعلی) لەزاری دەهاتە دەرەوە، ئەوان کاتێك ئەمەیان لێدەبیست و قسەکانی پچر پچر دەبن، دەیان فەرموو ئاگای لەچواردەوری خۆی نییە ؟ پێغەمبەریش وەڵامی دەدانەوە دەیفەرموو:

(وازم لێبێنن ئەوەی ئێستە لەسەریمی و منی تیایە باشترە لەوەی ئێوە داوای دەکەن).

ئیبن و عەباس دەڵێت: (عەلی کوڕی ئەبوتالیب لەلای پێغەمبەری خوابوو بەهۆی ئەو ئازارەی کە بەهۆیەوە کۆچی دوایکرد، عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب نەوی لەدەستی و پێی وت: چی دەکەی سوێند بەخوا دەبینم پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بەم ئازارە گیانی لەدەستدەدات و کۆچی دوایی دەکات، بەناوی ئێمەوە بچۆرە لای، بڵی پرسیاری ئەوە دەکەن دوای خۆت چی بکەن و پرسی پێشەوایەتی بۆ کێ بێت؟ ئەگەر بۆ ئێمەیە بابزانین و فێرمان بکەن، گەر بۆ دەرەوەی ئێمە یە با بزانین و رێنمونیمان بکات، عەلی لەوەڵامدا ووتی: سوێند بەخوا لەوبارەوە لێمان پرسیایە رێمان نەدەدا، نەماندەدا بەکەس دوای ئەو، من سوێند بەخوا لەوبارەوە لە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ناپرسم)[1].

پێعەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کۆچی دوایی کرد، وەك پێغەمبەرێکی خاوێن، بەندەیەکی نێردراوی خواو بانگەوازکار بۆ دینی خوا، لەدوای خۆی بۆ بنەماڵەو ژن و خانەوادەکانی هیچی جێنەهێشت، هیچ ماڵ و موڵکێکی جێنەهێشت، نەیکردنی بەمیراتگری موڵك وماڵ و نەخەلافەت و دەسەڵاتداری، وەك لەفەرمودەی صەحیحدا هاتوە (ئێمە

---

[1] صحیح البخاري ح ٤٤٤٧، واحمد في المسند ٢٦٣/١ باسناد عل ی شرط الصحیحین والبیهقی ترثیم عطا ١٤٩/٨.

هیچ میراتێك جێناهێڵین ئەوەی لەدوای خۆمان دەمێنێتەوە چاکەو خێرە)[(١)].

لەعەمری کوڕی حارسەوە هاتوە: (پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) لەپاش خۆی دیناری جێنەهێشتوە، درهەمی جێنەهێشتوە، بەندەو کۆیلەی جێنەهێشتوە، جاریە و کەنیزەکی جێنەهێشتوە، تەنها ئەسپە سپیەکەی نەبێت و چەکەکەی و زەویەك کەگێراویەتی بە سەدەقە)[(٢)].

لە عائیشەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کۆچی دواییکردو قەڵغانەکەی لەلای جولەکەیەك بوو، بە بارمتە بە (سی–٣٠) مەن جۆ)[(٣)].

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کۆچی دواییکرد پاش خۆی کەسی دانەنا وەك خەلیفە، کەسیشی دیاری نەکرد بۆ ئەوە، بەڵکو وازی لێهێنا بۆ راوێژی نێوانیان کە کێبکەنە پێشەوا، وەك ئەوەی خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردبوون.

عائیشە دەفەرموێت– کەپێغەمبەری خوا لەماڵەکەی ئەو سەری لەباوەشی ئەودا بوو کۆچی دوایی کرد: پێغەمبەری خوا گیانی سپاردو

---

[1] صحيح البخاري ح ٤٢٤٠.

[2] صحيح البخاري ح ٤٤٦١.

[3] صحيح البخاري ح ٤٤٦٧.

لەپاش خۆی کەسی نەکردە جێنشینی، بەڵام ئەگەر کەسی دیارییبکردایە ئەوا ئەبو بەکر یان عومەری دیاریدەکرد)[(١)].

ئیمامی عومەر لەسەر مینبەر فەرمووی: سێ شت هەبوو پێویست بوو پێغەمبەر (صلّ الله علیە وسلّم) رۆشنی بکاتەوە بۆمان، کە باشتر بوو لەهەموو دونیاو ئەوەی تیایدا هەبوە، ئەوانیش (کەلالە= مردویەك بەمیراتەوە بەڵام پاش خۆی منالّی جێنەهێشتبێت، خەلافەت و سود)[(٢)].

دەستەواژەی (الخلافة) واتە جێنشینی دیاری نەکرد لە دوای خۆی، وەك هەندێ لەریوایەتەکان بەو شێوەیە راڤەی دەکەن، بەڵکو بەجێهێشت بۆ راوێژ کە گەل لەنێو خۆیدا دیاری بکات.

هەروەها گوتەی (الربا) مەبەستی ئەوەبو ئەگەر لەوکاتەدا هەموو دەروازەکانی سود و شێوەکانی رۆشنکردبایەوە، وەك هەندێك لەفەرمودە صەحیحەکان واراڤەی دەکەن، چونکە ئەوکات لەبارەی سود و ریباوە ئەو هەموو زانیاریە لەلای ئەو کەڵەکە نەبوبو، هەر بۆیە جیاوازی لەوبارەوە دەکەوتە نێو صەحابەکانەوە.

ئەوە راستیە کەلە عومەرەوە هاتوە وتویەتی: (ئەگەرمن خەلیفە هەڵبژێرم ئەوە دەبێت لە خۆم چاکتر بێت کە ئەبوبەکربو، ئەگەر وازیش بهێنم ئەوە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیە وسلّم) لەوبارەوە وازی لێهێنان.[(٣)]

---

[1] صحيح مسلم ٤/ ١٨٥٦، واحمد في المسند واللفظ له ٦٣/٦.

[2] ابن ماجة رقم ٢٧٣٧ والخلال في السنة رقم ٣٣١.

[3] صحيح البخاري تلاقيم البغا ح ٦٧٩٢. وصحيح مسلم ح ١٨٣٢.

وترا بە ئیمامی عەلی (ر.خ) کەسێك هەڵنابژێریت بۆ جێنشینایەتی؟ فەرمووی نەخێر بەڵکو بەجێتان دەهێڵم وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیە وسلّم) وایکرد، وتیان ئەی چی بەخوای گەورە دەڵێیت لە رۆژی دواییدا؟ فەرمووی: دەڵێم: (ئەی خوای من منت لەنێو ئەواندا وازلێهێنا لەو بارەوە، پاشان گیانت کێشام بۆلای خۆت و تۆ هەردەمێنی لەناویان، ئەگەر ویستت چاك دەبن، ئەگەر ویستت تێکدەچن لەناویەکا)[1].

لە ریوایەتێکی تردا بەم شێوەیە هاتوە: وترا بە ئیمامی عەلی (ر.خ) لەنێو ئێمەدا جێنشینێك دیاری بکە، فەرمووی شتی وەها ناکەم، چونکە پێغەمبەری خوا کەسی نەکرد بەجێنشین پاش خۆی تا منیش وابکەم، ئەگەر ویستی خوا بە خەڵکی چاك بوو ئەوە کۆیان دەکاتەوە لەسەر چاکە، وەك ئەوەی دوای پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیە وسلّم) لەسەر چاکە کۆی کردنەوە)[2].

قەیسی کوڕی عەباد و ئیبن و کەوا، هاتنە لای ئیمامی عەلی (ر.خ) پرسیاریان لێکرد: مەگەر تۆ لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صلّ الله علیە وسلّم) هیچ پەیمانێکت بۆ پرسی پێشەوایەتی لەگەردنە ؟ فەرمووی پەنادەگرم بەخوا ئەگەر یەکەم کەسێك باوەڕم بەپێغەمبەرایەتی پێغەمبەر هێنابێت، خۆنابمە یەکەم کەسێك کە درۆی بەدەمەوە بکەم، سوێند بەخوا بێجگە لەو پەیمانی ئیسلامەتی لە پێغەمبەری خواوە

---

1 ابن سعد في الطبقات ٣/ ٣٤، والخلال في الينة رقم ٣٣٢ واسناده حسن.

2 رواخ الحاكم في المستدرك ٣/ ٨٤ وقال صخيخ الاسناد والبيهقي في السنن ١٤٩/٨.

(صلّ الله عليه وسلّم) بۆ ئەم بوارە شتێکی ترم نییە، خۆ ئەگەر بۆ ئەو بابەتە پەیمان دابوبێت و عەهدێکم لەو بوارەوە پێدرابێت، ئەوە لەسەری دەجەنگام لەسەری لەگەڵ ئەو دوانە).[1]

لەو گوتەیەی عەباس بۆ عەلی: (پرسیاری لێبکەین کە دوای خوای پێشەوایەتی بەکێدەدات) بەڵگەیە کە ئەم پرسە- پرسی جێنشینی ودەسەڵاتە، هەورەها بۆ کێ پێشەوایەتی شایستەیە- ئەوەیەکێك لەو پرسانەیە کە بەدەوری خۆیدا مشتومڕو ناکۆکی هێنا لەگەڵ خۆیدا پێش کۆچکردن بۆ مەککە، پاشان دوای کۆچکردن بۆ مەدینە،

لەژیانی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) هەروەها پاش کۆچی دوایی، ئەوەتا شەهرستانی دەڵێت شمشێر رانەکێشراوەو بەخوێن سوورنەبوە لە بەر بابەتێکی ئاینی بەئەندازەی ئەوەی لە بابەتی دەسەڵاتدارێتی و پێشەوایەتیدا راکێشرا بێـت و بەخوێن سوور بوبێت.

دیارە مەبەست لە (الامر) مەبەستی میرایەتی و خەلافەت و پێشەوایەتیە، مەبەستی ئەو گوتە قورئانییە یە کەدەفەرموێـت: (وأمرهم شوری بینهم)، کە پێغەمبەری خوا (د.خ) راسپاردەی لەوبارەوە پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات، کە فەرمووی بەپێی قورئانی پیرۆزو کارکردن بەو رێنموونییە قورئانیانەی بۆ هاوەڵان باسکراوە.

ئەو گفتوگۆیەی نێوان عەباس و ئیمام عەلی بەڵگەیەکی رۆشنە لەسەر بابەتێکی زۆر مەترسیدار، تا ئەوەبوو هیچ کام لەو کاتی تەنگانەو

---

1 السنة للخلال رقم ٣٩.

نارەحەتیەی نەخۆشی پێغەمبەردا شتێکی تریان بە بیر نەما بوو لەخەمیان نەبوو شتێ تر تەنها ئەوە نەبێت، ئەوەش کاریگەری لەسەر پێگەو شوێنی ئەوان و نزیکی لەوان لەپێغەمبەر دانەنا، بەڵکو ئەوە لەبەر مەترسی و گرنگی پێشەوایەتی و دەسەڵات بوو لەسیاسەتکردنی دونیا و شوێنگەی لەناو ئایندا، کە بنەمایەکە لەبنەماکانی گوتاری ئاینی.

لەو دەستەواژەیەی (یأبى الله والمؤمنون الا ابابکر) بەڵگەیەکی رۆشنە کەوا دەسەڵات دەبێت بدرێتەوە بە بڕواداران و بژاردەکە لەلای ئەوانە کەچۆن دەستنیشان ی خەلیفەکەیان دەکەن، وشەی (اباء) رۆشنە لەوەی کە مافی هەڵبژاردن دەداتە دەستیان، دیارە ئەوەی مافی راستەقینەی نەرێی هەبێت بۆ کەسێك، ئەوا مافی ئەوەشی هەیە کەهەوڵ و بەخشین ئەنجام بدات، وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) خوای گەورە نهێنییەکەی بۆ ئاشکرا کردبێت کە لەدوای خۆی گەلەکەی ئەبوبەکر هەڵدەبژێرن، ئەوەش ئەوبوو کە قەدەر و ویستی خوای لەسەر بوو، دواجاریش بڕواداران ئەویش هەڵدەبژێرن، و ئەوەش جێبەجێ بوو، هەندێك واگومان دەبەن کەپێغەمبەری خوا ئەبوبەکری لەپاش خۆی دانابێت بە جێ نشین، وەك ئەوەی ئیبن و ئیسحاق لە مەغازی و لە قاسمی کوڕی موحەمەدی کوڕی بەکرەوە دەیهێنێت و دەڵێت: (ئەگەر ئەو وتەیەی عومەر نەبوایە لەکاتی وەفاتی پێغەمبەردا، ئەوە موسڵمانان گومانیان نەدەبرد کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ئەبوبەکری لەدوای خۆی کردبوە خەلیفە، بەڵام عومەر لەکاتی

وەفاتی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) وتی: ئەگەر کەسێك بکەم بەخەلیفە ئەوە کەسێك دەکەم لە من باشتر بێت کردویانە، ئەگەر وازی لێبێنم دیارە ئەوە لەمن باشتریش ئێوەی بەجێهێشتوون، خەڵکی زانیان کەپێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کەسی هەڵنەبژاردوە، عومەریش تانەلەسەر نەدەبوو لەسەر ئەبووبەکر)[1]، هەندێکیش بانگەشەی ئەوە دەکەن کەپێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ئەبوبەکری لەپاش خۆی داناوە بە خەلیفە، بەوەی کە کردوویەتی بە پێشەوای نوێژکردنیان لەجیاتی خۆی لەکاتی نەخۆشی و پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات، لەکاتێکدا باشترینی هاوەڵان لە خوێنەریی قورئاندا ئەو نەبووە، بەڵکو کەسانێك هەبوون کەلەو باشتریان لەبەربوو، بۆنموونە ئیبن و مەسعود لە ئەبوبەکر زیاتر قورئانی لەبەربوو، کاتێك پێغەمبەری خوا فەرموبووی کەسێ ئیمامەتی نوێژی بڕواداران بکات کە زۆرترینی قورئانی لەوان لەبەرتربێت، کاتێکیش ئەبوبەکری خستە پێشەوە بۆ ئیمامەت ئەوە ئاماژەیەك بوو بۆ گشتیان کە کەپێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) دەیەوێت ئەو پێشەواو ئیمامیان بێت لەدوای خۆی)[2].

وەك چۆن ئەوی گێڕا بە ئەمیرێك بەسەر ئەوانی ترەوە لەکاتی حەجکردنیاندا لە ساڵی نۆیەم، هەروەها هیچ مانایەك بۆ ئیمامی

---

[1] ابن اسحاق في المغازي والسير كما في مختصر ابن هشام ٧٠/٦.

[2] السنة للخلال رقم ٣٦٥-٣٦٧، لە ئەحمەدی کورە حەنبەلەوە وەرگیراوە/ بۆزامیاری زیاتر تەماشەی فتاوای ئیبن تەیمیەی٣٥/٤٧ بکە.

ئەبووبەکر لەنوێژدا بۆ خەڵکان نییە، بەدرێژایی نەخۆش کەوتنی پێغەمبەر (صلّ الله علیە وسلّم) ماوەی دە رۆژ تەنها ئاماژە نەبێت بۆ فەزڵ و پێگەو کاندیدکردنی بۆ پاش خۆی نەبێت.

هەندێکیش وایان دەردەبڕی کە بەڵێ پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیە وسلّم) وەسیەتی کردوە کە دوای خۆی ئیمامی عەلی (ر.خ) ببێت بە پێشەوا.

هەردوو بۆچوونەکە بۆچوونی گومانی و هەڵگری حەزی دەروونین، بەڵگەیەك نین لەسەر راستەقینەی ئەوشتە، نەك لەبەر ئەوەی کە دژایەتی لەگەڵ ئەو تەواتورەی هاتوە کە هیچ کەسێك دەستنیشان نەکراوە لەلایەن پێغەمبەرەوە، هەروەها نەوەك لەبەرئەوەی کە لەواقیعدا کەسێ نەبو دیاریکرابێت واقیع ئەوەی رەتکردوەتەوە، سەرەڕای هەموو ئەو قەولانەی کە تەئویلدەکران بۆ هەڵگرتنی ئەو دژیەکیەی کە لە بەڵگەکانیان هەبوو و هەروەها لە خواستەکانیاندا هەبوو، بەڵکو خەلیفایەتی و دانان یان پێدانی دەسەڵاتی پێشەوایەتی بەکەسێك دوای پێغەمبەری خوا، پێچەوانە ودژ دەبوویەوە لەگەڵ هەموو بنەماکانی گوتاری قورئانی و پێغەمبەری، کە هاتون بە شوراو بەراوێژو بریاریان لەسەرداوە وەك بنەمای سەرەکی و چەسپاندنی ماف گەل بەوەی کێی بوێت هەڵیبژێرێت و ئیختیاری بخاتە بەردەم، بەبێ زۆرە ملێ و خۆسەپێنی بەڵکو پێغەمبەری خواش (صلّ الله علیە وسلّم) نەچوە مەدینە وەك ئەوەی پێشەوا بێت، بەڵکو پاش بەیعەتی عەقەبە و رەزامەندی خەڵکەکەی، نەبوە پاشایەکی خۆسەپێنەرو چەوسێنەر، ئیتر

چۆن دوای خۆی بریار لەسەر هەڵوەشاندنەوەی بنەمای شوری دەدات وئومەت و بڕواداران ملکەچ بەتاکە بریارێك دەکات ئەویش دیاریکردنی یەکێك لەخزکان و ئالو بەیتی خۆی بکاتە خەلیفەی موسڵمانان. !

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) پێش هەموو کارێکی نوسراوێکی نوسی تیایدا راسپاردەی ئەوەی تیاکرد بۆ خەڵکان کە دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بەدەست کەسێك بدەن کە هەمووتان رەزامەندیتان لەسەری هەبێت، پاشان وازی لێبهێنن وەك ئەوەی کە شەرعی خوا داوای لێدەکات با ئەنجامی بدات، پێویستە راوێژیش لەنێوانتاندا هەبێت، ئەمەش لە سونەتی کردارەکی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بەتەواوی بینراو یەکیگرتەوە لەگەڵ ئەوەی کەقورئان فەرمانی دابوو بەتەواوی. پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) هیچ شتێکی لە قورئان و فەرمودە بەجێ نەهێشتوە، بەڵکو هەمووی راگەیاندوە ئەوەبوو لە حەجی ماڵئاواییدا هەموانی شاهید دەرخست.

**دووەم: رووداوی سەقیفەو ئەوەی تیایدا گوزەرا:**

بریتی بوو لەو ڕووداوە سەرەکیانەی کە گوتاری سیاسی ئیسلامی راشیدین و بنەماکان و پرانسیپەکانی لەسەردامەزران، وەختەکارێك پێغەمبەری خوا کۆچی دواییکرد تاوەکو ئەنصار دەستپێشخەریان کرد کە بچن بۆ سەقیفە کە ئەو شوێنە شوێنی کۆبوونەوەی هەموان بوو بۆ ئالۆ گۆڕی راو گفتوگۆکردن لەکاروباری گشتی، پێش ئیسلام، کۆچەرەکان لەسەرووی هەمویانەوە ئەبوبەکرو عومەرو ئەبوعوبەیدە

دەستپێشخەربوون بۆی، هەموویان لەبابەتی جێنشینایەتیەوە گفتوگۆیان تێداکرد، ئەوەش وەك جێبەجێکردنی پرانسیپی (وأمرهم شوری بینهم) ئەوەندە مشتومڕیان لەوبارەوە کرد تا تەواو دەنگیان بەسەریەکدا بەرزکردەوە، تا سەعدی کوڕی عوبادە کە سەرۆکی هۆزی خەزرەج بوو، وتارێکی بۆدان و وتی: (پاش سوباس و ستایش بۆخوا، ئێمە پشتیوانی دینی خواین، دەستەی ئامادەباشی ئیسلام، ئێوە – واتە کۆچەرەکان– کاتێك ئێوە کەمینەیەك بوون نوێنەرتان هاتە لامان، مەگەر ئەوان ویستیان لە خۆمان جوێمان بکەنەوە، لە ڕووی دەسەڵاتەوە سەرمان بکەنەوە بەباوەشی خۆماندا، بێبەشمان بکەن، پاشان هەندێ قسەی توندی کردو تەنانەت دەمارگیری نەفامی دای لەکەللەی، بۆیە حەبابی کوڕی مونزیر وتی: من وەك بنی ئەو درەختە گەورە لەبەر نەکەوتوەم کە هەڵنەکەنراوم و ئەوەی پێویستی پێیەتی دەبێت خۆی پێبگرێتەوە یان ببەستێتەوە، بۆیە لە ئێمە ئەمیرێك و پاشان لە ئێوەش ئەمیرێك ئەی کۆچکەرەکان.[(١)]

بوخاری لە صەحیحەکەی خۆیدا بەدرێژی هەموو ڕووداوەکەی سەقیفەی بەدووی یەکدا هێناوە، کەتیایدا ئیبن وعەباس دەڵێـت: (من خەریکی خوێندن بووم بەکۆمەڵێك لەپیاوانی کۆچەر لەوانە عەبدورەحمانی کوڕی عەوف، وەختەکارێك من لە ماڵی ئەوبووم لە مینا

---

[1] صحيح البخاري ٣٦٦٧، ٣٦٧٨ من حديث عائشة و ٦٨٣٠ من حديث ابن عباس و مسلم في صحيحه ح رقم ١٦٩١ ورواه ابن اسحاق في النغازي والسير وتهذيب ابن هشام ٧٧/٦ و عبدالرزاق في المصنف ٤٣٩/٥. هتد

ئەو لەلای عومەری کوڕی خەتاب بوبو لەکۆتایی حەجدا کە ئەنجامی دابوو عەبدورەحمان گەڕایەوە لام و وتی: گەر ئەو پیاوەت ئەبینی هاتە لای ئەمیری ئیمانداران ئەمرۆ وتی ئەی ئەمیری بڕواداران ئایا تۆ هیچت هەیە لەسەر فلان؟ ئەو دەیوت: ئەگەر عومەر بمردایە ئەوا بەیعەتم بەفڵان دەدا، سوێند بەخوا بەیعەتدان بە ئەبوبەکر تەنها کارێکی بەپەلەو بێبیرلێکردنەوەی پەلە زیاتر هیچی دیکە نەبوو، کەچی کراش، عومەر تورە بوو پاشان وتی: من ئینشائەلا پاش نوێژی شێوان هەڵدەستمەوە بە خەڵکان رادەگەیەنم و ئەوانەش بەتوندی ئاگادرادەکەمەوە کەدەیانەوێت کە دەسەڵاتیان بەسەپێنن، عەبدورەحمان دەڵێت وتم ئەی ئەمیری برۆادران شتی وانەکەی! ئەمە سەروەختی غەوغاوی هەرزانەو قسەو قسەلۆکە، ئەوان ئەوانەن ئەگەر نزیکبەکەونەوە لێت لەونزیکبونەوەیان مەبەستێکیان هەیە، من خەممە تۆ هەستی و وتارێك بدەیت و ئەوان چەند پەلوپۆی لێبکەنەوە و وای لێبکەن کە هەر وشەیەکی لە مەبەستەکەی دووری بخەنەوە، واتای تری بۆ تەئویل بکەن، بۆیە بوەستە جارێ تا شار ووردە وردە سەقامگیردەبێت، ئەمەشوێنگەی کۆچ بۆکردنە (دار الهجرە) و سونەیە دواجار ئەوکات دەگەیت بە ئەهلی شەرعزان و پیاوماقوڵان، ئەوەی دەیڵێیت شوێنی خۆی دەگرێت و خەڵکی زاناو دانا لە وتەکانت هۆشیار دەبن لە شوێنی خۆیان دایاندەنێن، واتە لێیان تێدەگەن و تەئویلیان ناکەن. عومەریش وتی سوێند بەخوا ئین شائەڵا وادەکەم، یەکەم شت ئەوکات ئەوەدەکەم لە مەدینە، ئیبن و عەباس دەڵێت: پاش مانگی

زیلحەجە هاتینەوە مەدینە، ڕۆژی هەینی دەمەو ئێوارەکەی چوم سەعیدی کوری زەیدی کوڕی عەمروی کوڕی نەفیل بدۆزمەوە بینیم لەسوچێکی مینبەر دانیشتبوون، دانیشتم و ئەژنوم دا بە ئەژنۆیەوە، نەجوڵابووم کەعومەرم بینی دەرپەری، وەختی رووبەڕوو بینیم وتم بەسەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی نەفیل، ئەم ئێوارەیە وتارێك دەدا لەوکاتەوەی بوە بەخەلیفە وتاری وای نەگوتبێت، بەڵام ئەو ئینکاری لەوە کردو وتی لەوانە نییە تۆ بڵێی شتێ بڵی کە نەیوتبێت لەپێشتر،؟ عومەر لەسەر مینبەرەکە دانیشت وپاش ئەوەی بانگ بێژ لەبانگەکەی بوویەوە، ئەمجا عومەر هەستاو سوباس و ستایشی خوای کرد و پاشان وتی، دەمەوێت گوتەیێکتان پێراگەیەنم کەوواپێویستی کردوە کە من بیدەم بەگوێتانا، ناشزانم ئایا ئەمە کۆتا وتەم بێت و بمرم دوای ئەوە، ئەوەی لەم قسانەم تێگەیشت و عەقڵی پێشکا با لەهەر شوێنێك کۆتایی بەکاروانەکەی هات پێی دەست پێبکاتەوە، ئەوەی ترسا لەوەی کە تێنەگەیشتوە لێی بۆ کەس رەوانییە درۆم بۆ هەڵبەستێ، دیارە من ئەوەم پێگەیشتوە کە یەکێکتان وتویەتی: ئەگەر عومەر بمردایە ئەوا بەیعەتمان بەفلان دەدا، سوێند بەخوا بەیعەتدان بە ئەبوبەکر تەنها کارێکی بەپەلەو بێبیرلێکردنەوەی بێ سەروبەرە زیاتر هیچی دیکە نەبوو، باکەسێك خۆی و ئەوانی تر نەگەوجێنێ بەوەی کە بەیعەت دان بە ئەبوبەکر کارێکی پەلەو بێسەرو بەرە بوو، خۆ ئەگەر وەهاش بووبێت خۆ خوای گەورە لەشەرەکەی پاراستینی، لەنێو ئێوەدانییە هیچ بەربەستێکی لەبەردەمدا هەبێت وەك ئەبوبەکر (ئەوەی بەیعەت

بەکەسێك بدات بە بێ راوێژ کردن بەموسڵمانان ئەوە دوکەوتنی نابێت نە بەیعەت بەئەو و نەئەوەشی دوای دەکەوێت دەدرێت، لەحەزەری ئەوەی کە بوغرابێت و کوشتن روبدات. دیارە ئاگادارین کاتێ پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کۆچیدوایی کرد پشتیوانان پێچەوانەی رەفتار لەگەڵ ئێمە جوڵانەوە، هەموویان لە سەقیفەی بەنی ساعیدە کۆبوونەوە، هەروەها عەلی و زوبەیر ئەوانەی لەگەڵیان بوون دژی ئێمە وەستانەوە، دیارە کۆچکەرەکان تێکراو بەزۆرینە لەسەر ئەبووبەکر رێککەوتن، منیش وتم بە ئەبووبەکر دەی بکەوەرە پێشمان بابچینە لای برایانمان لە پشتیوانان، رۆیشتین ویستمان بیانبینین پێش ئەوە گەیشتینە دوپیاوی چاکیان ئاماژەیەکیان دابەوەی کەئەو قەومە لەسەرچی کۆبوونەتەوە وپێیان وتین: چیتان دەوێ کۆمەڵی کۆچەرەکان؟ وتمان دەمانەوێ ئەو برا ئەنصاریانەمان ببینین، وتیان قەیناکات ئەگەر نەشچن خۆتان کارەکە یەکلابکەنەوە، منیش وتم سوێند بەخوا دەبێت هەربیانبینین و قسەیان لێوەربگرین، رۆیشتین تاگەیشتینە سەقیفەی بەنی ساعیدیە و لەوێ بینیمانن و کەسێکی پێچراوە لەناوەراستیاندا بوو وتم ئەوە کێیە؟ وتیان ئەوە سەعدی کوڕی عوبادەیە، وتم چیەتی؟ وتیان ئێش وئازاری هەیە، کاتێك کەمێك دانیشتین، گوتەبێژەکەیان شایەتمانێکی هێناو سوپاس و سەنای خوای کردو لەوەی کەهەیەو، پاشان وتی: ئێمە پشتیوانی خواو پێغەمبەرەکەی و سوپای مەزنی موسڵمانانین، ئێوە ئەی خەڵکی کۆچکەر تاقمێکی کەم بوون، نوێنەرتان هاتە لامان و پەناماندان لە

قەومەکەی خۆتان و باوەشمان بۆ کردنەوە، مەگەر بۆ ئێوە ئێستە دەتانەوێت بێبەریمان بکەن و لە ریشەی خۆمان جوێمان بکەنەوە پەراوێزمان بخەن لە پرسی دەسەڵات و پێشەوایەتی؟!

کە قسەکانی تەواو کردو بێدەنگ بوو، ویستم قسەبکەم، ئیتر لای خۆمەوە وەڵامێکی رازاوەم بۆ قسەکانی ئەو ئامادەکردبوو، ویستم بیخەمەبەردەم ئەبوبەکرکەبەشێوەیەکی جوان وەڵامی بدەمەوە، کەمن دەمتوانی ئەو توورەییەی کەمێك دامرکێنمەوە، بەڵام کە ویستم قسەبکەم ئەبوبەکر وتی: بەیارمەتیت ببورە، منیش نەم ویست تورەی بکەم و قسەبکەم.

ئەبوبەکر دواو بینیم ئەو نەرمترو هێمنتر قسەیکرد، سوێند بەخوا هەرقسەیەکی رازاوەم ئامادەکردبوو وتی یان ئەوبەجوانتر باسی کردو خستیە ڕوو، تا تەواوی قسەکانی کردو وەستا، وتی ئەوەی لەبارەی ئێوەوە وتراوە هەرچاکەبوەو ئێوەش ئەهلی ئەوە، ئەو بابەتی پێشەوایەتیە کەسی بۆدیاری نەکراوە تەنها بۆ ئەم تاقمە لە قورەیش نەبێت، ئەمانە لەچینی ناوەندن لە رووی نەسەب وماڵەوە ئەوان رازین ئەگەر ئێوە رەزامەند بن یەکێ لەم دوانە بەیعەتی بدەنێ بە ویستی خۆتان، نەوی لەدەستی من و دەستی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح کە لەنێوان من و ئەودا دانیشتبوو، هەموو ئەوەی وتی پێم خۆش بوو بێجگە لەوە، سوێند بەخوا ئەگەر بێمە پێش و لەگەردنم بدەن، ئەوە نزیکم ناکاتەوە لەتاوان، پێم خۆشترە لەوەی ببمە فەرمانداری گەلێك کە ئەبوبەکری تێدابێت، مەگەر خوانەخواسە دەرونم—نەفسم، شتێکی لەو

شێوەی قبوڵبێت لەکاتی مردنمدا کە ئێستا شك نابەم تیایدا. یەکێك لە پشتیوانان دەنگی بەرزکردەوەو وتی: من وەك بنی ئەو درەختە گەورە لەبەر نەکەوتوەم کە هەڵنەکەنراوم و ئەوەی پێویستی پێیەتی دەبێت خۆی پێبگرێتەوە یان ببەستێتەوە. بۆیە لە ئێمە ئەمیرێك و پاشان لە ئێوەش ئەمیرێك ئەی گەلی قورەیش.

ئیتر ژاوەژاو دەنگ بەرزکردنەوە بەسەریەکی تێداهات، تاوەکو دواتر ئەو ناکۆکیەم تێکدا بەوەی ووتم بە ئەبووبەکر بێنە دەست درێژ بکە، ئەویش دەستی درێژکرد، و منیش دەستم خستە سەردەستی و بەیعەتم پێدا، پاشان کۆچەرەکان تێکرا بەیعەتیان پێدا، بەسەر راکەی سەعدا بازماندا، لەناو ئاپۆراکەدا یەکێك وتی سەعدتان کوشت منیش وتم خوا سەعدی کوڕی عوبادەی کوشتوە، عومەر وتی سوێند بەخوا لەوەی کە ئێمە کۆبووینەتەوە لە هەڵبژاردن و بەیعەتدان بە ئەبوبەکر بەهێزترو باشترمان دەست نەکەوتوە، ترساین کە ئەم قەومە لێکمان بترازێنی و بەیعەت ڕوونەدات و پیاوێك نەتوانین هەڵبژێرین وبەیعەتی پێبدەین و دوای ئێمەش بەیعەت نەتوانرێت بدرێت بەپیاوێك، یاخود بەیعەت بدەین بەکەسێك کە رەزامەند نەبین لەسەری، یان پێچەوانەی بینەوە و دژی بوەستین ئەوکات فەساد و لادان روویدەدا (ئەوەی بەیعەت بەکەسێك بدات بەبێ راوێژو مەشورەتی موسڵمانان ئەوە دوکەوتنی نابێت نە بەیعەت بەئەو دەدرێت و نەئەوەشی دوای دەکەوێت لەحەزەری ئەوەی کە بوغرابێت و کوشتن روبدات.

لە ریوایەتی عەبدولرەزاقدا (پیاوێك هات و وتی ئەی ئەمیری بڕواداران من بیستم فلانە کەس دەیوت ئەگەر عومەر بمردایە ئەوا بەیعەتم بەفلان دەدا، عومەریش وتی من هەڵدەسم بەو خەڵکە دەڵێم و لەو تاقمە بچووکە ئاگاداری دەکەمەوە کەدەیانەوێت کەدەسەلات و پێشەوایەتی بڕواداران داگیربکەن و خۆیان بسەپێنن).

لەریوایەتی ئیبن وشەیبەدا هاتوە کەعەبدورەحمانی کوڕی عەوف وتی بە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ئەمیری بڕواداران زۆر تووڕەبوو، ئەمڕۆ تووڕەییەك کە تووڕەیی وەهام لێنەبینیوە لەکەیەوە، وتی نەتزانی بۆچی؟ وتی ئەوەبوو کە دووکەس لە پشتیوانان یادی بەیعەتی ئەبوبەکریان بیرهێنایەوە و وتیان بەیعەتدان بە ئەبوبەکر تەنها کارێکی بەپەلەو بێبیرلێکردنەوەی بێ سەروبەرو گەوجاندن زیاتر هیچی دیکە نەبوو، چ رێگریەك لەبەردەم کەسێکدا هەیە ئەگەر ئەوە تیاچوو، هەستێت کێی خۆشبوێت بیهێنێت و دەستێك بدات بەسەردەستیدا و بیکات بەوەی کەدەیەوێت، وتی عومەر تێگەیشت، و وتی خەڵکان لەوبارەوە تێدەگەیەنم و قسەیان بۆدەکەم، منیش وتم نەکەی ئەی ئەمیری بڕواداران چونکە تۆ لەناوچەیەك و شارێکدای هەموو لق و پۆپەکانی عەرەب سەری تێدەکەن و تیایدا کۆدەبنەوە، ئەگەر شتێکی وا بڵێیت قسەو قسەلۆکت لەبارەوە دەپێچن و بڵاو دەبێتەوە بەسەر زەویدا، نازانی ئیتر بەوەش چی دەگوزەرێت).

لە ریوایەتێکی تری ئەودا ئەبوبەکر بە پشتیوانانی وتوە (وتی ئەی خەڵك و هۆزی پشتیوانان ئێمە ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەین، هەروەها

ئەو منەت و گەورەیەی بەسەر موسڵمانانانەوە هەتانە، هەروەها ئێمە ئینکاری ئەو مافەی لەسەرمانە کە واجبە ناگەین، بەڵام ئێوە زانیوتانە کە قورەیش و پێگەکەی لە ناو عەرەبدا هەیەتی ئەوانی تر نەیانبوە، دیارە عەرەب بەدرێژایی مێژووی کۆنەبوەتەوە تەنها لەسەردەستی پیاوێکی ئەو نەبێت، بۆیە پێمان وایە کە ئێمە ئەمیرو پێشەوابێت و لە ئێوەش وەزیرو راوێژکار، ترسی خواتان هەبێت و ئیسلام لەت و پەت مەکەن، مەبنە یەکەم کەسێك کە بیدعەو غەیرەدینی دەهێننە ناو ئیسلامەوە، ئەوا من رەزامەندم کە یەك لەم دووپیاوە (عومەرو ئەبی عوبەیدەی جەراح) هەڵبژێرن. لە ریوایەتەکەی ئیمام ئەحمەدا هاتوە کە عومەر وتوویەتی: (ئەوەی بەیعەت بە ئەمیرێك بدات بەبێ راوێژو مەشورەتی موسڵمانان ئەوە دوکەوتنی نابێت نە بەیعەت بەئەو دەدرێت و نەئەوەشی دوای دەکەوێت لەحەزەری ئەوەی کە بوغرابێت و کوشتن روبدات).

لە ریوایەتەکەی دووەمی ئیبن و حیباندا، هاتوە کە عومەر وتوویەتی: (من ئینشائەڵلا پاش نوێژی شێوان هەڵدەستمەوە لەسەر میمبەر بە خەڵکان رادەگەیەنم و لەو تاقمە کەمینەیە ئاگادار دەکەمەوە کە دەیانەوێت کە دەسەلاتیان بەسەپێنن).

ئیبنو شەیبە لەرێگەیەکی ترەوە ریوایەتی کردوە کە (ئەبوبەکر وتویەتی ئەی هۆزی پشتیوانان من ئینکاری ماف ئێوە ناکەم، ئینکاری ماف ئێوە کە باوەڕم پێیەتی و پارێزراوە، سوێند بەخوا ئێمە هەرچیەك پێکامانبێت و چاکەمان بەدەستهێنابێت و رێگەیمان گرتبێت ئەوە

بەهاوكاری وبەشداری ئێوەبووە، بەڵام عەرەب رەزامەند نییە و دان نانێت بەكەسێكدا كە لە قورەیش نەبێت، چونكە زمانپاراوترینی خەڵكانی عەرەبن و رووخۆشترین روخسارین و شوێنگەیان ناوەندی عەرەبەو زیاتر لەخەڵكان لەناو عەرەبدا خوو و تەبعی رەزامەندیان هەیە)[1].

**سێیەم: وتاری ئەبو بەكری صدیق پاش بەیعەت پێدانی:**

ئەمە سێیەم ڕووداوی سەرەكی لە مێژووی گوتاری سیاسی راشیدین كە بنەماكانی ئەو گوتارە دەربكەوێت، پاش بەیعەتی گشتی راستەوخۆ ئەبوبەكر هەستا و وتارێكی بۆ خەڵكیدا كە وتارێكی مەشهورو صەحیحە بە ئامادەبونی گشتی هاوەڵانی پێغەمبەر، كە لەو وتارەدا هاتوە: (ئەی خەڵكینە من كردومتانە سەردارتان و فەرمانڕەواییتان كەوتە بەردەستم، من لەئێوە باشتر نیم، ئەگەر چاكەم كرد پشتیوانی و كۆمەكم بن، خۆ ئەگەر بەلارێدا چووم راستم بكەنەوەو بمهێننەوە سەر راستە، بێهێزتان لای من بەهێزە تاوەكو مافی بۆ وەردەگرمەوە، بەهێزتان لای من بێ هێزە تاوەكو ئەو مافەی بردوویەتی لێ وەردەگرمەوە، هەرگیز هیچ گەلێك تێكۆشانی وازلێنەهێناوە كە زەلیل و سەرشۆر نەبێت، هیچ وەخت خراپەو تاوان بڵاو نەبوەتەوە لەناو گەلێكدا ئیلا تووشی بەڵاو ناخۆشی بوون، گوێرایەڵیم بكەن لەوەی گوێرایەڵی خوادەكەم لەبۆ

---

[1] ابن ابي شيبة في المصنف ٤٣٣/٧. باسناد صحيح على شردين الصحيحين...

ئێوە، خۆ ئەگەر لامدا لەئیان و بێ ئەمری خوام کرد ئەوکات گوێرایەڵیەك بۆ من لای ئێوەوە نییە[1].

لەم وتارە کورت و پوختەدا جەخت کردنەوەیەك لەسەر هەموو بنەماکانی گوتاری سیاسی قورئانی و پێغەمبەرایەتی بوونی هەیە، وەك ئەوەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر لێی تێگەیشتبوون. لەوانەش:

١- دەستەواژەی (منتان کردوە سەردارتان لەئێوە باشترنیم) جەخت لەسەر ئەو پرەنسیپە دەکاتەوە کە سەرداری و پێشەوایەتی تەکلیفە نەك تەشریف، هیچ مادارییەکی تایبەتی تیانییە کە برابێتەوە بۆ لایەکی دیاریکراو، هیچ کەس لەهیچ کەسی تر لەپێشتر نییە، هیچ ئەفزەلیەتێك بۆ بۆ تاقمێکی دیاریکراو یان کەسێکی دیاری کراو نییە، بەڵکو ئەوە ئەوانن ئەرکی دەخەنە سەرشان، لەبەر ئەوە بەشێوازی کاری رانەبردووی بکەرنادیار هاتوە (ولیت علیکم) واتە ئێوە ئەوەتان کردووە، ئەوەش پووچەڵکردنەوەی هەموو تیۆریانەیەی پێشوە کە هەوڵی راڤەکردنی دیاردەی دەستگەیشتنە بەدەسەلأت،ئەو بنەمایەی کەبونیادی لەسەر نراوە شایستە بە ملکەچی و گوێرایەڵیە لەلایەن گەلەوە، جا ئەو تیۆریەی هێز و پاشایەتی کە سیستمە تۆتیلیتاریەکانیان لەسەر بونیادنراوە، وەك قورئان لە سەرزاری فیرعەونەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە فیرعەون لەسەر بنەمای موڵکداری داوای ئیستحقاقی ملکەچی خەڵك دەکات بە بەڵگەی پاشایەتی و هێزو

[1] رواه محمد بن اسحاق في السيرة كما عند ابن هشام في٨٢/٦، وعبدالرزاق في المصنف ٣٣٦/١٦ عن معمر.وابن سعد في الطبقات١٣٦/٣.

(وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِ قَالَ يَا قَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ الْأَنْهَارُ تَجْرِي مِن تَحْتِي ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ) لەبەر ئەوە وتی بە موسی وەك قورئان باسی لێوەدەكات (قَالَ لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ )

فیرعەون ئەوەی دەویست لەموسا بریتی بوو لەگوێڕایەڵی ودەرنەچوون لە فەرمانی ئەو، بەوپێیەی توانای هەیە لە زیندانیكردنی و كوشتنی، ئەوانەش بەسە بەلای ئەوە كە مافی خاوەندارێتیە بۆ پاشا كە ئیتر گوێرایەڵی و ملكەچی بۆ ئەنجام بدات.

هەروەها دەسەڵات بە پێشپاردنی خودایی نییە (تفويض الهي) وەك ثیوكراتەكانی ئەوروپا باوەریان پێی بوو، كە پیاوانی ئاینی خۆیان كردبوە نوێنەری خوا، لەبری خودا حەرام و حەلاڵیان دەستنیشاندەكرد، پیرۆزباییان لە دەسەڵات و پاشایەتی هەركەسێك كە بیانویستایە دەكرد یان بەپێچەوانەوە ئەوانەی لەگەڵیان نەدەهاتنەوەو ویستیان نەبوو لەگەڵیان دەریان دەكرد، بەو بیانوەی كە ئەگەر ئەمان پەیمانی پشتیوانی دەسەلاتیان بۆ پاشا بدابا ئەوا خوای گەورە لە ئاسمانەوە پەیمانی پشتیوانی و سەركەوتنی پێدەدەا چونكە ئەمانە نوێنەری خوابوون!.

ئەم تیۆریایە ئەو تیۆریایە بوو كە قورئان لەناوی بردبوو وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (إتخذوا احبارهم ورهبانهم اربابا من دون الله) عەدی كوڕی حاتەمی كە پێشتر كابرایەكی فەلە بوو وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە نەمانكردبوونە جێگرو هاوبەشی خوای پەروەردگار، پێغەمبەری خوا (صلّ الله عليه وسلّم) فەرمووی (مەگەر حەرامیان بۆ حەلاڵ

نەدەکردن؟ حەڵاڵیان بۆ حەرام نەدەکردن؟ وتی بەڵی، وتی ئەوە ئەوەیەو پەروەرێنی و بەندایەتیە بۆ بێجگە لەخوا..) قورئانی پیرۆز ملکەچی و گوێڕایەڵی بۆ قەشەو پاپاو خەڵوەگەرەکانیان بە بەندایەتی دەیهێنێتە هەژمار، لەو هاوبەشی و بەندایەتیەی کەبێجگە لەخودا بۆ ئەوانی دەکەن ئەوەیە شێوازی ئەو گوێرایەڵی و ملکەچی و گوێ لەمشتیەیە کە چۆن بۆ خوای دەکەن و شایستە بەخوایە ئەوان بۆ ئەوان ئەنجام دەدەن.،

هەورەها گوتاری سیاسی قورئانی و پێغەمبەرایەتی و راشیدین تیۆری رێزداری وخانەدانی (بەگایەتی) بەرەچەڵەك و رەسەنایەتی لە رووی رەگەزەوە کەبیێتە بانگەشەیەك بۆ دەسەڵات و فەرمانڕەواییکردنی ئەوانی تر رەتکردوەتەوە، چونکە مرۆڤایەتی گشت لە نەوەی ئادەمەو ئادەمیش لە خۆڵە، رێزدارترین مرۆڤ لای خوا ئەوەیە کخۆپارێزو بێزیان و چاکویستە. دیارە تابە ئیمرۆش کۆمەڵێك گەل و نەتەوە هەن دینداری بۆ پاشاکانیان دەکەن و ملکەچی و گوێ لەمشتیان بەشێوەیەکی ناوازەیە کە باوەریان وایە ئەمانە نەوەی خواکانن و کەسە هەڵبژێراوەکانیانی خوان.

٢- لە دەستەواژەی (ئەگەر باشم کرد پشتیوان و هاوکارم بن، ئەگەر خراپم کردو لامدا، راستم بکەنەوە) جەختکردنەوەیە لەپرانسیپی چاودێریکردنی گەل لەبۆ پێشەواو کارەکانی و ئەگەری راستکردنەوەی هەرکارێکی کە لاری و لادانی تیا هەبوو، پاشان لێپێچینەوەکردن لەوکاتەدا، بۆیە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەسەڵات هیچ کات

گوێرایەلی رەهای نییە، بەڵکو پێویستە ملکەچکردن بۆی بەگوێکردنی ئەگەر چاکە و دادگەری لە هەگبەیدا بوو، پێویستە راستبکرێتەوە ئەگەر هەڵەی کرد یان ستەمی کرد دەستیبگیرێت.

٣- دەستەواژەی (گوێڕایەڵیم بکەن لەوەی گوێرایەڵی خوای پەروەردگاردەکەم بەرامبەر ئەوکارانەی بۆ ئیوە رایدەپەرێنم، خۆ ئەگەر سەرپێچی خوام کرد لەوەدا ئێوەش گوێرایەڵی منتان لەسەر لادەچێت) ئەمەش جەختکردنەوەیە لە رەوایی هەر بڕیارو فەرمانێکی راپەراندن، کەپێچەوانەی سەرچاوەی سەرەکی یاسایی دەوڵەت نەبێت، ئەو پرەنسیپەیە کە سیستمە سیاسیەکان لەم دواییەوە نەبێت پەییان پێنەبردبوو، پاشاو دەسەڵاتدارەکان وایان دەزنی و دەبینی کە رەوایی ئەو فەرمان و بریارەیان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەوان دەیدەن، ئەوەش تاکە هۆکارێك بوو بۆ رەواییدان بەخۆیان و قسەکانیان و هەرچی تر، بۆیە پێویستبوو جێبەجێبکرایە بە بیٚ گەرانەوە بۆ ئەوەی کەئایا ئەمە دادگەری تیایە. یان لەدەسەڵاتی ئەودا هەیە ئەم بریارە بدات؟ ئایا گەل ئەمەی پیٚ رەوایە؟ وەك لویسی چوارەمی پاشای فەرەنسا دەستەواژە مەشهورەکەی لەبیر ناکرێت لەم بارەوە گوتویەتی (من دەوڵەتم) زەوی و گەل ودەسەڵاتی هەمووی خڕکردەوە لەناو خۆیدا، ئەوەش هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی کە شۆڕشی خوێناوی فەرەنسا سەرهەڵبدات بۆ رززگاربوون لەو بەندایەتیە ناچاری و کەندەڵەی کە گەلی فەرەنسی تیایدا دەژیا پێش شۆڕش، ئەمرۆی نیشتمانی عەرەبی لەو دۆخەدا دەژین!.

٤- لەدەستەواژەی (بەهێزتان لای من بێ هێزە تاوەکو ئەو مافەی بردوویەتی لێ وەردەگرمەوە، بێهێزتان لای من بەهێزە تاوەکو مافی بۆ وەردەگرمەوە) جەختکردنەوەیە لەسەر پرانسیپی دادگەری و یەکسانی لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا، هەموویان یەکسان دەبن بەرامبەر راستی ودادگەری، بەهێز و بێهێز، دەوڵەمەندو هەژار وەکویەك بێ جیاکاری، کەئەمەش ئەو ئامانجەیە کە لەپێناویدا دەسەڵات و پێشەوایەتی لەبۆتەرخان دەکرێت، هیچ کەس لەسەرووی دەسەڵاتی یاساو دادگاوە نییە، تەنانەت خەلیفەش.

٥- لەدەستەواژەی (هەرگیز هیچ گەلێك تێکۆشانی (جهاد) وازلێنەهێناوە کە زەلیل و سەرشۆر نەبێت، هیچ وەخت خراپەو تاوان بڵاو نەبوەتەوە ئیلا بەشوێنیدا بەڵاو ناخۆشی بەدووی خۆیدا هێناوە) ئەمە خستنەڕووی ئەرکی دەسەڵاتە پاش سەقامگیربوونی سیستمەکەی و بەجێهێنانی دادگەری ئەوەش لەپێناو پاراستنی گەل و نەتەوەو دەوڵەت لەو مەترسیە دەرەکیانە، جەختکردنەوەی لە سەر پێویستی جیهاد، هەروەها پاکژ راگرتنی کۆمەڵگاو پاراستنی بەها باڵا ئەخلاقیەکان ئەوانەی شوناس و تایبەتمەندی و مرۆڤایەتیان پێدەپارێزرێت.

له ڕووداوی سەقیفەو مێژووی دوای ئەوی دەسەڵاتی راشیدیندا، کۆمەڵێك بنەمای بنچینەیی رۆشن بوونەوە، کە گوتاری سیاسی راشیدینیان لەسەر دادەمەزرێت کە خۆی لەمانە دەبینێتەوە:

## بنەمای یەکەم: دینی بیٚ دەوڵەت بوونی نییە:

ئیسلام بەبیٚ بونی گەلیٚکی یەکپارچەو توٚکمە درووست نابیٚت، دەوڵەتیٚکی کە پشتیوانی بکات و چوارچیٚوەی بگریٚت و بیپاریٚزیٚت، ئەحکامەکانی سەقامگیربکات، وەك لەفەرمودەی صەحیحدا هاتوە: (ئەم دینە چاکناکریٚت و بونیادی تەواو نابیٚت تا یەکیٚك لەهەموو بوارەکانە چوارچیٚوەی نەگریٚت )ئەوە ئەوەبوو کەهاوەڵان پیٚش ئەوەی پیٚغەمبەری خوا بنیٚژریٚت لە سەقیفە دەسپیٚشخەریان بوٚ کرد، ئەوەش باوەریان وابوو کە ئیسلام دین و دەوڵەتە، ئەمەش قورئانی پیروٚز لە زوٚر ئایەتدا جەختی لەسەرکردوەتەوە کە دەفەرمویٚت: (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ).[١]

هەروەها جەختی لەسەر ئەوە کردوەتەوە کە دەوڵەت وەسیلە و هوٚکاریٚکە بوٚ ئامانجیٚکی بالاٚتر، وەك خودا دەفەرمویٚ: (الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ)[٢].

ئاشکرایە کە زوٚرینەی ئەرکەکان ناتوانریٚت بەجیٚبگەیەنریٚن بەتەواوی، بەڵکو هەرناشکریٚن، تەنها لەژیٚر سایەی دەوڵەتیٚکی کەئیسلام حوکمی نەکات و نەخشەی نەکیٚشابیٚت، شەریعەت و ئەحکامەکانی وەك

[1] النور/٥٥.

[2] الحج/٤١

زەکات و جهاد و فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە و حدود..هتد جێبەجێنەکرێت.

بۆیە لەشەرعدا وتراوە ئەوەی کە واجبێکی پێ تەواو ببێت ئیتر ئەویش خۆی واجبە، پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کاری بۆ بەجێهێنانی ئەو ئامانجە بالآیە هەر لەمەککە کردوە، ئەوە بووکەدەردەچوو بۆ لای هۆزەکان لە وەرزی بۆنەکاندا دەگەرا بزانێت کێ پشتیوانی دەکات، بۆ بەدهێنانی ئەو ئامانجە کە خۆیشی وەسیلەیەك بوو بۆ ئامانجە بالآکە، کەخۆی لە دامەزراندنی راستی و یەکسانی ودادگەریدا دەبینییە وە، کە قورئانیپیرۆز بۆ ئەو مەبەستە نازڵکراوە، پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ئەم خواست و بانگەوازەی خستە بەردەم نەوەی شەیبان، گەورەکەیان موسەننای بەنو حارسە وتی، (ئێمە خۆمان داوەتە دەست پەیمانێکی کیسرا پێشتر، تیایدا پەیماننداوە هیچ شتێك لە ئێمە ڕوونەدات و نەقەومێ بەرامبەر ئەوان، پەنای ئەوانەش نەدەین کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی شتی نوێ وکێشەنانەوە بۆ ئەوان، هەرچی من دەیبینم لەمەی تۆ بانگەوازی بۆ دەکەی پاشاکان زۆر رقیان لێیەتی و دژی دەبن لەوانەش کیسرا، ئەگەردەتەوێت ئێمە هاوکاریت بکەین و پشتیوانیت بکەین لەوەی کە ((میای عەرەبە)= پاساوی تاوانکردن بەرامبەر عەرەب پەسەندەو پاشان بەخشراوە (و)) واتە بەرامبەر هۆزە عەرەبەکان رەزامەندین، بەلآم ناتوانین بەرامبەر تورەکردنی کیسرا هیچ هاوکاریەکت بکەین) پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) فەرمووی (ئێوە چاکتتان کردو

باشیتان نواند لەوەی کە تواناو قابلیەتی خۆتان بە راشکاوی بە ئێمە وت، ئەم دینەی خوا سەرناکەوێ ئیلا دەبێت بەهەموو بەش و بوارەکانانەوە بگات و بپارێز رێت.[1]

ئەمەش راشکاویەکە کە ئەم ئاینە پێویستی بەدەوڵەت و دەسەڵات و گەلێك هەیە لەهەموو بوارەکانەوە پارێزگاری لێبکات، ناکرێت ئەحکامەکانی پارچە پارچە بکرێت، بروا بەبەشێکی بهێنین و بەشێکیشی بخەینە دواوە!

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کە بانگەوازی کردوە بە رۆشنیو راشکاوانە داوای دین و دەوڵەتی کردوە، لەبەرئەوە نەوەی شەیبان هەستیان بەوەکردوە کە پاشاکان رازی نابن پێی و نایەنەوە لەگەڵ ئەوەی بۆ پێغەمبەر هاتوە، پێغەمبەر(صلّ الله علیه وسلّم)لە بەیعەتی عەقەبەی دووەم، جەختی لەسەر گوێڕایەڵی دەکردەوە لە خۆشی و ناخۆشی و تەنگانەو ئاساییدا، ئەوەش بەیعەتی جەنگ و شەڕەکە بەو رێگەیە دەسەڵات دەگیرایە دەست، لە فەرمودەی جابری کوڕی عەبدولا(وتمان ئەی پێغەمبەری خوا، لەسەر چی بەیعەتت بدەینێ؟ فەرمووی لەگوێرایەڵی کردنم لە خۆشی و ناخۆشی و لە چالاکی و پشوودا، لە بەخشینی تەنگانەو ئاساییدا، لە فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە، ئەوەی لەپێناو خودادا نەیلێیت شەرم نەکەیت و لە لۆمەی

---

[1] رواه ابن حبان في التفات ٨٠/١، وابونعيم في دلائل النبوة ص ٣٨٣، ج٢١٤، والبيهقى في دلائب النبوة ٤٢٢/٢ والسمعانى في الانساب ٣٧/٢. هتد.

لۆمەکاران نەترسی، پشتیوانیم بکەن و بەرگریم لێبکەن وەك چۆن بەرگری لەخۆتان و ژن و منالّەکانتان دەکەن.

ئەم پشتیوانانە (انصار) تێگەیشتبون لەمە بۆیە گەورەکەیان ئەسعەدی کوڕی زیرارە وتی: (بزانن ئێوە بەم بەیعەتە ناکۆکی و ململانێ هەمووی عەرەب دەکەن، لە باشەکانتان دەکوژرێ، شمشێرەکانیشتان خەڵك دەبڕێ)[1].

## بنەمای دووەم: نە دەوڵەت و نەکۆمەڵ بەبێ پێشەواو گوێرایەڵی بوونیان نییە:

لای هاوەڵانی پێغەمبەر ئەوە رۆشنە کەباوەری تەواویان بەپێویستی هەبوونی دەسەلاتێکی سیاسی کە کاروباری گشتیان رێکبخات هەبووە، لەبەرئەوە کۆبونەوەی ئەوان لەسەقبفە بۆ دیاریکردن و هەڵبژاردنی پێشەوا کە بەرپرسیارێتی ئیداری و کاروباری دەوڵەت و گەل لەسەرشان بگرێت، وایان دەبینی کە لە گەروەترینی واجباتە شەرعیەکانە، تەنانەت پێش ئەسپەردەکردنی پێغەمبەرو شاردنەوەی لاشەی پیرۆزی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم)یان خستوە.

ماوەردی لەمبارەوە دەڵێت: (پێشەوایەتی بابەتی جێنشینایەتی پێغەمبەرە لە بۆ پاریزگاریکردن لەدین و سیاسەتی دونیا، پەیمانپێدانێکە دەدرێت بەوەی هەڵدەستێت پێی لەناو گەلدا حوکمی

---
[1] رواه احمد ٣٢٢/٣، وابن حبان في صحيحه ١٧٢/١٤ ح ٦٢٧٤و اسناده صحيح.

واجبی هەیە بە کۆرای گشتی)[1]. مەبەست لەکۆرای گشتی کۆرای هاوەڵانی پێغەمبەرانە کە گەورەترین کۆرادێتە هەژمار.

قورتوبی دەڵێت: (جیاوازی و ناکۆکیەك لە بارەی واجب بوونی پێشەوایەتی، لەنێوان ئومەتی ئیسلامی و لەنێوان پێشەوایانی ئاینی نییە، کۆرای هاوەڵان لەسەر پێشخستنی ئەبوبەکر بوون پاش ئەوەی ناکۆکی کەوتنە نێوان کۆچکەران و پشتیوانانەوە، جا ئەگەر پێشەوایەتی واجب نەبوایە ئەو دەنگەدەنگو دەمەقاڵێ و گفتوگۆ فراوانە بۆ دەچوە نێوانیانەوە؟، چونکە ئەوە بەڵگەیە لەسەر واجبی و بەڵکو پایەیەکە لە پایەکانی ئەو دینەی کە سیستمی موسڵمانانە.[2]

ئیبنو تەیمیە دەڵێت: فەرمانڕەواییکردنی کاروباری خەڵکی لەگەورەترین واجبەکانی دینە، بەڵکو دین تەواو نابێت و ناوەستێت بەو نەبێت، چونکە مرۆڤەکان بەرژەوەندیان تەواو نابێت ئەگەر کۆنەبنەوە، بەهۆی پێویستیان بەیەکتر، دیارە لەهەموو کۆبونەوەیەکی کۆمەڵی مرۆڤەکان پێویستی بە سەردارێك دەبێت، چونکە خوای گەورە فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپەی واجب کردوە، ئەوەش بەجێناگەیەنرێت بە فەرمانڕەوایی و بە هێز نەبێت، بەهەمان شێوە ئەوشتانەی تری پێویستن لەبۆی وەك جیهاد و دادگەری و بەڵگە لەسەرنەهێشتن و کۆبوونەوەو جەژنەکان، سەرخستنی چەوساوەکان و سەپاندنی

---

[1] الاحكام السلطانية ص٥.

[2] الجامع الاحكام القران ١/٣٦٤.

سزاکانی حدود و ئەمانە گشت بە پێویستیان بە فەرمانڕەواییەتی و بەهێز هەیە)[1].

ئیبنو حەزم دەڵێت: (بە لێکدانەوەی عەقڵی و ڕۆشنی چاوان بەوەگەیشتوین کە هەستانی خەڵك بە جێبەجێکردنی ئەوەی کە خوا واجبی کردوە لە ئەحکامەکانی ماڵو تاوان و خوێن و نیکاح و تەڵاق و بەرگیری لەستەم و پشتگیری لەچەوساوە، سەندنی خوێنبایی و قصاص، ناکرێن و شتێکی ئەنجام نەدراو دەبن ئەگەر پێشەوایەك بوونی نەبێت، ئەوەش دەبینین لە وڵاتێك بێ سەرۆکدا، کەهیچ حوکمێکی راست و نەتوانای جێبەجێکردنی حەدێك وتەنانەت دین لەلای زۆری جێهێڵراوەو ڕۆیشتوە، راست و بەجێ نابێت ئیقامەی دین بەپشتبەستن بەکەسێك یان زیاتر نەبێت)[2].

شێخ عەبدولەتیف ئالی شەیخ دەڵێت: (ئیسلامی بێ کۆمەڵ نییە، کۆمەڵی بێ پێشەواش نییە)[3].

وتەی ئیبنو حەزم لەبارەی پێشەوایەتیەوە (راست وبەجێ نابێت ئیقامەی دین بەپشتبەستن بەکەسێك یان زیاتر نەبێت) وتەی ئیبنو تەیمیە: (فەرمانڕەواییکردنی کاروباری خەڵکی لەگەورەترین واجبەکانی دینە، بەڵکو دین تەواو نابێت و ناوەستێت بەو نەبێت،) وتەی قورتوبی لەوبارەوە (جیاوازی و ناکۆکیەك لە بارەی واجب بوونی پێشەوایەتی،

---

[1] السياسة الشرعية ص١٧٦-١٧٧.

[2] الفصل الملل والنحل ٤/٨٧.

[3] الرسائل النجدية ٣/١٧٠.

لەنێوان ئومەتی ئیسلامی و لەنێوان پێشەوایانی ئاینی، نییە) وتەی شێخ عەبدولەتیف (ئیسلامی بێ کۆمەڵ نییە، کۆمەڵی بێ پێشەوا نییە) هەموو ئەمانە جەختن لەسەر راستی و دروستی ئەوگوتەیەی کە دینی ئیسلام دانامەزرێت و رێکناوەستێت بەبێ دامەزراندنی دەوڵەت و پێشەوا، دینداری خەڵك و چاکیان لە دەرونیانەوە تەنانەت، تەواو نابێت و ئیسلام و ئەحکامەکانی بە ئەنجام ناگەن، وەك بارودۆخی پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) و یارانی لە مەککە، کە لە باشترنی خەڵکیی مرۆیی بوون لە دین و بروادا، بەڵام ئیسلام دانەمەزرا و ئەحکامەکانی بەدەرنەکەوتن لەمەدینە نەبێت، ئەمەش ئەوە دەسەلمینێت کە ئیسلام لە راستەقینەدا دین و دەوڵەتە.

ئەگەر موسڵمانان لە وڵاتی ئیسلامدا (دار الاسلام) نەبن، پێویست نییە لەسەریان بێجگە ئەوەی کە خوای گەورە لەسەر بڕوادارانی واجب کردوە پێی هەستن چ بەتاك چ بەکۆ، لەوانە نوێژەکان و ماف و بانگەوازو بەردەوامی مانەوە لەسەر دین، ئەوانەی پێوست بە پێشەوا و دەوڵەت ناکات، ئەوەش بەوشێوازە کار دەکەن کە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی خۆی فەرموە لە مەککە: (لست علیهم بمسیطر)[1]، هەروەها (فلذلك فادع واستقم کما امرت ولا تتبع أهوائهم)[2].

بەڵام هەرچی لەوڵاتی بڕواداراندا پاش دابەزینی شەریعەت و ئەحکامەکان، ڕەوا نییە بۆ گەل کە هەڵنەستێت بەوەی کە خوا واجبی

---

1– الغاشیة ٢٢.

2 الشوری ١٥.

کردوه وئەوانە جێبەجێی بکات وەك درووستکردنی دەوڵەت و دانانی پێشەواو دامەزراندنی راستی و ئازادکردنی مرۆڤەکان و تکۆشان لە پێناو خوادا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة ويكون الدين كله لله).[1]

ئەو حوکمە لەسەریان ناکەوێت لە وڵاتی موسڵمانان بەهەردۆخێك لەدۆخەکان، هچ وەختیش پاساو بەوە ناهێنرێتەوە بەوەی کە ئەوان لە سەردەمی مەککیدا دەژین و بارودۆخان وەهایە، پاش ئەوەی کە ئایەتی (اليوم اكملت لكم دينكم واتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الاسلام دينا)[2].

بەهیچ حوکمێکی سەردەمی مەکی مامەڵە ناکرێت تەنها لە وڵاتێکی غەیرە ئیسلام نەبێت، چونکە وتەی راست ئەوانە نەسخ نین، لەسەر هەرکەسێکە کە بارودۆخی وەهایە لە دۆخی موسڵمانانی مەککە لە وڵاتانی غەیر ئیسلامی دەژین بەو مامەڵە بکەن، بەراورد ناکرێن دۆخیان بەوانەی لە دارولئیسلامدا دەژین، وەك چۆن هەموو شتێکیان لەسەر واجب نییە وەك ئەوانەی لە دارولئیسلامن هەموو ئەحکامەکان واجبن لەسەریان.

---

[1] الانفال ٣٩.

[2] المائدة ٣.

## بنەمای سێیەم: هیچ پێشەوایەتیەك درووست نابێت بەبێ بەستنی بەیعەت:

بەیعەت پەیمانێکە لەنێوان دوو لایەندا، گەل بنەمای سەرەکی و سەرچاوەیەو پێشەوا بریکاری ئەو دەکات، ئەم پرەنسیپە لە دەست پێشخەریەکەی هاوەڵان پاش راوێژکردنی تەواو کە بەیعەتیان دا بە ئەبوبەکر ئیتر رۆشن بوویەوە، لەو بەیعەتە تایبەتەی کە لە سەقیفە ئەنجامدرا، لە بەیعەتی گشتی لە مزگەوت، بۆ جەختکردنەوە لە سروشتی پەیوەندی نێوان خەڵکەکان و پێشەواکەیان.

ئەوە پەیوەستنامەیە کە بەخستنە سەردەستی یەکتری تەعبیری لێدەکرێت، وەك ئاماژەیەك بۆ رەزامەندی و پەسەندی، کە ئەوەش نەریتی عەرەبی بووە لەو پەیمان نامەو پەیوەستنامانەی کرین و فرۆشتن و ئەومامەڵانەی لەنێوانیاندا ئەنجامدراون، نە پێشەوایەتی و نەدەسەڵاتدارێتی بە پشتاو پشت بۆ کەس نابێت، نەبەهێزو نەبەناکۆکی نانەوەو نەبەخۆشەپاندن، نە بەپێسپاردنی ئاینی و خوایی، بەڵکو ئەوە پەیماننامەیەکە لەنێوان دوو لایەندا لەسەر کۆمەڵێك مەرجی دیاریکراو، کە ئەوانیش گوێرایەڵی و ملکەچی کردنە بۆ فەرمانەکانی پێشەوا، بەرامبەر بە ئەنجامدان و ئیدارەکردنی کاروباری دەوڵەت و سیاسەتی گشتی گەل بە شێوەیەکی دادگەرو یەکسان وەك ئەوەی لەقورئان و سوننەتدا هاتوە، پابەندبوون پێوەیانەوە دەرنەچوون لە ئەحکامەکانی و پابەندبوون بەراوێژو رای گەلەوە، ئەم پەیوەستننامەیە کەکۆمەڵێك ئەحکامی تیۆری لەخۆدەگرێت کە هەردوولا پەیوەست دەکات بەکۆمەڵێ

خالّو زەوابیتی بریارلەسەردراوەوە، بەبیّ ئەوەی هیچ پەستان و زۆرەملیّ و ناچارکردنی تیادابیّت و بەلّکو بەویست و هەلّبژاردنی تاکە، وەك چۆن هەلّدەوەشیّتەوە لای هەریەك لەم بەشدارانەی پەیوەستنامەکە بەپیّی کۆمەلّیّك زەوابیتی بریارلەسەردراو، وەك هەر پیوەستنامەیەکی ترە، بەلاّم بەفراوانتر رەفتاری تیادەردەکەویّت، بۆ پیّشەوایە داوای هەلّوەشاندنەوەی ئەو پەیوەستنامەیەکە بکات و خۆی جویّبکاتەوە لیّی، بەهەمان شیّوەش بۆ گەلە هەمان شت ئەنجام بدەن و پیّشەوا لادەن و پەیمانەکە هەلّبوەشیّننەوە، هەریەکەیان چووە دۆخی بارودۆخی نائاسای وەك ئەوەی شایستەیی کرداری نەمیّنیّ وەك شیّت بوون و ئیفلیجبوون و نەتوانینی جیّبەجیکردنی خالّەکانی پەیوەستنامەکە، و هەرشتیّ تر لەوبارەوە، یان لە ئیسلام دەرچوون و دوورکەوتنەوە لەو پایە بنچینەیی و ئەحکامە برِاوانەی شەریعەت.

ئەمە بنچینەی سیّیەمی بنەماکانی گوتاری سیاسی راشیدینە، پەیوەندی گەل و پیّشەوا لەسەر بنەمای پەیمانیّك و پەیوەستنامەیەکە، کە گەل بنچینەیە تیایدا، پیّشەوا بریکارە لەبری ئەوان کاروبارەکان جیّبەجیّدەکات، نە دەسەلاّتداری و نە فەرمانرِەوایەتی بە پشتاو پشت یان بەراسپاردەی خوایی نابن و نە بەململانیّ و ناکۆکی و شەرِ یەکلادەکریّنەوە، بەلّکو بەبەستنی پەیمانیّك لەنیّوان گەل و پیّشەوادا دەکریّت، بەمە دەبینین ئیسلام پیّش رۆژئاوا کەوتوە لەم پرانسیپەدا، لەدیاریکردنی بنەمای فەلسەفی ئەوەی کە بنەمان بۆ پیادەکردنی دەسەلاّت و ئەرك و دەسەلاّتەکانی سەرۆك بەپیّی تیۆری پەیمانی

کۆمەڵایەتی، کە گەل واز لە دەسەڵاتەکانی خۆی و ئازادی خۆی دەهێنێت بە ئارەزووی خۆی و بەرامبەر بە ئیدارەدان و بەڕێوەبردنی گشتی وڵات بۆ کەسێك یان چەند کەسێك کە بەرژەوەندی گشتی لەبەرچاو دەگرن، وەك فەیلەسوفی ئینگلزی (جون لوك–١٧٠٤م) لە کتێبەکەیدا (پەیمانی کۆمەڵایەتی) باسی کردوە، لەگەڵ کورتهێنانی ئەم تیۆریایە لە جێگرکردنی بنەمای فەلسەڤ بۆی، هەروەها کەی و چۆن ئەو پەیمانە دەبەسترێت.

ئیسلام پێش ئەوانی تر کەوتوە لە پرەنسیپی پەیمانی کۆمەڵایەتی نەك لەسەر بنچینەی تیۆری، بەڵکو لەسەر بنەمای واقعی و کردارەکی، یەکەم پەیمانی کۆمەڵایەتی کە دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر دامەزرا بریتی بوو لەپەیمانی عەقەبە کەلەسەر بنچینەی ئەو بونیادی دەوڵەتی پێغەمبەر نرا،کەپاش ئەوە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کۆچی کرد بۆ مەدینە، تاوەکو پیادەی دەسەڵاتەکانی بکات لەسەر بنەمای ئەو پەیمانە، کە خەڵك ی مەدینە بەخوایشتی خۆیان پەیمانیان دا، کەپێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) پێشەوایەتیان بکات ئەوانیش ملکەچ و گوێرایەڵی بکەن لەکاتی خۆشی و ناخۆشی و تەنگانە و ڕۆژانی ئاساییدا، لەپەیماننامەکەدا بەدرێژی هاتوەو ئێشتریش ئاماژەیەکمان پێدا، دواتریش، نووسینی پرۆتۆکۆلێکی سیاسی مەدینە (صحیفە مدینە) کەلەگەڵ هەمووپێکهاتەکانی تری مەدینە کراوە، وەك دەستورێك کە کاروبار و پەیوەندییە جۆربەجۆرەکانی خەڵکی ئەو شارە دەوڵەتە

ڕێكدەخات لەكەڵ دەسەڵاتە نوێكەیدا ڕێكدەخات و ماف و ئەركەكانیان دەستنیشاندەكات.

ئەو (پەیمانی كۆمەڵایەتی)یەی بۆ درووستكردنی دەوڵەتی ئیسلامی ئەنجامدرا وەك ڕاستیەكی مێژوویی خۆی لە پەیمانی عەقەبە و پرۆتۆكۆلی مەدینەدا خۆی نواند، ئەنجامدرا هەمووی بەرەزامەندی هەردوو بەشداری پەیماننامەكە، یەكەمینیان لەنێوان پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) و پشتیوانانی خەڵكی مەدینە، دوەمیان لەنێوان ئەوو لەنێوان هەموو خەڵكی مەدینە ئەوەی بروای بە پێغەمبەر هێناوەو ئەوەیش بڕوادار نییە بەو، پشتیوانان لە یەكەم كۆبوونەوەیاندا لە عەقەبە وتیان بەپێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم): (ئێمە وازمان لە هۆزەكەی خۆمان هێنا، هیچ هۆزێكی تر لەنێوان ئێمەدا دوژمنایەتی جەنگی نییە نەكەوتوەتە نێوانیان، دەخوازین بەتۆ كۆببنەوە، ئێمە ئەم بانگەوازەی تۆ دەخەینە بەردەمیان و دەخوازین وەریبگرن، ئەوەی ئێمەش وەك وەڵام بەتۆمان دا سەبارەت بەو ئاینەی تۆ بۆ ئەوانی دەخەینە ڕوو، ئەگەر ئێمەو ئەوان كۆببینەوە لەسەر ئەوەی كە لەگەڵ تۆ پەیمانماندا ئەوە كەسێكی تر بەئەندازەی تۆ سەربەرز و سەركەوتوو نابێت)[1] ئەوان رەزامەندی هۆزەكەی خۆیان بەمەرج گرت و وەڵامی ئەو هۆزەیان بۆ بانگەوازەكەی بۆ ئەوەی رەزامەندی گشتی بەدێبیهێنن.

---

[1] ابن اسحاق في المغازي كما في تهذیب ابن هشام ٢٧٦/٢، وحسن اسناده الالباني في حاشیة فقه السیرة ص ١٤٦...الخ.

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) لەگەڵ پشتیواناندا دوو بەیعەتی جیاوازی کردوە: یەکەمیان لەسەر باوەر بە خوای تاکو تەنها هاوبەش دانەنا بۆی و گویرایەڵی کردنی، بەیعەتی دووەم لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی و بەرگریکردن لێی کە بەبەیعەتی جەنگ نادەبرێت، لەسەر ئەو بنەمایە دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراو پێغەمبەری خوا چوەمەدینە دەوڵەتی دامەزراند کودەتای سەربازی نەکرد، هەروەها شۆرشی جەماوەری ئەنجام نەدا، بەڵکو بە پێی پەیمان و رەزامەندی هەموولا. قورئانی پیرۆز جەخت لەسەر ئەم راستیە دەکاتەوە دەفەرموێت: (فلا وربك لا یؤمنون حتی یحکموك فیما شجر بینهم).(١)

قورئانی پیرۆز ئەوەی سەلماندوە کە لە مەدینەدا موسڵمانان ئەوانەن کە پێغەمبەر دادوەری و فەرمانڕەواییان دەکات و باوەریان پێی هەیە، ئەوەش پوختەی ئەو پەیمانی شایەتمانەیە بە پێغەمبەریان داوە، ئەوان توانای ئەوەیان هەیە و خاوەنینی لەوەی کە دادگایی کردن و ببەنە لای کەسێکی ترو پشت لەم بکەن، وەك ئەوەی خەڵکی مەککە کردیان، وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: (لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ) دیارە ئەو پشت تێکردنە لەبازنەی ئیمان دەیانکاتە دەرەوە دەچنە بازنەی هاوبەشگەراییەوە بۆخوا، لەبەرئەوە ئەمان چەند جار بەیعەتیان بەپێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) داوە کەلە کاتی ئاسایی و ناڕەحەتیدا

[1] النساء ٦٥.

لەگەڵی بن و گوێڕایەڵی بکەن، ئەوەش بەپێی خاڵەکانی عەقەبە کە جەختکردنەوە بوو لە گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ فەرمانەکانی پێغەمبەر.

دیارە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) پاش ئەوە چەندین هۆزو خێڵو بنەماڵە دەهاتن ئارەزوومەندانە پەیمانیان بەپێغەمبەردەدا کە پابەندی بڕیارەکانی پێغەمبەر بن و بەشداری دەوڵەتی ئیسلامی بن، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە پەیوەندی دروستبوو لەسەر بنچینەی ڕەزامەندی و پەسەندی لایەنەکاندا بوە، وەك نوێنەرانی کەنانە هاتنەلای پێغەمبەر لەساڵی نوێنەران و هەروەها لەگەڵ نوێنەرانی عامری کوڕی صەعصەعە نوێنەری عەقیلی کوڕی کەعب و وەفدی مزینەو هتد[(١)].

بۆ ڕۆشنی ئەو بنەمایە، هەروەها پێشەوایەتیەك بوونی نەبوو تەنها پاش پەیماننامەی عەقەبە، کە هاوەڵانی پێغەمبەر (ر.خ) دەستپێشخەری بۆ ئەنجامدانی پەیماننامەیەك بۆ متمانەبەخشین بە خەلیفەی یەکەم و هەڵبژاردنی، ئەبوبەکر نەبووە خەلیفە تا ئەوکاتەی کە پەیمانی بەیعەتی بۆ سازنەدرا، هیچ هێزو دەسەڵاتێکی وای نەبوو لەنێو هاوەڵاندا پیادەی بکات وەك خەلیفەی موسڵمانان تەنها بەپێی ئەو پەیمانە نەبێت کەهەموان (هاوەڵان) بەرەزامەندی دانیان پێنابوو بەشداریان تیاکردبوو، سەرەتا ئەهلی حەل و عەقد لەسەقیفەی بەنی ساعیدە، پاشان هاوەڵان هەموو لە بەیعەتی گشتیدا لە مزگەوت.[(٢)].

---

[1] انظر طبقات ابن سعد ٢٢/١.

[2] انظر صحيح البخاری–مع الفتح–٢٠٦/١٣ ح٧٢١٩.

ئیبنو مەسعود دەڵێت: (ئەوەی کە ئیمانداران تێکرا بە چاکە بینیان ئەوە لای خوای پەروەردگاریش چاکە، ئەوەی موسڵمانان بەخراپ بینیان ئەوە لای خوای گەورە خراپە، هاوەڵان هەموویان هەڵبژاردنی ئەبوبەکریان پێ باش و چاك بوو وەك خەلیفە)[1] و هەڵبژاردنی خەلیفە لەلایەن موسڵمانانەوە بە ویست و راوێژی هەموولایان ئەوە لە و دینەوە سەرچاوەی گرتوە کە خوای گەورە رەزامەندبوە کە دینیی ئەوان بێت، ئەگەر بایەخی ئەو هەڵبژاردنە نەبا و ئەو پەیمانەو پێویست بوونی نەبان ئەوا پێش ئەوەی کە دفنی لاشەی پیرۆزی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بکەن هاوەڵان ئەوەندە خۆیان خەریك نەدەکرد پێوەی. دیارە بانگەوازێك و خولڵکێکی گشتی کرابوو بۆ بەستنی ئەو پەیماننامەیە ئەوانەی لەسەقیفە و مزگەوت هەبوون هەموویان بانگکرابوو کەئەمەش بەڵگەی پێویستی ئەو پەیمان و بەیعەتەو ئامانجەیە.

هەروەها دوای ئەو عومەر نەدەبوە خەلیفەی موسڵمانان کە هێشتا ئەبوبەکر لەسەر جێگەدا بوونەخۆشی مەرگ بوو، پاش ئەوەی راوێژی بە موسڵمانان کرد و ئەوان بە خۆهەڵبژاردنی عومەر بۆ خەلیفە رەزامەند بوون، پاشان چوەناو خەڵکی و بەنەخۆشیەوەو راوێژی پێکردن، پێی وتن: مەگەر ئێوە رازین بەوەی کە پاش خۆیم کەسێکتان بۆ دیاری بکەم بیکەن بەخەلیفە، سوێند بەخوا من ناتوانم، توانای ئەنجامدانی

[1] رواه الحاكم فی المسندرك علی الصحیحین ح٤٤٦٥.

ئەم ئەرکەم نەماوە، منالّی خۆیشم لەدوای خۆم دانانێم و نایکەم، شوێن رای ئەم و ئەویش نەکەوتووم، کەس لە خزمانیشم دانانێم)[1].

لە ریوایەتێکی تردا هاتە ناو هاوەڵان ڕووی تێکردن لەکاتی نەخۆشیەکەیدا وتی: (ئێوە رازین بەوەی کەمن بیکەم و لاتان پەسەندە؟ وتیان بەڵێك وتیان بەڵێ ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا)[2].

بۆیە ئەبوبەکر بۆ هەڵبژرادنی عومەر لەپاش خۆی راوێژی بەهاوەڵان کردو رەزامەندی هەموانی بۆ وەرگرت بەوەی کە کردی نوێنەری هەڵبژێراوی خۆی، دیارە عومەریش پاش ئەوەی رەزامەندی گشتی پێدرا لەلایەن هەموانەوە و بوە خەلیفەی پاش ئەوەی ئەبوبەکر (ر.خ) کۆچی دوایی کرد، لەبەر ئەوە ئیبن و تەیمیە سەبارەت بە خەلافەتی ئەبوبەکر باس دەکات وکەنەبوە بەخەلیفە پاش بەیعەت نەبێت و دەڵێـت: عومەرو هاورێکانی ئەوکات بەیعەتیان دا بە ئەبوبەکرو بەڵام دواتر هەموو هاوەڵان ئەگەر رەتیان بکردایەتەوە ئەوە نەدەبوو بەپێشەوا، بەڵکو دەبوە پێشەوا بە بەیعەتی ئەو هاوەڵانەی کە خاوەنی شەوکەت و توانا بوون)[3].

هەروەها سەبارەت بەخەلافەتی عومەر دەڵێـت: کاتێك عومەر بەو پەیمانەی کە ئەبوبەکر پێیداو کردیە جێنشینی خۆی و هەڵیبژارد ئەو کات عومەر بوبە پێشەوای ئەوەی کەبەیعەتی پێدەداو ملکەچی دەبوو،

---

[1] السنة للخلال رقم ٣٣٨،وطبقات ابن سعد١٤٨/٣.

[2] رواه الحاكم فى المستدرك على الصحيحين٨٥/٣ ح٤٤٦٩.

[3] منها السنة٥٣٠/١.

خۆ ئەگەر قەدەری وابوایە ئەو پەیمانەی ئەبوبەکر جێبەجێ نەبوایە و ئەوانی تر بەیعەتیان پێنەدابا ئەوە نەدەبوە پێشەوا)[1].

ئەمەش دڵنیابوونەوەیە لەوەی کە پەیماندانی خەلیفەکان بە ئەوەی دوای خۆیان کاندیدکرنێکەو هیچی دیکە، ئەوە گەلە بریاردەدات لەسەر ئەوەی کە ئایادەبێت بە پێشەوایان یان رەتی دەکەنەوە، جەماوەر زۆرینەیەو واتە زۆرینە بریار لەسەر یەکلاکردنەوەی کاندید دەات لەکاتی هەبوونی ناکۆکی و کاندیدی زیاتر، هەروەها رەتکردنەوەی بۆچوون و رای کەسێك بۆ هەڵبژاردنی پێشەوا.

دیارە عوسمان نەبوو بە پێشەوا و خەلیفە تەنها بەکاندیدکردنی عومەر لەو شەشە، هەروەها بەرەزامەندی ئەو پێنجەی تریش نەبوو، بەڵکو بە خەلیفەبوونی پاش ئەوەهات کە هاوەڵان تێکرا بەیعەتی گشتیان پێدا لەمزگەوتدا، وەك ئیبن تەیمیە دەڵێت: (عوسمان نەبوە پێشەوا تەنیا بەکاندیدکردنی هەندێك کەس لەهاوەڵان بەڵکو ئەوە بەیعەتی گشتی خەڵکی کردی بەپێشەوا، چونکە هەموو موسڵمانان بەیعەتیا بەعوسمان دا و یەك کەس نەبو بەشدارنەبێت، ئیمام ئەحمەد دەڵێت: هیچکەس نەبوو بەیعەت بەعوسمان نەدا و بۆیە بۆ بەیعەتدان بە عوسمان کۆڕای هەمووڵای لەسەربوو)[2].

---

[1] المصدر السابق

[2] المصدر السابق ٥٣٢/١.

عەبدوڵای کوڕی ئیدریس دەڵێت: (هیچ کەس بە ئەندازەی عوسمان بەیعەت و پەیمان پێدانەکەی جێگیرو بەرەزامەندی نەبوو، کاندیدکردنەکەشی لەناو شەش کەس لە ئەهلی بەدر بوو)[1].

هەروەها خەلیفەی راشید عەلی (ر.خ) نەبوو بە خەلیفە پاش پێدانی بەیعەت نەبێت بۆی.

لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ئەوە پشتراستکراوەتەوە کە کاتێك عوسمانیان لەماڵەکەی خۆی چواردەوردا: (پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) کاتێك گیانی پیرۆزی سپارد، موسڵمانان تەماشایان کرد کە کامیان باشترینە بیکەنە خەلیفە، ئەویش ئەبوبەکر بوو، کاتێك ئەبوبەکر گیانی سپارد، موسڵمانان تەماشایان کرد کە کامیان باشترینە بیکەنە خەلیفە پاش ئەو، ئەوەبوو عومەریان هەڵبژارد، کاتێکیش عومەر گیانی سپارد، موسڵمانان تەماشە یان کرد کەکامیان باشترینە بیکەنە خەلیفە پاش ئەو، عوسمانیان بەشیاو زانی بۆ ئەوە، خۆ ئەگەر ئەو بیکوژن دەبێت لەو چاکتر بهێنن)[2].

ئەمە جەختکردنەوەیە لەوەی کە گەل هەمووئەو خەلیفانەی هەڵبژاردووە، بەو پێیەی ئەوان بەشیاوترو باشتر زانیوە بۆ ئەو پێگەیە، ئەگەرچی هاوەڵان جیاوازیان لەو میکانیزمانەی کاندیدکردن و جۆری هەڵبژاردنانە هە بوە، بۆنموونە هاوەڵان ئەبوبەکریان لەسەقیفە بەراستەوخۆ هەڵیان بژارد، عومەر هەڵبژێرا بەراوێژ لەگەڵ ئەبوبەکرو

---

[1] السنة للخلال رقم٤٠٩.

[2] رواه عبدالله بن احمد فی زیاداته علی فصائل الصحابة رقم ٣٩٢ باسناد حسن.

بەکاندیدی ئەو ڕەزامەندی خۆی پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات، پاشان پەیمانی بەیعەتیان پێدا پاش ئەوەی ئەبوبەکر کۆچی دوایی کرد بە بێ هیچ ناچاری زۆرەملێیەك، هەروەها بەخلیفە بوونی عوسمان لەپاش ئەوەوە هات کە عومر پێش ئەوەی گیانی بسپێرێت، شەش کاندیدی دیاریکرد بۆ پاش خۆی، پاشان خۆیان یەکلای بکەنەوە، پاشان بیخەنە بەردەنگدان و ڕەزامەندی گشتیەوە ئەوەبوو گەل عوسمانی هەڵبژارد، بۆیە دەبینین گەل هەمووی هەڵبژاردوە وەك لەم ریوایەتەی ئیبن و عومەرەوە هاتوە.

هەروەها ئەوەی دەست بۆ کاندیدکردنی براوە لەلایەن پێشەوای پێش خۆیەوە، بە پێشەوا هەژمار نەکراوە تەنیا بەوەی پەیمانی پێدراوەو کاندیدکراوە لەلایەن خەلیفەکەی پێش خۆیەوە، بەڵکو بونە خەلیفەیی وابەستە کراوە بە بەیعەت و ڕەزامەندی گشتی گەلەوە، ئەوبو یەعلای حەنبەلی دەڵێت: (پێشەوایەتی تەنیا بەپەیمانوەرگرتنی ئەوەی پێش خۆی و کاندیدکردنی لەلای ئەوە دانامەزرێت، بەڵکو پێشەوای بە بەستنی ئەوپەیمانە ڕاشکاو ئازادانەیە کە دەبەسترێت لەلایەن موسڵمانانەوە لە بۆی دەبێتە پێشەوا)[1]، هەروەها دەڵێت: پەیمان پێدان و کاندیدکردنی لەلایەن هەرکەسێکەوە مانای بەیعەت ناگەیەنێت و نابێتە پێشەوا)[2]، بەڵکو ئەوە تەنها کاندیدکرنێکە ئەوەش دەوەستێتە

---

[1] الاحكام السلطانية من ٢٠.

[2] المصدر السابق.

سەر ئەوەی ئایا گەل بەتێکراو زۆرینە پەیمانی بەیعەتی پێدەدەن دوای ئەوە.

لەبەر مەترسی ئەو بەیعەتەو بایەخ و گرنگیەکەی، هەمو خەلیفەکان لە سایەیدا سووربوون لەسەر وەرگرتنی شەرعیەت بۆ دەسەڵاتەکەیان و بەیعەت وەرگرتنیان لەگەل ئەگەرچی ئەوەشیان لەلا قورس بووبێت؟!

پەیوەستنامەی بەیعەت وەك هەر پەیمانەوە پەیوەستنامەکانی دیکە، ئەو شتانەی تیادا بەمەرج دەگیرێن کەدوولایەن بەمەرجی دەگرن، هاوشێوەی پەیوەستنامەی بریکاری، دیارە لەمەدا گەل بنچینەیە، ئەوەی کەگەل بە پێشەوا دەیگرێت ئەو بریکاریەتی لەبری ئەو هەڵدەستێت بەوەی کە لەسەر بڕواداران واجبکراوە لە بابەتی دادگەری و یەکسانی و ماف و ئەرك و حدوودەکان و بەرژەوەندی کە ئەمانە پێشەوا لەبری گەل بەپێی ئەو مەرجانەی لە بەیعەتەکەدا هاتوون جێبەجێیان دەکات.

بریکاری لە بری خاوەنی مافی راستەقینە هەڵدەستێت بەوەی یەکەم پێویستیەتی ئەوی دووەم لەجیاتیدا رایپەرێنێت، لە کتێبە فیقهیەکانەکان جیاوازیەك لەنێوان (وکیل– بریکارو، نیابە– نوێنەر) دا نییە، هیچ جیاکاری و پۆلێنێکیان بۆ ئەم دوانە نەکردوە، بۆیە بریکاری بەمانای نوێنەری دێت.

ئەوەش پشتراستکردنەوەیەکە بۆ ئەوەی کە راستەقینە لە بەستنی بەیعەتدا ئەوەیە کەگەل دەیبەستێت و ئەوەی ویستی لەسەرە لەوەی کەدەیەوێت ئەنجامی بدات بۆی دیاریدەکات. ئەوەش هیچ کەسێك

نکوولی لێناکات. تەنانەت (الخطاب المؤول) ماوەردی کەدەڵێت: (ئەگەر ناکۆکی کەوتەوە لەسەر پێشەوایەتی، هەریەك لەوانەی دەیانخواست بەوەی ئەویان لەسەر راستەقینەو لەپێشترە بۆی، پێویستە گویٚ بۆ ئەو خواستەیەان نەگیرێت، بەیعەتیان پێنەدرێت، چونکە ئەوان مافیان نییە خۆیان خۆیان بکەنە پێشەوا، بەڵکو ئەوە مافی موسڵمانان و خەڵکیە بەگشتی، سوێندان هیچ حوکمێکی نییە و بەخشینی یەکێکیان لەنێوان خۆیاندا بۆ ئەوی تر ناخوات، کاتێك یەکێکیان خۆی کشاندەوە بۆ ئەوی تر، بەوەش ئەوی دیکەیان کارەکەی ناوەستێت، چونکە ئەوە مافی خەڵکە کیٚ و کامیان جێگیر بکات لەو پێگەو پۆستەدا.[(1)]

لێرەدایە ماوەردی حوکمی پەیمان و بەیعەتدان بە دووپیاو بە بیٚ زانینی و ئاگایی پێشتری خۆیان، کە گویٚ ناگیرێت بەخواست و داوای هیچ کام بەوەی ئەوی تر یان لەپێشترە، سوێندخواردن و پەیمانەکەیان پەسەند ناکرێت، لەبەر ئەوە بۆ ئەو نییە کەسوێندلەسەر شتیٚ بخوات کەئەو خاوەنی نییە و مافی نییە دەستوەردانی راستەقینەی تیابکات، چونکە پەیمانی پێشەوایەتی تەنها مافی موسڵمانانە بەگشتی تابیبەستن، بەهەمان شێوە ئەگەر یەکێکیان دانی نا بە پێشەوایەتی ئەوی تردا بەوەی کە ئەو لەپێشترە دووبارە ئەوەش لێی وەرناگیرێت! بەڵکو ئەوە تەنها لەبابەتی پێشەوایەتیدا ئەوەیان دەکرێتە دەرەوە بەو دانپیانانەی بەوەی کەخۆی لەپێشتر نییە، پاشان دیسان پێشەوایەتیش تەنها بەو

---

[1] الاحکام السلطانية ص١٠.

قسەیەی ئەو جێگیرناکرێت بۆ ئەوی تریشیان چونکە لە بنچینەدا بریاری ئەوان هیچ هەمیەتێکی نییە، لەبەر ئەوە خاوەنی بریاری ئەوەڵ و کۆتایی هەر گەلە.

دیسان ئەگەر خەصڵەتەکانی پێشەوایەتی بەتەواوی لەکەسێکدا بوونیان هەبێت، بەمەش ناتوانێت ببێتە پێشەوا و ناکرێت، وەك ماوەردی دەڵێت: چونکە پێشەوایەتی تەواو نابێت ئەگەر بەشدارانی پەیوەستنامەکە ئامادە نەبن و رەزامەندی نەنوێن و ئەنجامی نەدەن، وەکو دادوەری وەها ئەم کارەش بۆنموونە ئەگەرچی تەنها کەسێك شایەن وباش بێت بۆ دادوەری کردن، بەڵام خۆئەگەر دادوەری نەکات و ئامادە نەبێت پۆستەکەوەربگرێت و ئەنجامی بدات چی؟)[1].

بۆیە ئەبو یەعلای حەنبەلی لەوبارەوە دەڵێت: (بەڵێ بەو شێوەیەیە پەیمانی پێشەوایەتی و بەیعەت پێدانی، چونکە ئەو پەیمانە تەواو نابێت ئەگەر بکەرەکانی پەیمان و ئەنجامدەرانی بوونیان نەبێت، وەکو دادوەری وایە کەسێك نابێت بەدادوەر تا ئامادەنەبێت بۆ دادوەری وەری نەگرێت ئەو پۆستە، بۆیە خۆناشکرێت بەدادوەر ئەگەرچی هەموو خەصڵەت و مەعریفەیەکی دادوەری تێدا بێت، بۆیە بۆ پێشەوایەتیش بەهەمان شێوەیە.[2]

قەلقەشەندی لەوبارەوە دەڵێت: (پێشەوایەتی دانامەزرێت مەگەر بەبەستنی ئەهلی حەل و عەقد، چونکە پێشەوایەتی پەیوەستنامەیەکە

---

[1] الاحكام السلطانية ص٩.

[2] الاحكام السلطانية ص ٢٤.

جێبەجێنابێت ئەگەر ئەنجامدەری پەیمانەکە ئامادە نەبێت، ئەوەش هەموو جەماوەری زانایان لەسەری کۆران و پشتی پێدەبەستن[1].

ئەمانە هەمووی ئەوە دەردەخەن کە پەیماننامەوبەیعەتی پێشەوایەتی وەك هەمو پەیمان نامەو پەیوەستنامەکان وایە، بەتایبەتی وەك پەیوەستنامەی بریکاری وایە (بریکارنامە)، پێشەوا لەبری گەل بریاردەدات و کاروبارە گشتیەکان لەسەر شان دەگرێت، بۆیە گەل خۆی هەڵیدەبژێرێت و هەرکاتیش بیەوێت مافیەتی بەرکەناری بکات، ئەمەش بنەمایەکی سەرەکیە لەگوتاری سیاسی راشیدین کەرۆشن و بەرچاوبووە لەسەردەمی خەلیفەی راشیدیندا، پاشان کۆڕای هاوەڵانی پێغەمبەری لەسەربوە بەبڕاوەیی، بۆیە دەبینین مەعاویە نەیتوانی ببێتەخەلیفە تا ساڵی کۆمەڵبوونەکە نەبێت. کەتێکرای گەل کۆك بوون لەسەری و بەیعەتیان پێدا پاش ئەوەی حەسەنی کوڕی عەلی (ر.خ) بەیعەتی پێدا، کەئەبوموسلیمی خەولانی چوە لای وتی پێی: سڵاوت لێبێت ئەی ئەجیر (بریکار) وتیان پێی بڵێ ئەی ئەمیر، وتی نەخێر بریکار[2].

ئەمانە ئەوە پشت راستدەکەنەوە کەپەیمان و بەیعەتی پێشەوایەتی لە دیدی هاوەڵان و تابعینەوە بریتیە لە پەیماننامەیەك کە هاوشێوەی بریکارنامەیە، پێشەوا وەك بریکار و جێگرێك کەلەبری یەکێتر کارەکە رادەپەرێنێت، لەبەر ئەوەبوو کاتێك مەعاویە ویستی یەزیدی کوڕی کاندید بکات و بیکاتەوە جێگرەوەی خۆی پاش خۆی، داوای کرد لە

---

[1] ماثر الانافة فی معالم الخلافة ١،/٤٧-٤٨.

[2] رواه ابو نعیم فی حلیة الاولیاء ٢/١٢٥.

ئیبن و عومەر کەبەیعەتی بداتیٚ، ئەویش پێی وت: (من پیاوێکم وەك ئەو پیاوانەو ئەوانە هاتن و بەیعەتیان دا بەو ئەوە دیارە منیش یەکێك دەبم لەوان)، هەروەها وتی: (سوێند بەخوا ئەگەر موسڵمانان کۆك بن لەسەر ئەوەی کە بەندەیەکی حەبەشی بکەنە پێشەوا و بەیعەتی پێبدەن منیش جیانابمەوە گەل و دەچمە ناو بەیعەتەکەوە)[1].

ئیبنو عومەر پرسی دیاریکردنی پێشەوا دەگەڕێنێتەوە بۆ گەل، ئەگەر گەل هەڵبژاردو ڕەزامەندی نواند لەبارەیەوە ئیتر ئەمیش دەچێت لەگەڵی، ئەمەش پشتراستکردنەوەی ئەوەیە کەمافی دیاریکردنی پێشەوا بەتەنها هی گەلە، هەروەها ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ سووربوونی مەعاویە لەسەر پرسی بەیعەت و وەرگرتنی ڕەزامەندی گشتی بۆ یەزیدی کوڕی، کە مانای بایەخ و گرنگی بەیعەت دەگەیەنێت لای ئەویش. هەروەها شەرعیەت و ڕەوایی هیچ پێشەوایەك بێ بەیعەت بوونی نییە، مەعاویە لەبەرئەوەی خۆی خەلیفەیە ! بەس نییە بۆی کەدەستکراوە بێت لەوەی کە کوڕەکەی بکات بە خەلیفەو بیسەپێنێت، ئەو کاندیدکردنەی مەعاویە بۆیەزید مادام بەیعەتی گەل و ڕەزامەنی گەلی لەسەر نییە، بەهایەکی نییە، لەبەر ئەوە بووە سوور بوە کەبەیعەتی بۆ وەربگرێت، چونکە پێویست بووە.

لەدەڤ فیقهی شەرعناساندا پێشەوا وەك بریکارێکی گەل هاتوە، بۆنموونە لە (کشاف القناع عن متن الاقناع) فیقهی حەنبەلیدا هاتوە:

---

[1] ابن جریر الطبری ٣/٢٤٨.

(ڕەفتارو هەڵسوکەوتی — واتە پێشەوا— بەرامبەر خەڵکی بەرێگەی بریکاری وەك بریکاری ئوممەتە، بریکاری گشت موسڵمانانە، بۆی هەیە ئەو خۆی بەرکەناربخات و عەقدەکە هەڵوەشێنێتەوە، یان (ئەهلی حەل و عەقد– بۆیان هەیە دەسەڵاتی لێوەرگرنەوە، ئەگەر داوای کرد، پەسەندی بکەن، وەك ئەو وتەیەی ئەبوبەکری صدیق (ر.خ) داوای کرد لێیان، بەرکەنارم کەن بەرکەنارم کەن، ئەوان وتیان پەسەندی ناکەین و بەرکەنارت ناکەین)[1]

ئیمامی عەلی (ر.خ) فەرمووی: پاش ئەوەی داوای خەلافەت کرا لەو سیانەیکاندید بوون بۆی و دواتر بەیعەتیان بە ئەبوبەکر دا، ئەویش دواتر هاتە قسەو وتی هەرکەس داوای وازهێنانیشم لێبکات ئەوە وازدەهێنم، منیش وتم سوێند بەخوا نەبەرکەنارت دەکەین و نەداوای وازلێهێنانت لێدەکەین، ئەی ئەو کەسەی بویتە شوێنکەوتە یەك، کە پێغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) پێشتکەوتوەکەتە)[2].

ئەوانەی کەدەڵێن ئەگەر ئەهلی حەل و عەقد مردن، پێشەوا نابێت بەرکەنار بخرێت، بەڵگە یان ئەوەیە کە پێشەوا هەڵبژێراوو بریکاری هەموو گەلە نەك تەنها تاقمی حەل و عەقد، ئەوەش لە (کشاف القناع) دا هاتوە: پێشەوا بەرکەنار ناکرێت ئەگەر ئەوانەی بەیعەتیان پێدا مردن چونکە بریکاری تەنها ئەوانە نییە، بەڵکو هی هەموو موسڵمانانە)[3].

---

[1] کشاف القناع ١٦٠/٦.

[2] احمد فی فصائل الصحابة ١٣٢/١.

[3] المصدرین السابقین.

لەبەر ئەوە ڕێگەدراوە بە پێشەوا هەرکات ویستی داوای جیابوونەوە لەکاری پێشەوایەتی پێشکەش بکات لەگەل بە بیٚ هۆو ناوهێنانی هۆکارێك چونکە بۆ هەر بریکارێکە کە ئەو داوایە هەرکات بکات لە خاوەنکار (موکل)، وەك ئەبو یەعلای حەنبەلی وتویەتی: (چونکە پێشەوا بریکاری موسڵمانانە و مافی بریکاریشە هەرکات داوای جیابوونەوە لەکار بکات و خۆی لەکاربخات)[(1)].

هەر ئەمەشە کراوەتە بەڵگە بەسەر ئەو ئەمیرەی کە خەلیفە کردویەتی بە ئەمیری شوێنێك و پاشان خەلیفەکە مردوە و بەرکەنار ناکرێت، هەربەهەمان شێوەش دادوەر بەمردنی خەلیفە، چونکە قیاس دەکرێت لەسەر ئەوان لە وڵاتەکانیاندا چونکە دادگا نوێنەرایەتی هەموو موسڵمانانی زیندوو دەکات بەپێچەوانەی وەزیر، چونکە بەمردنی خەلیفە وەزیریش بەرکەنار دەکەوێت.[(٢)]

بەمانا مردنی خەلیفە تەنها بەرکەنارکردنی وەزیر بەدوودا دێت، بەوپێیەی وەزیر دارودەستەی خەلیفەیە، بەمردنی ڕاستەوخۆ ئەویش بەرکەناردەکرێت لە کارەکەی، بەپێچەوانەی دادگاکان و ئەمیری هەرێمەکان، کە بەرکەنارناکرێن و بەمردنی خەلیفە، و موسڵمانان زیندوون، چونکە میرنشینایەتی نوێنەرایەتی موسڵمانانە نەك خەلیفە و موسڵمانانیش نەمردوون و زیندوون، یاخود دەکرێت خەلیفەی نویٚ لەکارەکەی دووری بخاتەوە لەبەر هۆکارێك، نەك بەهۆی مردنی خەلیفەی پێشوو.

---

[1] المعتمد فی اصول الدين ص٢٤٠.

[2] الاحكام السلطانية للماوردی ص٣٧.

**بنەمای چوارەم: هیچ پەیمان وپەیوەستنامەیەك بە بێ ویست و ڕەزامەندی ناكرێت و نابێت هیچ ناچاركردن و زۆرەملێیەكی تیادا بێت:**

ئەمە بنچینەی چوارەمی لەبنەماكانی گوتاری سیاسی ڕاشیدین، ئەگەر پێشەوایەتی تەواو نەبێت بە بەیعەت و پەیوەستنامە نەبێت لەنێوان گەل و پێشەوادا، وە ئەگەر بەیعەتیش پەیوەستنامەیەك بێت وەك هەر پەیوەستنامەیەك كەپێویستی بەویست و هەڵبژاردن و ڕەزامەندی لەسەر بەندەكانی پەیوەستنامەكە هەبێت و هی هەردوولاش ئەوا هەرگیز بەیعەت بە پێشەوا هیچ ناچاریەك نابێت لەپشتیەوە هەبێت بەڵكو دەبێت تەواوی ویستی هەردو لایەنی تیا ئامادەبێت، چونكە ئەگەر لە پەیوەستنامەیەكی وەك كرین و مامەڵەی دارایی ڕەزامەندی هەردولا مەرج بێت بۆ تەندروستی پەیوەستنامەكە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (الا أن تكون تجارة عن تراض منكم)[1] ئەوا بۆ بەیعەت پرسی پێشەوا لەپێشترە.

شەریعەتی ئیسلامی هەموو جۆرە ناچاری و زۆرە ملێیەك و شێوازەكانی ڕەت دەكاتەوە لەوانەش:

١- ڕەتكردنەوەی ناچاركردن لە پرسی ئاین و گوێرایەڵی كردنی ئاینی: قورئانی پیرۆز جەخت لەسەر پووچەڵی هەموو ئەو جۆرە زۆرەملێ و ناچاریانە دەكاتەوە كە لەبواری ئاین و بەزۆر ئایندارکردن ئاینداریكردن و بەندایەتیكردن بۆ خوا بكرێت، خوای گەورە

---

[1] النساء.

دەفەرمویێت: (لا اکراه في الدین)[1]، هەروەها خوای گەورە بەپێغەمبەرەکەی دەفەرمویێت: (وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ)[2]. هەروەها نوح بەگەلەکەی دەڵێت: (قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَآتَانِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَارِهُونَ)[3].

٢- خوای گەورە هەموو هەژمارێکی لەسەر کاری بەناچار لەلایەن مرۆڤەوە ئەنجامبدرێت هەڵگرتوە: هەروەها هەموو شوێنەوارەکانی لەسەر لابردوە، هیچ حوکمێکی تاوانی بەدوویدا نایەت وەك لەفەرمودەدا هاتوە: خوای گەورە لەسەر گەلەکەی من ئەم هەژمارانەی هەڵگرتوە (هەڵەیەك بەنەزانی و لەیادچوون و کاری ناچاری).[4]

٣- پوچەڵی هەرکاروبارو مامەڵەیەکی دارایی کە بەناچاری ئەنجام بدرێت: ڕەزامەندی و خواستی دوولایەنە لەمامەڵەی دارایی بەمەرج گیراوە، خوای گەورە دەفەرمویێت: (الا أن تکون تجارة عن تراض منکم)[5]، هەروەها لەفەرمودەدا هاتوە: (کڕین و فرشتن دەبێت بە پێی ڕەزامەندی و خواستی هەردولا بێت)[6]، هەروەها لەفەرمودەیەکی تردا

---

[1] البقرة٢٥٦.

[2] یونس٩٩.

[3] هود٢٨.

[4] ابن ماجة ٢٠٤٣ و ٢٠٤٥.

[5] النساء ٢٩.

[6] رواه احمد ٥/٤٢٥.

هاتوه (بەهیچ شێوەیەك حەلال نییەماڵی كەسێك مامەڵەی پێوەبكرێت و لەگەڵی بكرێت ئەگەر بەرەزامەندی وخواست و حەزی خۆی نەبێت).

٤- ناچاركردنی ئافرەت بەزۆر لەلایەن كەسوكارو هەركەسەوە كەلە پیاوەكەی جویێ بێتەوە ئەگەر ویستی جیانەبوونەوەی خۆی نەبێت، وەك قورئان دەفەرموێت: (وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ)(١).

٥- پووچەڵی مارەیی ژن و هاوسەرگیریان ئەگەر ویستی ژنی بەتەواوی تیادا نەبێت: لە فەرمودەدا هاتوە: (كە خەنسای ئەنصاری باوكی بەزۆر دای بەشوو خۆی نەیدەویست شووبكات، كە بێوەژن بوو، داوای خۆی هێنایە لای پێغەمبەری خوا هەڵیوەشاندەوە)(٢). پرسیاریان لەپێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) كرد مەگەر بۆ مارەكردنی ئافرەتان دەبێت پرسیاریان لیێ بكەین و رەزامەندیان وەربگرین؟ فەرمووی بەڵێ. وتیان ئەگەر كچ بوو پرسیاری لیێ بكەن شەرمی كرد و بێدەنگی نواند ؟ فەرمووی بێدەنگی واتای مانای رێپێدانی ئەوە، لەریوایەتێكی تردا (بێدەنگیەكەی واتای رەزامەندیەتی)(٣)، هەروەها

---

[1] البقرة٢٣٢.

[2] صحیح البخاری ح ٦٩٤٦.

[3] صحیح الخاری ح ١٩٣٧.

دەفەرموێت: (هیچ بێوەژنێك مارە ناكرێت تا ڕەزامەند نەبێت و خۆی نەڵێت، كچیش مۆڵەتی بۆ وەربگیرێت و ڕەزامەندی بنوێنێت)[1].

٦- بڕینەوەی مناڵ لە شیر پێش دوو ساڵی ئەگەر ڕەزامەندی نوێنرا: واتە پاش ئەوەی ڕەزامەندی باوك و دایكی و ڕاوێژی ئەوان دەتوانرێت لە شیر ببڕێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ ۚ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ۗ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّا آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ..)[2].

٧- پووچەڵكردنەوەی هەموو ئەوناچاریانەی كەخرابوونە سەر ئافرەت لە سەردەمی نەفامیدا، یان ئەوەی كە پیاوەكەی مردبوو یان شووی بە كەسێك دەكرد، تاوەكوماڵەكەی وەرگرن بۆ خۆیان وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ)[3].

ئەگەر هەموو ئەمانە مەرجی ڕەزامەندی هەردوو بەشداربوی پەیوەستنامە و فاكتەری تەندروستی مامەڵەبن، ڕێپێدراوی تەواو درابێت

---

[1] صحيح البحاري ح ٥١٣٦.

[2] البقرة ٢٣٣.

[3] النساء ١٩.

به ئافرەت وەك بەشدارێكی تەواوی پەیوەستنامەكە خۆی ئیختیارو ڕەزامەند بێت وەك مەرج بۆ دامەزرانی نیكاحەكەی، دەشتوانێت هەركات بیەوێت داوای هەڵوەشاندنەوەی بكات، ئیتر چۆن لەپەیمانێكی گەورەی وەك بەیعەت ناچاركردنی لایەكانی بەشداربوو تیایدا ڕێپێدراوو شەرعی دەبێت؟

هەروەها چۆن گەل ناتوانێت تاك لایەنە ئەو پەیماننامەو بەیعەتە هەڵوەشێنێتەوە؟ پێشەوا لەكار لابدات؟

وەك چۆن خوای پەروەردگار ڕەتیكردوەتەوە كە بەندەكانی ناچار بكات كە پەرستشی بۆ بكەن، لەكاتێكدا ئەوانی بە ئازادی ژیان بەبەرا كردون و لەدایكبوونو هەروەها تاقیشیان دەكاتەوە – لەوەدا– ئیتر چۆن ڕازی دەبێت مرۆڤێكی هاوشێوەیان هەستێت بەستەم و بەناچاركردنیان بەوەی دەسەڵاتـیان لێ قۆرخ بكات بەزۆر بۆخۆی؟؟

خاوەنی شەریعەت بڕیاری داوە وەك لەفەرمودەدا هاتووە: (ماف بۆ هیچ ڕەگەزێكی ستەمكار نییە لەوبارەوە)[1]. فەرمانی كردوە بە پوچەڵكردنەوەی هەموو جۆرە خۆسەپاندنێك و گەڕاندنەوەی ماف و هەڵگردنی ستەم لەسەر هەر ستەملێكراوێك وەك لەفەرمودەدا هاتوە: (ئەوەی كردەیەك ئەنجام بدات فەرمانی ئێمەی و ڕەواپێدانی لە ئاینەوە وەرنەگرتبێت ئەوە ڕەتكراوەیە) لە ڕیوایەتێكی ترد هاتوە: (ئەوەی شتێكی نوێ بخاتە ناو ئاینەوە كە ئاینەكە خۆی تیایدانەبێت و نامۆ بێت

---

[1] ابو داود ح ٣٠٧٣.

ئەوە رەتكراوەیە)[1]. لە صەحیحدا هاتوە: (ئەوەی کە زۆرترین بێزراوە لای خوای گەورە ئەوەیە کە دەیەوێت شتێ بهێنێتە ناو ئاینەوە کە لە سوننەتی نەفامی بێت)[2].

ئیتر چۆن خۆسەپاندن بەسەر گەل و ئومەتێکدا رەت ناکاتەوە کە مافی بریاری لێزەوت دەکات سەبارەت بەژیان و کاروباری خۆی، کە کاری راوێژو هەڵبژاردن و مافی ئازادی و ئەو نەریتە خرابەی کە ئیسلام لەپێناوی نەهێشتنی هات کە نەریتی کیسراو قەیسەرو نەفامەکان بوو؟

بێگومان لە گرنگترین ئەو بیدعەو شتەنوییانەی کەسەرباری دین بکرێن لە بواری دەسەڵات و پێشەوایەتیدایە، وەك لە فەرمودەدا هاتوە: (علیکم بسنتی وسنة الخلفاء الراشیدین المهدیین، وایاکم والمحدثات الامور) کە سونەتی فارسەکان و رۆمەکان بوو پێچەوانەی رێنمونی و هیدایەتی پێغەمبەران و سونەتی خولەفاکانە.

بۆیە سەرکوتکردنی خەڵکی بەشمشێرو بەچەك و زۆر مامەڵکردن بەمافە راستەقینەکانی ئەو گەلەوە بەبێ ئارەزوو رەزامەندی ئەوان، بۆخۆی بریتیە لە کۆیلەکردنیان وزەوتکردنی ئازادیی ومافە ئینسانییە کانیان و یەکتاپەرستیەکەیان، چونکە ئەوە رۆشنترین جۆری خۆسەپاندن و سەرکوتکاریە کە ئیسلام هاتوە بۆ نەهێشتنی، چ موسیبەتێکە کە دەبینیت ئەمرۆ رەواییدراوە بە خۆسەپێنەکان چۆن

---

[1] صحیح المسلم ح ١٧١٨.

[2] صحیح البخاری ح رقم ٦٤٨٨.

تەراتێن بەماف و ماڵ و سەروەت و سامان و زەوی گەلەکانەوە دەکرێت و ئازادی و ژیان و ئەمرۆ و پاشەرۆژیان حەپەلووش دەکەن؟؟

لەکاتێکدا ئیسلام هات و کۆیلایەتی نەهێشت و دیلکردن و فرۆشتنی و مامەڵەپێکردنی حەرامکرد، ئیمرۆش هەمان کۆرای دەنگی جیهانی لەسەرە ئەمە، مەگەر ئەی بەکۆیلەکردنی گەلان وبەتالانبردنی سەرچاوەکانی ژیانیان و کۆنترۆڵکردنیان بۆ سەرۆکەکان سەندنەوەی مافی ئازادی لێیان کەنەتوانن داوای ژیانی خۆشیان بکەن، بێگومان سەردەمی کۆیلایەتی خراپترە بەڵام بەدیوێکی ترد، عەرەب دەڵێت ئەوەی قەرزری لای پاشاوەرگرت دەبێتە بەندەی، وەك لەقورئاندا سەبارەت بەنوئیسرائیل و وتەی ئەو خانەدانانەیان: (انؤمن لبشرين مثلنا وقومهما لنا عابدون) لێرەدا ملکەچی و گوێرایەڵبوونی بەنو ئیسرائیل بۆ فیرعەون و دارودەستەکەی بەزۆر و ناچاری وەك بەندایەتی باسی لێوەکراوە.

ئیتر چۆن لێکیدەیتەوە کەلە ئاینی یەکتاپەرستی دا بەندایەتی بۆ غەیری خوا بکرێت و رازی بێت، هەروەها ئیسلام ملکەچی و گوێرایەلیّ بەزۆر بۆ غەیری خوای پێقبوولّ بێت، رێخۆشکەربێت بۆ ئەوەی دەستوەردان لەژیان و ئازادی و مافە ئینسانی و داراییەکانیانی موسڵمانان‌دا بکات بە بیّ رەزامەندی خۆیان وبەناچاری زەوی ژیانیان لیّ داگیربکات ؟

دیارە هیچ جیاوازی و ناکۆکیەك لەنێوان هاوەڵاندا نەبوو لەسەر ئەوەی کەبەیعەت و دروستی بەیعەت لە رەزامەندبوونی گەلەوە

سەرچاوەی دەگرێت ئەگەر گەل بەرزامەندی و ئیختیاری خۆی ئەنجامی نەدات درووست نییە، بۆیە بوونی هەرناچاری یان زۆرەملێیەك پووچەڵی دەکاتەوە، لەبەرئەوەبوە ئەبوبەکر بەهاوەڵانی وت: (مەگەر ئێوە رازین بەوەی کەپاش خۆیم کەسێکتان بۆ دیاری بکەم بیکەن بەخەلیفە، سوێند بەخوا من ناتوانم، توانای ئەنجامدانی ئەم ئەرکەم نەماوە، مناڵی خۆیشم لەدوای خۆم دانانێم نایکەم، کەس لە خزمانیشم دانانێم، من عومەر هەڵدەژێرم (وەك کاندید) دوای من گوێی بۆبگرن و گوێ رایەڵی بکەن.) ئەوانیش وتیان: (بیستمان و گوێرایەڵ دەبین).[١]

لە ریوایەتێکدا هاتوە کە ئەبوبەکر ڕاوێژی بە کۆچەرو پشتیوانان کردوە و پاشان وتویەتی: (بەیعەتم دەدەنی لەوەی کە لەم نوسراوەدا هەیە؟ وتیان بەڵێ، هەندێکیان وتیان هەندێکیان ئەزانین چی تیایە، بۆیە هەموو دانیان نا پیایدا و رەزامەندیان نواندو ئەمجا بەیعەتیان پێدا)[٢]. لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: ئایا رازی دەبن کە من چی بکەم بۆ ئێوە؟ وتیان بەڵێ ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا)[٣].

ماوەردی جیاوازی نێوان فەقەهاکان باس دەکات لەوەی ئایا: ئایا بەمەرج گیراوە رەزامەندی ئەهلی حەل و عەقد لەکاتی داواکردنی خەلیفە بۆ دانانی کەسێکی تر لەپاش خۆی؟ دەڵێت: هەندێ لەزانایانی بەسرە وای بۆچوون کە رەزامەندی خەڵکی هەڵبژێرەر بۆ بەیعەتدانی

---

[1] ابن جرير الطبرى٢/٣٥٢.

[2] ابن سعد فى الطبقات ١٤٩/٣ من طرف عدة.

[3] رواه الحاكم فى المستدرك ٨٥/٣.

مەرجە لەوەی کە لازمی بکات لەسەر ئومەت و گەل، چونکە مافی ئەوانە، بۆیە ناتوانێت ئەوانیش پابەند بکات تەنها بە ئەهلی هەڵبژێراو نەبێت لەنێویاندا)[1].

ئەوەش راستەقینەیە کە ناتوانێت کەسێکی تر دابنێت، بەویستی خۆی، ئەوەش ئەوەیە هاوەڵان (ر.خ) لەسەری رۆیشتوون.

هاوەڵانی پێغەمبەر کاتیٚ پەیمانی بەیعەتیان دا بە ئەبوبەکر و پاشان عومەر و پاشان عوسمان و دواتر عەلی، هیچ کامیان ناچارنەکران و ئەوان بەزۆر هیچ کەسیان ناچار نەکرد کەبەیعەتیان پیٚ بدات، ئەوە زانیاریەکی راستەقینەی مێژووییە و کەس نکولی لیٚ ناکات، هیچکامیان بەهێزو بەشمشێر نەبوونە خەلیفە و خۆیان نەسەپاند بەزۆر بۆ ئەوەی ببنە پێشەوا.

وابیرناکەیتەوە کە مامەڵەیەکی کرین و فرۆشتن زۆرجار لەسەر نیودینار هەڵدەوەشێتەوە لەکاتێکدا هەردوکیان سەرەتا ئامادەی مامەڵەکەن و رەزامەندن، بۆیە بوونی پەستان و ناچارکردن کە ئامادەیی هەبێت لەبەیعەتی پێشەوایەکدا، هەرگیز نایێتەوە لەگەڵ تیۆری پەیمان و پەیوەستنامەکانی شەریعەتی ئیسلامیدا کە بە مەرج گیراوە ویست و رەزامەندی بەشدارانی پەیوەستنامەکە بۆ دروستی پەیماننامەکە، بۆیە هیچکات ناچارکراو ناتوانێت پەیمان ببەستێت، کاتێك خوای پەروەردگار بەندایەتی و پەرستشەکانی خۆی واجب کردوە سەربەندەکانی، کەچی ناچاریی نەکردوون و فەرزی ناکات بەسەریانەوە کە شوێن دینەکەی

---

[1] الاحکام السلطانیة للماودی ص١١.

بکەون کە دەفەرموێت: (لااكراه في الدين)[١]. ئیتر چۆن ڕێیداوە لە پەیمان و بەیعەتی پێشەوا –کەملکەچی و گویرایەڵی پێشەوای تێدایە– بەبێ ڕەزامەندی گەل و بەزۆر پەیوەستن بە پەیمانێکەوە، بەدەسەڵاتێکی ناچاری پابەندیان بکات بەفەرمانەکانییە وە دواتر.

ماوەردی هێنایەتی کە: (ئەگەر ئەهلی حەل و عەقد– کەسێکی کاندید کرد بەوەی کە بەئیجتهادی خۆی هەڵیانبژاردبوو، دەیخەنە بەردەم گەل، ئەگەر وەڵانی بۆیان هەبوو بە ئەرێ ئەوە بەیعەتی پێدەدەن و ئەگەر بەرگریشیان لێکرد خۆ گەل ناچار ناکرێت لەسەری، چونکە ئەو پەیوەستنامەیە ڕەزامەندی و ئیختیاری دەوێت، هیچ کات بە زۆرەملێ و ناچاری ناکرێت)[٢]. بۆ ڕۆشنی ئەوبنەمایە ئیمام مالك فەتوایدا کە ناچارکراو بەیعەتی لێوەرناگیرێت، ئەوەش کاتێك موحەمەدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی حەسەن ڕاپەری لە ساڵی ١٤٥ی کۆچی، دژی ئەبو جەعفەری مەنصوری عەباسی، ئەوکات لە مەدینەوە ڕاپەرینی دەستپێکرد، ئیمام مالکی کوڕی ئەنەس فەتوای ڕاپەرینی لەگەڵ موحەمەد دەرکرد، لەگەڵ ئەوەی پێشتر بەیعەتیان بە ئەبوجەعفەردابوو، مالیك وتی (ئیوە بەیعەتتان بە ناچاری داوە، هیچ کات ناچارکراو بەیعەتی شوێنی خۆی ناگرێت و هەژمارنییە، بۆیە بەپەلە خەڵکی پەیوەندیان کرد بە موحەمەدوە.. مالیکیش لەماڵی خۆیدا دانیشت).[٣]

---

[1] البقرة ٢٥٦.

[2] الاحكام السلطانية للماودى ص٨.

[3] ابن جرير الطبرى ٤/٤٢٧.

## ڕەوایی هەڵوەشانەوەی پەیمانی بەیعەت:

دیارە ئەوەی پێشتر هەمووی پشتراستی ئەوەی کردوەتەوە کە پێشەوایەتی بەبێ بەستنی پەیمان و بەیعەت بوونی نییە، هەروەها هیچ پەیمانێکیش بەبێ ڕەزامەندی لایەنە بەشداربوەکانی پەیمانەکە دیسان بوونی نییە، بۆ خۆی ئەمە پەیمانێکی بریکاری یان بریکارنامەیەکە، کە گەل بنچینەیە تیایدا و پێشەوا بریکاری ئەوە، کە هەڵدەستێ بەکارو ئەرکەکانی ئەو بە پێی شێوازێکی بریار لەسەر دراوی پێشینە کە بەم شێوەیەیە: (بەیعەتمان پێدای بەوەی کە ڕەزامەندبووین کە هەستی بەدامەزراندنی دادگەری و یەکسانی و ئینصاف هەستان بە ئەرکی پێشەوایەتی)[1]. یان (بەیعەتمان پێدای کەلەسەر کتاب و سونەتی پێغەمبەر مامەڵە بکەی) وەك ئەوەی هاوەڵان دەیانکرد، ئەگەر ئەمە هەموو چەسپا ئیتر شتێ نییە  ناوی پەیمان بێ و باسی هەمیشەیی تێدابێت و نەتوانرێت هەڵبوەشێتەوە، بەڵکو هەموو ئەو پەیماننامە و پەیوەستنامانەی کە ماوەدرێژەیان دەبێت و بەردەوامی بەتەمەنیان دەدەن وەك ڕێپێدان و بریکاری و نیکاح وئەگەرو بواری هەڵوەشاندنەوەیان هەیە و هەڵدەگیرێن، بەتایبەتی بریکارنامە، کە فراوانترین پەیماننامەیە لەشەریعەتی ئیسلامیدا لەم بوارەدا، بۆیە دەتوانێت هەرلایەك بۆ خۆی هەڵیبوەشێنێتەوە، هەروەها بنچینەی بریکارنامە توانای لادانی بریکاری هەیە هەرکات ویستی، چونکە

[1] الاحكام السلطانية لابى يعلى ص ٢٥.

ئەوخاوەنی مافە سەرەکیەکەیە ئەو تەنها بکەرێکی جولاوە بۆ ئەو مەبەستەی ئەم، ئیبن و جەوزی لە بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی کە دەڵێن: ئیمام حوسەین هەڵەی کرد کە راپەرینی کرد بەرامبەر یەزیدی کوڕی مەعاویە دەڵێت: (ئەگەر تەماشا بکەن دەزانن کەچۆن پەیمانی بەیعەت درا بەیەزید و چۆن خەڵکان ناچاردەکران بەوەی بەیعەت بدەن، خۆئەگەر وتیشمان گوایە خەلافەتەکەی راستەقینەیەو بەیعەتەی تەواو پێدراوە ئەی خۆ یەزید شتی وەهای لێدەرکەوتووە هەموویان ئاماژەن بۆ هەڵوەشانەوەی پەیمان و بەیعەتەکە)[1].

پەیمانی پێشەوایەتی وەك هەر پەیمانێکی تر دەتوانرێت هەڵبوەشێنرێتەوە، وەك لە گوتاری سیاسی راشیدیندا بە رۆشنی دیارە، وەك ئەبووبەکر لە وتارەکە بەناوبانگەکەیدا وتی: ((ئەی خەڵکینە منتان کردوە سەردارتان و فەرمانڕەواییتان کەوتوەتە بەردەستم، من لەئێوە باشتر نیم، ئەگەر چاکەم کرد پشتیوانی و کۆمەکم بن، خۆ ئەگەر بەلارێدا چووم راستم بکەنەوەو بمهێننەوە سەر راستە، – لەریوایەتێکدا– ئەگەر ستەممکرد و بەوشێوەیە نەرۆشتم راستم بکەنەوە – گوێرایەڵیم بکەن لەوەی گوێرایەڵی خوادەکەم لەبۆ ئێوە، خۆ ئەگەر لامدا لەئاین و بێ ئەمری خوام کرد ئەوکات گوێرایەڵیەك بۆ من لای ئێوەوە نییە)[2].

---

[1] انظر الفروع لمحمد بن مفلح الحنبلی ٦/١٦٠.

[2] رواه محمد بن اسحاق فی السیرة کما فی المختصر ص٣٠٣.

ئەوەبو پاڵی نا بە ئەهلی فتنەو ئاژاوەکەوە کە راپەرین دژی عوسمان (ر.خ) کە مکوربون و پێداگریان دەکرد لەسەر وازهێنانی، دەیانبینی کەمافێکیان هەیە لەوەی کەوازبهێنێت، عوسمان راوێژی کۆمەڵێك لەهاوەڵانی تر کرد ئەوەیان رەتکردەوە، هەر ئەوەش بوو پاڵی نا بەعومەری کوڕی خەتابەوە کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بەرکەنار بکات کەوالی کوفە بوو، کاتێك خەڵکەکەی سکاڵایان لەسەر دا لای خەلیفە ئەویش بەرکەناری گرت بە پێی خواستی ئەو خەڵکەی کوفە، چونکە بریکاری ئەوان بوو داوایان نەبوو لەسەری کەبریکاریان بێت و لایان برد، لەکاتێکدا ئەو یەکێك بوو لەو شەشەی کە کاندیدبوون بۆ خەلافەت، ئەو لەسەر جێگای مردن کاتی نەخۆشکەوتنی وتی: (ئەگەر لە ئەمیرایەتیەکەی سەعد ئەنجامیدا پێکابێتم ئەوە ئەوەیە، وەگەرنا یارمەتی بدەن بەوەی کێ بێتە ئەمیر، چونکە من بەرکەناری ناکەم لەبەر ئەوەی کەمتوانایە یان خیانەتی کردوە)[1]. ئەوەش جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی کە بەرکەنارکردنی سەعد لەسەر خواستی بنچینەکە (خەڵك) بوە کە بەشێك بوە لە گەل و ئومەتی ئیسلامی، لەبەر ئەوە عومەر هیچ نەدەوەستا لەسەر ئەوەی کە هەر ئەمیرێك خەڵکەکی شوێنەکە گلەیی لێبکردایە ئیتر لایدەبرد ئەگەرچی لەسەر هەقیش بوایە، ئەوەش بەڕۆشنی بنچینە بوونی گەل دەردەخات، چونکە پێشەوا بریکاری گەلە، ئیمام حەسەن خۆی هەستا

---

[1] صحيح البخاری ح ٣٧٠٠.

بەبەرکەنارکردنی خۆی لە پێشەوایەتی و وازی لێهێنا لەکاتێکدا پاش باوکی خەڵکی عێراق بەیعەتیان پێدا لەساڵی ٤٠ کۆچی بویە پێشەوا، بەڵام ئەو جێگەی خۆی چۆڵکرد بۆ مەعاویە بە خواست و ڕەزامەندی خۆی، پاشان خەڵکی عێراق ئیتر بەیعەتیان بە مەعاویە دا وەك ئەوەی کە حەسەن بەیعەتی داپێی)[1].

بنەمای پێنجەم: ڕەزامەندی و هەڵبژاردن بە بیٚ ڕاوێژو تاقیکردنەوە بوونی نابێت:

دیارە ڕەزامەندی و هەڵبژاردن ئەنجام نادرێت، تاوەکو بە ڕاوێژو تاقیکاری کەسێتی بۆ بوونە کاندید، بەدەست بهێنێت بۆ ئەوکەسەی کە گەل و ئومەت هەڵیدەبژێرێت و بەیعەتی دەداتیٚ، ئایا ئیتر ئەو مەرجانەی کاندیدی تیایە یان نا؟، یان گەل ڕەزامەندی دەداتیٚ و پەسەندیەتی، یان ڕەتی دەکاتەوە،؟ ئەمەش بەئەنجام ناگات ئەوکاتە نەبێت کە ڕاوێژو کۆبوونەوەی پێشوەختە لەسەر کاندیدکردن و ئاڵو گۆڕی ڕاوبۆچوون و پێویستی و تایبەتمەندی و خواست و تواناکان بەگشتی خرابنە بەرباس و گفتوگۆ لەنێوان بڕواداراندا، یان ئەوانەی کەپسپۆرن لەوبارەوە بە ئەهلی بۆچوون ورار دادەنرێن، کە ئەمەش لە روداوی سەقیفەدا بەتەواوی بەئەنجامگەیشت و جێبەجێکرا، وەك پراکتیکی ئایەتی (وامرهم شوری بينهم) لەلایەن هاوەڵانەوە جێبەجێکرا، شاراوەنییە کە پرسی ڕاوێژ (شورا) مافێکی گشتیە لەو ئایەتەدا، هەموو

---

[1] انظر فتح الباری ١٣/٦١-٦٣.

تاکێك دەتوانێت بەشداربێت و وەك خەصڵەتێکی کۆمەڵگەی نوێی بروادار پیشاندراوە وەك میکانیزمێکی مرۆیی بۆ رزگاربوون لەخەصڵەتەکانی کۆمەڵگەی نەفامی هاتوەتە بوون، کە ئەوان تەنها راوێژیان کورتکردبوەوە لە (دارالندوە) بۆ چینێکی تایبەت خانەدان و پێگە باڵاکان، بە بێ ئەوەی کەهەژارو نەدارو چینە پلیشاوەکان بەشدار بن تیایدا و کورتەکەی بۆ گشتی خەڵك نەبوو بەشداربێت.

ئایەتی شورا لەسورەتی شورا لەمەککە خوای گەورە ناردیەخوارەوە، وەك مژدەیەك بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی باوەڕدار کە تیایدا هیچ جیاوازی و جیاکاریەك لەنێوان عومەرێکی قورەیشی و بیلالێکی بەندەی حەبەشی نەبوو، هەموویان لە دینی خوادا وەکو یەکن وەك چۆن خوایگەورە وەڵامی هەمویان وەك یەکدەداتەوە کاتێك ڕوو لە بارەگای خوا دەکەن و نوێژ ئەنجام دەدەن و ماڵ و سامانیان لەپێناو خوادا دەبەخشن بەهەژارو نەداران، کاروبارو فەرماندانیان بەپێی راوێژە لەنێوان هەمواندا.

لەبەر ئەوە دەبینین هیچ کام لە هاوەڵانی پێغەمبەر کاتێك باسی راوێژکرا بچنە سەقیفە بۆ ئەنجامدانی هیچ کەس رێگری لێنەکرا، بەشداریە فراوانەکە وای کرد کە مشتومڕی زیاتر بێتە ئاراوە، پاشان ئەوە پشتراستنەکراوەتەوە کە هەرکام لەوانەی ئامادەبووی سەقیفە بە خواستی یەکێکیان و داوای یەکێك یان بەمەرج ئامادەبووبێت، بەڵکو ئەوانە وەك بەشدارێکی راوێژو دەستکەوتنی چاکەیەك ئامادەبوون، بۆیە دەبینین لە سەقیفەدا نوێنەری هەموو دستەو چینەجیاوازەکان

ئامادەبوون، پشتیوانان هەموویان بە ئەوس و خەزرەجەوە، تەنانەت خەریك بوو سەعدی کوڕی عوبادەی سەرۆکیان بکەنە پێشەوا کەیەکێك بوو لە نوقەبای بەشدرانی پەیمانی عەقەبە هەروەها لەپیاوە گەروەکانی تری پشتیوانان، وەك ئوسەیدی کوڕی حوزەیر و عوەیمی کوڕی ساعیدەو بەشیری کوڕی سەعد و حەبابی کوڕی مونزیرو،..هتد، هەروەها هەموو کۆچەرەکان لەگەورەو دیارەکانیان ئەبو بەکر و عومەر و ئەبو عوبەیدەو هەروەها خێڵی ئەسلەم، کەلەو بەیعەتەی سەقیفە بەشدار بوون.

هیچکام لە کۆچکەران دوانەکەوتن لە سەقیفە بێجگە لە عەلی و تەلحەو زوبەیر، ئەوان بەجیا خەریکی ئامادەکاریەکانی ناشتن و پێداویستیەکانی پاش ئەسپەردەکردنی تەرمی پیرۆزی پێغەمبەر بوون. هەورەها ئەوان لەگەورە پیاوانی کۆچەر و بەتەمەنکانیان نەبوون، بەڵکو ئەوانە گەنج بوون لەسیەکانی تەمەنیاندا بوون ئەوان بەڵکو گەورەکانیان وەك ئەبوبەکرو عومەر و ئەبوعوبەیدەو ئەوانی تر لە کۆچکەران بوون.

گەل و ئومەت سەرچاوەی دەسەڵاتە لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وأمرهم شورى بينهم)[1]، هەروەها (وشاورهم في الامر)[2].

ئەوکات هیچ جیاوازیەك لە سەر چەمکی (شورا– راوێژ) نەخرابوە ڕوو هەموویان بەیەك مانا بە بێ کێشەو مشتومڕ لێی تێدەگەیشتن،

---

[1] الشورى ٣٨.

[2] ال عمران١٥٩.

نەدەچوونە قوڵاییەوە کە: راستەقینەی شورا چیە؟ ئایا شورا واجبە یان نەخێر، ئایا پابەندکارە یان تەنها بابەتێکی زانیاری و ئاسانکاریە؟ ئەوەبوو لە سەردەمی تەئویل و گۆرانکاری دا فیقه و شیکاریە دەقیەکان شتی زۆری لەسەر وترا لەوانە شورا تەنها راوێژێکە بۆ پێشەوا سەبارەت بەگەل– ئومە– بۆ گەل نییە و مافی دەسوەردانی هەبێت لەدیاری کردنی پێشەوای خۆیدا– هەروەها شورا واجب نییە – وە ئەگەر لە بارودۆخێکدا واجبیش بوو بۆ سەپاندن و پایەندبوون پێیەوە، نییە، بۆیە خۆسەپێنی و پێشیلکاری دەسەلاتداران لەو سەردەمی تەئویل و فرە بۆچوونییە دا گەیشتبووە لوتکە، وەك کارێکی مەشروع رەوایی پێدەدرا بە بەلگەی راڤەی ناتەواوی ئەم ئایەتی شورایە، (وامرهم شورى بينهم) و (وشاورهم في الامر).!.

ئەوە لەگەڵ ئەوەی کە هەموو رەفتارەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر تێکرا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە شورا ئەو مافەی گەلە بۆ دیاریکردنی پێشەوا، هەروەها مافی گەلە دوای دەستنیشانکردنی پێشەوا هیچ کارێك بە بێ ئەو یەکلانەکاتەوە، چونکە واجبێکی پابەندکەرە، وەك ئەبوبەکری جەصاص لە تەفسیرەکەیدا بۆ ئایەتی (وشاورهم في الامر) جەخت لەسەر واجب بوونی ئەم فەرمانەی ناو ئایەتەکە دەکات، ئامانجی باڵای شورا بریتیە لەکارکردن بەو ئەنجامەی کەپێی گەیشتوە،

هەروەها بەرپەرچی هەموو ئەوانەدەداتەوە کە پێیان وایە ئەم فەرمانە لەم ئایەتدا هاتوە بۆ ئیستحبابە[1].

ئەمەش ئەو بۆچونەیە کە رازی لە تەفسیرەکەیدا پشت راستی دەکاتەوە کە دەڵێت: (ڕووی دیاری ئەم فەرمانە بۆ واجب بوونە، دەستەواژەی (شاورهم) واجب بوون کەمتر نییە )[2].

هەروەها ئیبن و خوێز مەنداد دەڵێت: (واجبە لەسەر دەسەڵاتدارەکان کە راوێژ بە زایان و پسپۆران بکەن لەوەی کەشارەزاییان تیایدا نییە، هەروەها بۆ هەرچتێك کە ئەشکالیەتی درووستکرد بۆ کاروباری ئاینی، و کاروباری سوپاو ئەوەی پەیوەستە بەجەنگ و ئەو کەسە دیارانەی شارەزان و کە پەیوەست بێت بەبەرژەوەندی گشتیەوە، هەروەها کەسایەتی وەك نووسەران و وەزیران و کرێکاران ئەوەی پەیوەست بێت بە بەرژەوەندی وڵات و ئاوەدانکردنەوەیەوە)[3].

ئەمەش ئەوەیە کەزانایانی ئەندەلوس کۆك بوون و لەسەری رۆیشتوون. وەك ئیبن و عەتیە دەڵێت: (شورا بنچینەیەکی شەریعەتەو برێنەرەوەی حوکمەکانە، ئەوەی راوێژ بە خەڵکی زاناو ئایندارو مرۆڤ دۆست نەکات کەنارخستنی واجبە، ئەوەش هیچ مشتومڕێك ناخوازێت[4].

---

[1] احکام القران ٢/٣٣٠.

[2] تفسیر الرازی ٩/٦٧.

[3] تفسیر القرطی ٤/٢٤٩-٢٥٠.

[4] تفسیر القرطی ٤/٢٤٩.

## راوێژ ( شورا ) له‌ گوتاری راشیدین دوو راستی له‌خۆده‌گرێت:

یه‌كه‌م: مافی گه‌له‌ (ئومه‌ته‌) كه‌ پێشه‌وا دیاری بكات: به‌ئایه‌تی پیرۆزی: (وأمرهم شورى بينهم) ئه‌م ئایه‌ته‌ باس له‌ مافی بڕواداران به‌گشتی ده‌كات له‌ پرسی راوێژ پێش هه‌بوونی پێشه‌وایه‌ك كه‌ راوێژیان له‌گه‌ڵ بكات، ئه‌م ئایه‌ته‌ له‌ مه‌ككه‌ دابه‌زیوه‌ پێش ئه‌وه‌ی كه‌نه‌ده‌وڵه‌ت و نه‌ پێشه‌وا بوونی هه‌بووبێت، بڕیاردراوه‌ وه‌ك پره‌نسیپێك و بنچینه‌یه‌ك.

دووه‌م: مافی گه‌له‌ كه‌ به‌شداری له‌گه‌ڵ پێشه‌وادا بكات بۆ خستنه‌ڕووی راوبۆچوونه‌كان: ئه‌وه‌ پاش ئه‌وه‌ی كه‌ هه‌ڵیده‌بژێرێت، وه‌هیچ كارێك یه‌كلاناكاته‌وه‌ هه‌ر له‌خۆیه‌وه‌ تاوه‌كو راوێژنه‌كات و ره‌زامه‌ندی نه‌خشه‌ی كاره‌كه‌ی پێنه‌دات وه‌ك خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت: (وشاورهم في الامر)ئه‌مه‌ ئایه‌تێكی مه‌نییه‌، ئه‌م گوتاره‌ ئاراسته‌یه‌ ڕوه‌و پێشه‌وا پاش ئه‌وه‌ی ده‌وڵه‌تی دامه‌زراند له‌مه‌دینه‌ پاش ئه‌نجامدانی راوێژ له‌هه‌موو فرناغه‌كانی بونیادنانی و كاروباره‌كانیدا.

هاوه‌ڵان تێكڕا هاوڕابوون له‌سه‌ر ئه‌م راسته‌قینه‌ی كه‌ گه‌ل پێشه‌وا هه‌ڵده‌بژێرێت، هه‌رگه‌لیش به‌شداری ده‌كات له‌خستنه‌رووی راوبۆچوون سه‌باره‌ت به‌كاروبارو روداوو كێشه‌كان، هیچ كرده‌یه‌ك به‌ بێ گه‌رانه‌وه‌ بۆگه‌ل و پسپۆره‌كانی، بۆ ئه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵاته‌كه‌ی به‌رده‌وام و جێگیر بێت و پشتیوانی ته‌واوی بن، خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت (انما وليكم الله ورسوله والذين آمنوا) ئه‌مه‌ ش جه‌ختكردنه‌وه‌یه‌ له‌سه‌ر جێگیری به‌پێی فه‌رموده‌ی صه‌حیح (من له‌پێشترم بۆ بڕواداران له‌خۆیان، به‌ قورئانی

پیرۆز، ئەوەی شتێ دوای مردنی جێ بهێڵێت ئەوە بۆ میراتگرەکانی دەبێت، ئەوەی قەرز و ماڵ و مناڵ جێ بهێڵێت بەخێو کردنیان لەسەر منە و دانەوەی لەسەر منە)[1].

ئەوە پشتراستوبەوە تە کە (سەرپەرشتیاری و لەسەرخۆگرتن-ولایەتی) پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ولایەتی دەسەڵاتە، دیارە لەسەرخۆگرتنی ئیمانداران پاش ولایەتی خواو پێغەمبەر دێت، بەحوکمی خواو پێغەمبەر، تێگەیشتن لە ولایەتی گشتی کە خوای گەورە لە قورئاندا چەسپاندویەتی بریتیە لەهەڵبژاردنی پێشەوایەك وەك بریکارێکی خۆیان، بۆ هەستان بەجێبەجێکردنی ناواخنی ئەو ولایەتەی کەلەسەر ئەوانە، هیچ جیاوازیەك لەنێوان بریکاری و نوێنەرایتیدا بوونی نییە، نە لە دەقەشەرعیەکان و نەلەکتێبە فیقهیەکاندا باس لە هیچ جۆرە جیاکاریەك نەکراوە، لە کتێبە فیقهیەکان تەنها یەك بەشیان بۆ تایبەتکردوە ئەویش ناوی نوسراوی بریکارنامەیە، لەمەشدا گوتەی فەقیه و شەرعناسەکان پێشکەوتوە لەمەی دەیلێین کە خەلیفە بریکاری گەل و ئومەتە. هەڵدەستێ بەجێبەجێکردنی ئەوەی لەسەرشانی لە کاروباری گشتی لەبری ئەو بەو حوکمانەی کە خوای گەورە ئاراستەی ئەوی کردون.

هەروەها ئەوەش پشت راستکراوەتەوە کە ماناو پرسی راوێژ پاش هەڵبژاردنی پێشەوا لە لایەن گەلەوە، ئەوە دەگەیەنێت کە ئیتر پێشەوا

---

[1] سبق تخزیجه.

فەرمانەکانیش لەدەست خۆیدا نین و دەسەڵاتی ڕەهای نییە ناتوانێت فەرمان دەرکات بەبێ ڕوایژ، وەك ئەوەی لە صەحیحی بوخاریداولە پێغەمبەری خواوە بۆمان باسکراوە لەبارەی سەبایای هەوازنەوە فەرموویەتی: (ئەی خەڵکینە ئێمە تێنەگشتوین لەوە کە کێ ڕەزامەندە لە ئێوە و یان لەوەی ڕەزامەند نییە، بگەڕێنەوە بۆ لای تێگەیشتوو بزانەکانتان تاوەکوو کارەکانتان بۆ ئێمە بەرزدەکەنەوە).

ئیمام عوسمان هەستا بەراوێژکردن سەبارەت کوشتنی عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەر، هەموو کۆچکەرەکان لەسەر ئەوەبوون کە بکوژرێت، بەڵام زۆرینەیەك هەبوون ئامادە کوشتنیان ڕەتدەکردەوە، عوسمان هەستا بەجێبەجێکردنی رای زۆرینە و دیەو خوێنباییەکەی بۆ بژارد لە ماڵەکەی)[1].

پاشان عوسمان نامەیەکی نوسی بۆ سەرکردەکانی: عومەر شتێکی دارشت و دانا بۆ ئێوە کە وون نەبوو لەبەرچاومان، بەڵکو ئەوە بەدەر بوو لەسەرانی وەك ئێمە)[2]. دیارە راوێژکردن و بابەتی شورا خڕ ناکرێتە لە کۆمەڵێکدا و یان لە خێڵ و بنەماڵەیەکدا بێ ئەوانی تریش نەبێت! بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤێکی ئامادەیە کەبەشدار بێت توانای خستنەڕووی راکانی هەبێت ئیتر پیاو بێت یان ژن، گەورە بێت یان گەنج، بۆیە پرسی راوێژیش خڕنەکراوەتەوە تەنها لەسەر موسڵمانان و ئەوانەی کەل ئاینەکانی ترن، بەڵکو مەرجی ڕەزامەندی گشتی لە غەیرە

---

[1] طبقات ابن سعد ٣/٢٧١.

[2] ابن جرير ٢/٥٩١.

موسڵمانیش هەیە لەکاتی بوونی پەیمانێك کەئەوان تیایدا بەشداران یان لەنێوان ئەوان و موسڵماناندا دەکرێت.

ئیمام ئەبو عوبەید ئەلقاسم کوڕی سەلام دەڵێت: ئەگەر خەڵکی شارێك لە موشرکین پەیمانیان بەست لەگەڵ سەرانی موسڵماناندا، پەیمانێکی ئاشتەواییان لەگەڵ ببەستن، ئەوی دەست بە باشتر و بەمتمانەوە بگرێت، نابێت بەسەر گشتدا تێپەرببێت و تەنها سەران ڕەزامەند بن، بەڵکو دەبێت گشتی ئەو شارە ڕەزامەندی بنوێنن، بدرێت بەگوێیاندا و، مەکحول دەڵێت: ئەگەر موسڵمانان چوونە ناو قەڵایەکەوە دوژمنەکانیان دەستیان گەیشتە ئەمان و داوای ئاشتەواییان کرد لەسەر خەڵك، ئەوە ناکرێت تا سەرکردەی سوپا نوێنەرێك دەنێرێتە ناو قەڵاکە و خەڵکەکەی هەموو کۆدەکاتەوە و هەموویان بەو داخوازیە دەزانن، ئەگەر ڕەزامەندیان نواند ئیتر ئەوا دەچنە ناویان، خۆ ئەگەر گشتیان بریاریان نەبوو لەسەر ئەوبریارە، ئەوە ئاشتەواییەکە بەرکەناردەکرێت، ئەوان لەقەڵاکە دەمێننەوە، پێشتر سەرکردەکانی سوپای موسڵمانان پێش عومەر عەبدولعەزیز بەوشێوازە صوڵحی سەران و پێشەوای خەڵکی قەڵاکانیان کردوە، لەسەر ئەوەی بەچی ڕەزامەند دەبن، بەبێ ئەوەی کەزۆرینەی خەڵکی قەڵاکان ئاگایان لەوەبووبێت کە سەرکردەکانیان چۆن ڕێککەوتوون، بەڵام عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەم شێوازەی ڕەتکردەوە فەرمانی دا بە سەرکردەی سوپای موسڵمانان کەدەبێت لەمەولا بەم شێوازە ڕەفتار بکەن، ئەوەی کەدەخرێتە بەردەمیان پێی قایل نەبن تاوەکو نوسراوێك نەنووسن و ئەو نوسراوە ببەنە ناو

قەڵاکانەوە ئاراستەی خەڵکەکەی بکەن تاوەکو ئەونوێنەرە شایەتی بۆ وتەی خەڵکی قەڵاکەش بدا. ئەبو عوبەید دەڵێت: ئەمە ڕوویەکە یان دەبێت شوێنکەوتەی ئەوانەبن کە لەگەڵ فەرمانداروسەرکردەکانیان پێچەوانە نابنەوە، لسەر ئەو بنەمایە ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ئەوەی پەیمانی بۆ بەستوەو ئاشتەوایی کردوە وەك سەرانی نەجران و ئەوانی تر، ئەوانە نوێنەرو خانەدانەکانیان بوون، هیچ کەس پێچەوانەی رای ئەوان نەبوەو ناچارکراوی رای ئەو نوێنەرانەیان نەبوونەو ملکەچی بوون).[1]

ئەوەش تەریب و هاتنەوەی تەواوی هەیە لەگەڵ گوتاری سیاسی قورئانی کە هاتوە بۆ ئازادکردنی مرۆڤایەتی بەگشتی، هاتوە بۆ هەڵگرتنی ستەم و زۆرداری لەسەری و بەدیهێنان و چەسپاندنی دادو یەکسانی لەنێوان مرۆڤەکاندا.

ئەگەر کارەکە بەو شێوەبێت لەگەڵ غەیرە موسڵمان، پێویستی بەرەزامەندی گشتی هەیە پەسەندبێت لەسەر ئەو پەیمانەی کە سەرانی ئەوان سەرکردەکانیان لەگەڵ موسڵمانان بەبێ زۆرەملێ و بەبێ ناچارکردن، دیارە رەزامەندی گشتی موسڵمانان لەپێشترە، بۆیە نابێت پێشەوا پێشێلکاری رای ئەوانی تر بکات کە مەرجە راوێژیان پێبکات، هیچ کات بەبێ راوێژ لەگەڵ پیاوماقوڵان و زۆرینەی قسەرۆیشتوان، راوبۆچونێکی لێدەرنەچێت.

[1] الاموال لابی عبید ص ۱۹۱–۱۹۲.

ئیمام عەلی (ڕ.خ) دوای ئەوەی کۆچکەرەکان و پشتیوانان هاتن و ویستی بەیعەت پێدانیان هەبوو ئەویش پێی وتن: (سەرەتا من دەبێت لە پیاو ماقوڵان و قسەرۆشتوان وکەسانی خاوەنراوێژ ئەوەبکەم، لەبەرئەوە بەیعەت وەرناگرم و ئەنجامی نادەم)[1]. پاش ئەوەی کە بەیعەتی خەڵکی وەرگرت دوایی پێی وتن: (ئەمە بەیعەتی گشتیە، ئەوەی رەتی بکاتەوە، ئەوە پشتی لە ئاینی موسڵمانان کردوە شوێن ڕێگەی ئەوانی نەگرتوە)[2].

## بنچینەو ڕێسای زۆرینە پەسەندە:

ئەگەر جیاوازی راوبۆچوون لە راوێژکاران هەبوو واتە دووراهەبوو یان زیاتر ئەوە پێویستە پێشەوا رای زۆرینە پەسەند بکات، وەك عومەر لەکاتی جیاوازی رای هاوەڵان سەبارەت بە زەوی دەسخراو کردی، بۆیە داوای دە کەسی کرد، پێنج لە ئەوس و پێنج لە خەزرەج.

هەروەها ئەم ڕێگایەشی بەکارهێنا کاتێ شەش کەسی بۆ جێگری خۆی واتە پاش خۆی ببنە خەلیفە کاندید کرد، پاش ئەوەی موسڵمانان داوایان لێکرد کە ئەوەی پێی شایستەیە بۆ پێشەوایی با کاندیدی بکات بۆیان، پاشان عەبدوڵای کوڕی وەك حەوتەمی دیاریکرد وەك دەنگی یەکلاکەرەوە لەکاتی هەبوونی هاوسەنگی راکان واتە ئەگەر سێ بەسێ دەرچوون با عەبدوڵڵا چووە سەر هەرلایەکی یەکسان و هاوسەنگ ئەوا

---

[1] ثقفات ابن حبان٢/٢٦٧.

[2] ثقفات ابن حبان٢/٢٦٨.

بەلاكەی خۆیدا بیشكێنێتەوە، لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە (عەبدوڵڵای كوڕی عومەر كە ئەو لەوبارەوە بێ لایەنەو هیچ شتێك سەبارەت بە پێشەوایەتی خواستی نییە، با كارەكە بەدەنگی ئەو یەكلابكەنەوە)[١].

لە ریوایەتێكی تردا هاتوە (ئەگەر سێ لەلایەك و سێكەی تر لەسەر رایەكی تر كۆبوونەوە با عەبدوڵڵای كوڕی عومەر حوكمی یەكلاكەرەوە بدات، ئەگەر رازی نەبوون، ئەوا ئەوە پێشخەن كە عەبدورەحمانی كوڕی عەوف لەگەڵیدایە)[٢].

لە ریوایەتێكی تردا (ئەی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ئەگەر ئەو شەش كەسە ناكۆكیان كەوتە نێوانیان تۆ لەگەڵ زۆرینەكەبە ئەگەر سێ بەسێ بوون ئەوا تۆ لایەنداری و شوێنكەوتەی ئەو سیانەیان بە كە عەبدورەحمانی كوڕی عەوفی تێدایە)[٣].

لە ریوایەتێكی تر (عومەر وتی بە هاوەڵانی راوێژكار: راوێژ بكەن لەو كاروبارەی لەسەری كۆدەبنەوە، ئەگەر دوو بەدوو بوون بگەرێنەوە بۆ راوێژ، ئەگەر چوار بەدوو بوون ئەوا رای زۆرینە هەڵبژێرن)[٤].

ئیبن شەیبە[٥] بە ئیسناد بەمەرجەكانی بوخاری لە فەرمودەی موسای كوڕی عەقەبەی كوڕی نافعەوە ئەویش لە ئیبنو عومەرەوە كە

---

[1] انظر فتح الباری ٦١/٧.

[2] انظر فتح الباری ٦٧/٧.

[3] تاریخ ابن جریر الطبری ٥٦٠/٢.

[4] طبقات ابن سعد ٤٥/٣.

[5] تاریخ المدینة ٩٢٥/٣.

عومەر وتوویەتی بە صوهەیب: (بانگی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم بۆ بکەن، کە ئەو هیچی سەبارەت بەو شتەوە نییە، بوەستە لەسەر سەریان ئەگەر کۆبوونەوە پێنجیان و ڕەزامەند بوون بە پیاوێك یەکێکیان هەر رازی نەبوو ئەوا بدەن لەسەری ئەو یەکەیان، ئەگەر چواریان رازی بوون بەدانی کەسێك و دوانیان رازی نەبوون ئەوە بدەن لەو دوانەش، ئەگەر سیانیان رازی بوون بەکەسێك و سیانی تریان رازی نەبوون با عەبدوڵڵای کوڕی عومەر حوکمی ئەو دوتاقمە جیاوازە بکات و بچێتە سەر تاقمێکیان و کەسەکە هەڵبژێرن، خۆ ئەگەر رازیی نەبوون بەحوکمەکەی عەبدوڵای کوڕی عومەر با لەگەڵ ئەو تاقمەدا بن کە عەبدورەحمانی کوڕی عەوف تیادایە، ئەگەر ئەوانەش هەر ئینکاریان کرد ئەوا بیانکوژن. ئەوانەی پشت هەڵدەکەن لەوەی کە کۆمەڵ لە سەری کۆکە).

لە ریوایەتێکی تردا لەکوڕی سەعدەوە: (کۆببنەوە لەرۆژی سێیەم گەورە پیاوانی خەڵك و فەرماندەی چەکدارەکان، یەکێکیان هەڵبژێرن، ئەوەی کە دەیەوێت ببێتە فەرماندار بەبێ راوێژ بدەن لەگەردنی)[1].

لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: (با صوهەیب نوێژ بۆ خەڵکی بکات، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بانگ بکەن با ئامادەبێت، ئەگەر پێنجیان کۆك بوون یەکێکیان نەبێت با ئەو یەکەیان شەلاقکاری بکەن)[2].

---

[1] انظر ما سبق.

[2] السنة الخلال رقم ٣٦٣.

فەرمانکردن بەکوشتنی ئەوەی کە دەرەنجامی راوێژەکە پەسەند ناکات لەراستیدا ماناکەی لەدەرەوەی روخساریدایە بەڵکو ئەوە بۆ قورسکردنی بابەتەکەیە وەك ئەوەی دەفەرموێت کە ئەگەر کەسێك چوو بەردەم نوێژتاندا بیکوژن، بۆیە (قتل– کوشتن) لەزمانی عەرەبیدا واتای لێدانیش دەگرێتەوە، دەکرێت وتەکەی عومەر وەك واتا روخسارییەکەش وەربگیرێت، وەك ئەوەی لەفەرمودەدا هاتوە بە کوشتنی ئەوەی ویستی ئاژاوەخستنەوە پشێوی و جیاخوازی حستنەوەی نێو ماڵی موسڵمانانی هەیە ئەوە پێویست بە تەمێکردن و هەرەشە لێکردن و تابگاتە کوشتنی هەیە، بەهۆی ترسناکی کارەکەیەوە ئەگەر پاشگەزنەبێتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (فقاتلو التي تبغي حتى تفيء الى أمر الله) مەبەست لەمە کوشتنی ئەو کەسە نییە کە رایەکی پێچەوانەی زۆرینەی هەیە، چونکە مافێکی رەوایە کەهەرکەس چۆن بیردەکاتەوە بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ئەو کەسەی ئامادەی ملکەچی بۆ رای زۆرینە نییە شایستە بەلێدان و تەمێ کردن و کوشتنی هەیە، لەبەر بەرژەوەندی تەسك و بچووك درز بخاتە نێو موسڵمانان و ریزی موسڵمانان شەق بکات و پەرتەوازیی بخاتەوە، ئەم بۆچوونە لەقسەکانی عومەر دەفامرێتەوە، وەگەرنا سەعدی کوڕی عوبادە راپەری و نەمایەوە چوو بۆ شام بەهیچ شێوەیەك بەیعەتی بە ئەبوبەکر نەدا و هیچ کەسیش بەرگیری لێنەکرد، ئەو نارەزامەندی و بەیعەت نەدانەی نەبوە هۆکاری ئاژاوەنانەوەو پەرتکردنی ریزی موسڵمانان.

دیاره خەلیفە عوسمان پابەندبوو بەوەی کەرای گشتی و زرینەی لەسەر بوو، وەك لەو نوسراوەیدا بۆ خەڵکی کوفە ناردوویەتی کاتێك ویستیان سەعیدی کوڕی عاص بەرکەناربکەن وتویەتی: (پاش ئەوە..فەرمانتان پێدەکەم بەوەی کە ئەوەی هەڵیدەبژێرن ببێتە ئەمیرتان، لە سەعید من بورام و بەرکەنارکرا، سوێند بەخوا شتێك داواناکەن کە سەرپێچی خوای تێدانەبێت وەڵامتان نەدەمەوە ئەوەی سەرپێچی کردنی فەرمانی خوا بێت لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکەم، هەروەها ئەوەی کە بێزارن لێی سەرپێچی خوای تیانەبێت من لەسەرتانی هەڵدەگرم، ئەوەی دادەبەزێتە لای ئێوە کاتێك خۆشتان ویست تاکو بۆ ئێوە نەبێتە بەڵگە و حوجەیەك)[1].

پیاوماقوڵانی کوفەو سەرکردەکانی نوسراوێکیان نوسی کە تیایدا داوای دەرکردنی خەڵکی ئاژاوەگێریان کردبوو، ئەویش بۆی نووسیبوون: (ئەگەر هەموو پیاوماقوڵان کۆکن لەسەر ئەوەی نوسیوتانە پەیوەندی بە مەعاویەوە بکەن تاوەکو ناچار بەدەرکردنیان بکەن)[2].

کاتێك دواوای لەکارلادانی مەعاویەیان کرد لە ئەمیرایەتی خەڵکی شام ئەویش ئەم نوسراوەی دەکردە بەڵگە بەدەسیەوەو دەیوت: (ئەگەر ئەمیری بڕواداران و کۆمەڵی موسڵمانان بەوشێوازەی ئێوە روانیبایانە

---

[1] ابن جریر ٢/٦٤٤.

[2] ابن جریر ٢/٦٣٥.

من ئەوا ئەوە بۆمنی شتێکی وەهای دەنووسی، و منیش لە کارەکەی ئەو بەرکەنار دەبووم)[1].

قەعقاعی کوڕی عەمری بەڵگەی ئەوەی دەهێنایەوە لەسەر (عەلی یەزیدی کوڕی قەیسی ئەرجی– یەکێك لە سەرکردەکانی راپەرینەکە بوو دژی عوسمان– پێی دەوت چۆن دەکرێت لەسەر رایەکی تایبەت و کەمینەیەك کەسێك بەرکەنار بکرێت کەرای گشتی و رەزامەندی گشتی وەرگرتوە؟)[2].

بۆیە گوتەکەی عومەر: (ئەوانی تر بکوژن کە پشتیان هەڵکرد لەوەی کە خەڵکی لەسەری رەزامەندە) هەروەها گوتەکەی تری (لەگەڵ زۆرینەدا بە) هەروەها گوتەی (لایەنی دەستەی زۆرینە بگرە)، هەروەها گوتەکەی عوسمان (ئەگەر پیاوماقوڵانتان بەزۆری لەسەر ئەوە کۆك بوون) هەموو ئەمانە ئەو بنەما بتشینەییە لەگوتاری سیاسی راشیدیندا پشتراستدەکەن، وەهەروەها پشتراستی ئەوەی کە راوێژ مافێکە بۆ هەموان).

---

[1] ابن جریر ٦٣٨/٢.

[2] ابن جریر ٦٥٠/٢.

**بنەمای شەشەم: هیچ راوێژێك بێ هەبوونی ئازادی درووست نییە:**

دیارە ئازادی لەسەر ئاستی باڵاترین شێوەی لە سەقیفە و لەو مشتومڕەو ناکۆکیەی کە بەرپابوو دەرکەوتوە، تەنانەت پشتیوانان دەیانوت: (لە ئێمە ئەمیر و لە ئێوەش ئەمیر) تەنانەت حەبابی کوڕی مونزیر هەرەشەی لەوانە دەکرد کە نیازی پێشێلکردنی مافی پشتیوانانی هەبێت، تەنانەت سەعدی کوڕی عوبادە توورە بوو، بۆیە کەس ڕێگری لە خستنەڕووی راوبۆچوونی جیاوازی خۆی نەبوو لەوێدا بەئاشکرا راگۆڕینەوە بەو ئازادی مشتومڕ دەکرا و تەنانەت لە سنووری ئەدەبی وتو وێژ دەردەچوو، هیچ کەسیش نارەحەت نەبوو بەوەی کە بۆچی ئەو رایەی وەرگرتوە بۆ وابیردەکاتەوە و هەڵوێست بۆ وادەنوێنێت، بەڵکو راگۆڕینەوەو مشتومڕ و راوێژ لەو پرسە مەترسیدارەدابە هەموو ئازادیەکەوە گوزەری کرد.

پاشان ئازادی سیاسی لەگە مافە بنچینەییەکانی گەلە لە رەخنەگرتن لەدسەڵات و پێشەواو سەرکردەکانی و هەوڵی راستکردنەوەیان و ئازادی رادەربڕین، هەروەها ئازادی لە گوتنی وشەی راستی. دیارە وەك چۆن مافی گەلە کە پێشەوا هەڵبژێرێت وەهاش مافیەتی بەشداری لە راوبۆچونەکانی بکات، هەروەها رەخنەی لێبگرێت و هەڵەی بۆ راستبکاتەوە و ئامۆژگاری بکات و بەرگیری لێبکات لە هەندێ سیاسەتی کەبەچەوتی دەزانێت، بۆیە ئازادی سیاسی یەکێك لە گرنگترین ئەو بنەمایانەیە کە گوتاری سیاسی راشیدین لەسەری وەستاوە، بۆیە دەبینین وێنە رۆشنەکانی لە ژیانی پێغەمبەرداو (صلّ الله علیه وسلّم)

سەردەمی خولەفای راشیدیندا (ر.خ) بەدەرکەوتوە. ئەوەش ڕەگوڕیشەکەی لەقورئاندا لە ئایەتی: (لا اكراه في الدين)[1] کە جەخت لەسەر پرانسیپی ئازادی بەهەموو جۆرەکانییە وە دەکاتەوە، ئەگەر خوای پەروەردگار بەندەکانی ناچار نەکات لەسەر هەرکردەیەك و لەسەر برواهێنان و ملکەچی بۆ زاتی خۆی مەگەر چۆن رێگە دەدات و رەزامەندە بە ملکەچی و ناچارکردنی کەسانی تر بێجگە لەخوا لەسەر بەندەکانی، کەئەمەش مانای (لا اله الا الله) دەگەیەنێت، چونکە خوای پەروەردگار تەنیا خوایەکە کە شایستە بە پەرستش و ملکەچیە لەبۆی، پاشان مرۆڤەکان هەر دروستکراوێکی تر هیچ ملکەچی و گوێرایەڵیەکیان بۆ نییە و ناچارکردن بۆ شتی وەها بێجگە لە سنورێك کەخوای پەروەردگار لە رێگەی شەریعەتەکەیەوە رەزامەندی نواندوە بەشیرك و هاوەڵدانان هەژماری کردوە، لەبەر ئەوە کۆمەڵێك دەق لەلایەن پێغەمبەری خواوە بە ئێمە گەیشتوون کە پرسی گوێرایەڵی یەکلادەکەنەوە بە گوێرایەڵی خواو شوێنکەوتنی رێنوینەکانی پێغەمبەرەکەی کە دەفەرموێت: (لا طاعة في معصية الله وانما الطاعة بالمعروف)[2]. هەروەها دەفەرموێت: (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)[3]بۆ جەختکردنەوە لەوەی کە مافی دەسەڵات و گوێرایەڵی پەیوەستە بەوەی کە دەبێت بۆ چاکەو چاکەکاری بێت، لەبەر ئەوە

---

[1] البقرة ٢٥٦.

[2] رواه البخاري ح رقم (٧١٤٥).

[3] رواه احمد٥/٦٦-٦٧ باسناد صحيح.

ئیسلام لەوەدا دەسپێشخەربوە لە هەموو یاساکانی تر بەوەی کە پەیوەستکردنی گوێڕایەڵی بۆ دەسەڵات بە یاساوە و سنووردارکردنی لەچوارچێوەی دەقەکاندا، تەنانەت هیچ پیرۆزیەك بۆبەرێوەبەرانی دەسەڵات بوونی نییە و هیچ ملکەچبوون و گوێڕایەڵبونێکیان بە رەهای بۆ نییە و بەڵکو لە چوارچێوەی دەق و ئەو یاسایانەدا کە خواو پێغەمبەرەکەی بۆیان دیاریکردوە، بۆیە لەکاتی فەرمانی بە ستەم و خراپە هیچ ملکەچیەك بۆ دەسەڵات نییە، بەڵکو رێگری لێکردنی پێویستە و دەبێت راست بکرێتەوە وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: (ئەوەی کە لادانێکی لەراستی بینی با هەوڵی گۆڕینی بدات بەدەستی، ئەگەر نەیتوانی بەزمانی ئەگەر نەیتوانی بەدڵ پێیناخۆش بێت )[1].

## بنەمای حەوتەم: هیچ راوێژو ئازادیەك بە بێ فرەیی سیاسی بوونی نییە

ئەم بنەمایە مەرجێکی پێویستە بۆ جێبەجێبوونی مانای راستەقینەی راوێژ و شورا، ناکرێت و مانایەکی نابێت ئەگەر خەڵکان کۆببنەوە دەست بکەن بە راوێژکردن لەسەر بابەتێك کەلەپێشدا ئەو بابەتە برابێتەوە و دیاریکرابێت، بۆیە کاتێك ئازادی و راوێژ واتایەکی راستەقینەی دەبێت کە بۆ خەڵکان هەبێت کە کێ و کام دیاری بکەن و هەڵیبژێرن، کامە کاندی رەزامەند دەبن و فلانەش رەزامەند نین و کەمتر

---

[1] رواه مسلم،ح رقم (٤٩).

لەوانی تر ئەریٚ وەرگرتنی بۆ مسەوگەر دەکریٚت، کە ئەوەشمان بینی لە سەقیفە کە پراکتیك کرا، کە پشتیوانان سەعدی کوڕی عوبادەیان هەڵبژاردو کاندیدی ئەوان بوو، خەریکبوو بەیعەتی بدەنیٚ، هەروەها ئەبوبەکر و عومەرو ئەباعوبەیدەش لە کاندکراوەکان بوون، دیارە بۆ گەل و ئومەت دەرگاکراوەبوو کەکیٚ خۆی کاندید بکات و وەکیٚ هەڵدەبژیٚریٚت بەوەی کە شایستە و ئەهلی پیٚشەوایەتیە، دەتوانیٚت ئەو بەرپرسیاریەتیە هەڵبگریٚت، ئەم کیٚبرکیٚ سیاسی و هەڵبژاردنە لەنیٚوان دوو هۆز و تاقمدا بوو، پشتیوانان و کۆچکەرەکان، کە لەناویاندا چوارکەس کەشایستە بەو کارە بوون هەڵبژیٚران دواجار گەل یەك دانە لەناو ئەوانەدا بە باشتری زانی و یەکلای کردەوە بۆ ئەو، ئەوەی کەدەیەویٚت ببیٚتە بریکاری راستەقینەی گەل بەرەزامەندی و بیٚ زۆرەملیٚ و ناچاری، لەسەر بونیادی ئەوەی کە لەراویٚژو مشتومڕی ئازادانەی هەمواندا یەکلا بوبویەوە، دیارە رۆژی سەقیفە واتای ئازادی و فرەیی و راستەقینە بوو نەك ئازادی و فرەییەکی روخساری.

تواناو هیمەتی کۆمەڵگەی موسڵمان بۆ فرەیی سیاسی لەپاش وەفاتی پیٚغەمبەر (صلّ الله علیه وسلّم) و کۆبوونەوەی هاوەڵان لە سەقیفە دەرکەوت، کۆچەرو پشتیوانان هەردوولا کیٚبرکیٚیەکی شەریفانەیان کرد بۆ بەدەستهیٚنانی پیٚشەوایەتی، تەنانەت حەبابی کوڕی مونزیر وتی (لە ئیٚمە ئەمیریٚك و لە ئیٚوەش ئەمیریٚك)بەلاٚم ئەنجامی ئەم مشتومڕو کیٚبرکیٚیە بە رەزامەندی هەموو لاو هەڵبژاردنی ئەبوبەکری صدیق بەکۆتاگەیشت، بۆیە موسڵمانان ئەوان مافیان هەیە

دیاری بکەن کە کێ شایەنی هەڵبژاردن و بریکاری ئەوانە، بۆیە پشتیوانان ئەو راستیەیان پەی پێبردوو بوو پێی گەیشتبوون کە ئەوە پێویش بە ریفراندۆم ناکات بەڵکو ئەوە زانیاریەك بوو بۆهەموو موسڵمانێك لەوکاتەدا، چونکە کەس گوێی لەکەسی تر نەدەگرت لەسەردەمی نەفامیدا بێجگە لە قورەیش چونکە خاوەنی خانەی خوا بوون.

## بنەمای هەشتەم: فرەیی دەسەبەرنابێت بە بێ رەواییپێدەرو دانپیانەرو بۆگەراوەییەك:

هەرگیز فرەیی و دساودەسکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات و ئازادی سیاسی واتایەکی نابێت تاوەکو بۆگەراوەییەکی یاسایی و دەستووری نەبێت تاوەکو لەسایەیدا ئەو پرۆسەیە رێکبخرێت، ئەو دانپیانان و رەواییەی کە دەسەڵات پێویستیەتی بۆ ئەوەی حوکمەکانی لە لایەن خەڵکی و گەلەوە جێبەجێبکرێن، بۆگەراوەییەك و مەرجەعێك لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بریتیە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر کە ئەوانە سەرچاوەی یاسادادانن، ئەو دوانە دەستورێکن کە فەرمانڕەواییتی لەدەقەکانیانەوە سەرچاوەگر بێت، ئیسلام پێش هەموو سیستم و فەلسەفە دانراوەکانی ئەم زەمینە کەوتوە لە چەسپاندن و دابەزاندنی پرانسیپی رەوایی کە هەموان پێی قایل بن بەبێ جیاکاری، فەرماندار و فەرمانبەسەرداکراو و دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن، هەموویان وەك یەك.

دیاره پرەنسیپی ڕەواییپێدان گەلان پەیبیان پێنەبردبوو تاوەکو پاش شۆڕشی فەرەنسە ساڵی ١٧٨٩زاینی، پێش ئەوە پادشا خۆی بریتی بوو لە دەوڵەتەکە و حکومەتەکە– وەك لویسی چواردەهەم پاشای فەرەنسا وتبووی مەگەر من دەوڵەت نیم بێگومان من دەوڵەتم– کەسرۆکایەتی و گەورەیی و دەسەڵاتی ڕەهای هەبوو هەموان ملکەچی وتەو فەرمانەکانی بوون بەڵام ئەو بۆ هیچ کەس ملکەچ و گوێرایەڵ نەدەبوو بەڵکو ڕەوایی هەریاسایەك لەناو ویستی ئەودا بوو ئەو (پاشا) دەریدەکرد ئیتر دەبوو هەموان پابەندبونایە پێوەیەوە لەو دەسەڵاتەی ئەودا، دیارە ئەوەش تووشی سزادەهات ئەگەر گوێرایەڵ و جێبەجێکاری نەبوایە، ئەوەش راڤەی ئەو ئایەتەو ئاگادارکردنەوەی فیرعەون لە موسا و بانگەوازەکەی کە (یذرك والهتك) کە بریتی بوو لەملکەچی و گوێرایەڵی و بەخودازانینی بەزۆر کە سەپاندبووی.

## پاراستنی مافی کەمینە:

هەموو ئەو ماف و ئازادیانە– کە پێشتر بە درێژی قسەی لەبارەوەکرا– وەك ئازادی رادەربرین، رەتکردنەوەی ستەم و چەوسانەوە، بەرگرتن لە هەرزۆردایی وپێشێلکاریەکی دەسەڵات، هیچ جیاوازیەك لەنێوان موسڵمانێك و ناموسڵمانێك بوونی نییە لە گوتاری سیاسی قورئانیی و پێغەمبەری و راشیدی، ئەهلی زیمە لەدەوڵەتی ئیسلامی هاوڵاتی تەواوی دەوڵەتەکەن و هەموو مافێکی تەواوی هاوڵاتیبونیان بۆ دەسەبەردەکرێت و چەمکی (ئەهلی زیمە) چەمکێکی

ڕێزداریە کەتیایدا واتای ڕێزگرتن و پێزانین و سەنگی مرۆڤدانە بەوانەی کەلە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا لە ناموسڵمانەکان دەژین، وشەی (زیمە) لە خۆگرتنەوە هاتوە کە بریتیە لە حورمەت وگرەنتی بەخشین بەژیان و ڕێزی ئەوان، کە ئەوان لەزیمەی خوا و پێغەمبەرەکەیدان، هەر ئەوەش حاڵی موسڵمانە وەك لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە (ئەوەی نوێژی وەك ئێمە بکات و ڕووگەی ئێمە ڕووگەی بێت ئەوە موسڵمانە، کە لە زیمەتی خواو پێغەمبەرەکەیدایە، غەدر مەکەن لەوەی کە لە زیمەتی خوادایە.)[1] و ئیسلام ئەوەی کە هاتە ناوی و موسڵمان بوو ئیتر لە زیمەی خواو پێغەمبەرەکەیدایە، و ئەوە ئیتر لەژێر چاودێری ئەمانی دەوڵەتی ئیسلام و دەسەڵاتیدایە پارێزراوە، بۆ کەس نییە دەستدرێژی بکاتە سەرژیان ومالْ و ناموسی، نمونەی ئەمەش ئەو نوسراوەی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) بۆ هەموان و خەڵکی یەمەن نوسیبووی (ئێوە ئەگەر باورتان هێنا و شایەتمانی (لا اله الا الله و محمد رسول الله) وت و نوێژتان کردو زەکاتتان بەخشی، ئەوە ئیتر لەزیمەتی خواو پێغەمبەرەکەیدان و خوین و مالْ و سامان و زەویتان پاریزراو دەبێت و هیچ ستەمێك لە ئێوە ناکرێت و هیچ پەستان و ناچارکردنێك روو لەئێوە ناکات)[2].

لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە سەبارەت بە خەڵکی زیمە لەوانەی موسڵمان نابن، (ئەوەی هاوپەیمانێك بکوژێت ئەوە بۆنی بەهەشت

---

[1] صحیح البخاری ط البغا رقم ٣٨٤.

[2] ابن ابی شبة فی المصنف ٣٤٧/٧، والطبراني في المعجم الكبير ٥٠/١٧ واسناده حسن.

ناکات)[١]. له دەستەواژەیەکی تردا هاتوە (ئەوەی کە هاوپەیمانێك کە لە زیمەی خواو پێغەمبەرکەیدا بکوژێت ئەوە دەستدرێژی بۆ سەر سنوری خوای گەورەی کردوە لەدوورەوە بۆنی بەهەشت ناکات)[٢]. له فەرمودەیەکی تردا هاتوە: (ئەوەی ستەم له هاوپەیمانێکمان بکات، یان پەیمانەکەی بشکێنێت بە ستەم، یان شتێکی بخاتە سەرشانی کەلە توانای ئەو بەدەر نییە، یان شتێکی ببات بە بێ حەزو ئارەزووی خۆی، ئەوە من یەخەگری دەبم لەرۆژی دواییدا، پێغەمبەری خوا لەوکاتەدا ئاماژەی کرد بەپەنجەی بۆ سەرسنگی بزانن ئەوەی هاوپەیمانێکمان بکوژێت ئەوە زیمەی خواو پێغەمبەرەکەیەتی کە حەرامکراوە لەسەریەتی بەدووریش بۆنی بەهەشت ناکات)[٣].

موسڵمانان له زیمەتی خواو پێغەمبەرەکەیدان بە وەی کەباوەریان هێناوە پەیمانی باوەریان بەستوە، هەرچی ناموسڵمانەکانیشن لە زیمەتی خواو پێغەمبەرکەکیدان بە بەستنی پەیمانی (دڵنیایی– ئەمان) لەبەر ئەوە شەرعناسان ڕێسایەکیان بریارلەسەرداوە ئەویش: (ئەوەی بۆ ئێمە بێت بۆ ئەوانیشە، ئەوەی لەسەر ئێمەشە لەسەر ئەوانیشە)[٤] وەك لە ئیمام عەلی یەوە هاتوە کە فەرمویەتی: (ئەوەی لە زیمەتی ئێمەدابێت ئەوە خوێن و خوێنبایی هەمان خوێن و خوێنبایی ئێمەی

---

[1] صحيح البخاری رقم ٢٩٩٥.

[2] الترمذی فی الجامع الصحيح رقم ١٤٠٣.وقال حديث حسن صحيح.

[3] ابو داود فی السنن رقم ٣٠٥٢.والبيهقي في السنن ٢٠٥/٩ باسناد حسن.

[4] رواه الشافعي في الام٥٢٣/٧. والدرقطني ١٤٧/٣ وضعف الاسناد.

هەیە) لە ریوایەتێکی تردا هاتوە (ئەوان بۆ یە سەرانە (جزیە) دەدەن بۆ ئەوەی خوێن و ماڵیان وەك خوێن ماڵی ئێمەبێت)[1].

عەرەفەی کوڕی حارس (ر.خ) مافەکانی خەڵکی زمەی لەدەوڵەتی ئیسلامیدا دیاریکردبوو دەیوت: (ئەوەی کە باج و سەرانە لە ئەهلی زیمە لەوان وەردەگیرێت بۆ ئەوەیە وازبهێنرێت لەخۆیان و پەرستگایان کەچی تیا دەڵێن و دەیکەن و دەیپەرستن و ئەنجامی دەدەن، بۆ ئەوەی ئەوەیان نەخرێتەسەر شان کە لەتوانایاندا نییە، ئەگەر دوژمنێك هاتە سەریان ئێمە پشتگیریان بکەین و شەڕیان بۆ بکەین و پشتیان بەرنەدەین، وازیان لێ بهێنین لەوەی لەنێوان خۆیان و ئەحکامەکانی خۆیاندا هەیە، مەگەر ئەوانەیان بێن و رازی بن بەو حوکمانەی ئێمە ئەوکات ئێمەش بەو حوکمانەی خواو پێغەمبەرەکەی مامەڵەکەیان بۆ بەحێدەگەیەنین، هەرشتێکیش لە ئێمە شاراوەبوو ئەوە بەرچاومان نەخستوە، عەمری کوڕی عاص فەرمووی راست دەکەی)[2]. ئیمامی شافیعی لە واجبی ئەدەب نواندن بەرامبەر ئەهلی زیمە کاتێك کەسەرانەو جزیەی لێوەردەگیرێت دەفەرموێت: (ئەگەر باج و سەرانەیان لێوەرگیرا ئەوا بەشێوازێکی جوان و بەئەدەبەوە لێی وەردەگیرێت، هیچ کەس لەوان ناتۆرێنن و لێیان نادەن، هیچ وەخت قسەی رەق و لەسەردڵ قورس بەرامبەریان ناکرێت، وشەی (صغار) واتای پیادەکردنی حوکمی

---

[1] رواه البخاری فی التاریخ الکبیر ١٠٩/٧. وقال الحافظ ابن حجر في الاصابة ٣٤٤/٥ اسناده صحیح.

[2] رواه البخاری فی التاریخ الکبیر ١٠٩/٧.

ئیسلامە نەك بچوککردنەوە و بەلێدان ئازاردبرێن، بۆیە لەسەر ئێمەیە کە بەرگری بکەین لە ئەهلی زیمە – واتە بیانپاریزین– مادام لەناوماڵێکدان لەگەڵماندان ئەو ماڵەی ئەوان حەڵاڵ کراوە بۆیان تەمویلی تیابکەن و وەبەرهێنانی پێوە بکەن، ئەوەی خۆمان و ماڵمان لێی دەپارێزین بۆ ئەوانیش لەسەرمانە بەهەمانشێوە بکەین ئەگەر خۆیان ویستیان بەرامبەر دوژمنەکانیان بینەوە لەسەریان یان هەرستەم و ستەمکاریەك هاتە بەردەمیان و لایان بدەین و رزگاریان بکەین، هەرچی لەتوانامان‌دا هەبوو لەوبارە، ئەگەر لەو پاراستن و پشتیوانییە دا هەرماڵ و سامانێکیان هەبوو حەلالە بۆمان بەکاری بهێنین بەویستی خۆیان بێجگە لە مەی و بەراز.. خوای گەورە دەفەرموێت: (حتى يعطوا الجزية عن يد وهم صاغرون) شافیعی دەڵێت: بیستم لە هەندێك زانایانی گەورە کە دەیانفەرموو (صاغرون) واتە کە حوکمی ئیسلام بەسەریان جێبەجێ ببێت)[1].

گومانی تێدا نییە کە شافیعی پێشەواو زانایەکە کەوتەکانی دەبنە بەڵگە لە زمان و شەرعناسیدا سەبارەت بەو ئایەتەی ئەهلی زیمە (حتى يعطوا الجزية عن يد وهم صاغرون) وا راڤەی دەکات، کە مانای بچووك تەماشەکردن و ئازاردانیان نییە، بەڵکو (صاغرون) لای ئەو مانای (طائعون وخاضعون للسلطة الدولة الاسلامية) دێت کە ئەوان ملکەچی لەو یاساو چوارچێوە گشتیانە بکەن کە دەوڵەتی ئیسلامی بۆ ئەوانی

---

[1] الام للشافعي ٤/٢٩٣–٢٩٤.

دیاریکردوه، ئاخر چۆن دەکرێت لە لایەکەوە واجب بێت موسڵمانان خوێنی خۆیان ببەخشن لەپێناو ئەواندا کاتێ مەترسی دوژمن و شەڕیان هاتە سەرو بەپێی شەرع لە زیمەتی خواو پێغەمبەردابن و خوێن و ماڵو ناموسیان وەك هی موسڵمانان هەژمار بکرێت؟ کەچی لەولاوە ئەوەندە بێزراو سوك تەماشا بکرێن و ئازار بدرێن و قسەی بێجێ و ناشیرینیان پێ بوترێت؟؟!

بەڵام ئەگەر کۆمەڵێکی لەرێدەرچوو دژی دەسەڵاتی ئیسلام راپەڕی و ئەهلی زیمە هاوکاری ئەوانی کرد ئەوکات جیاوازی لە نێوان ئەوانەی راپەریون و ئەوانەی ئەهلی زیمەن ناکرێت کە چوون لەگەڵیان دەجەنگن، ئیمامی سەرەخسی لەوبارەوە دەڵێت: ئەگەر خەڵکی لەرێدەرچوو پشتیوانیان وەرگرت لە ئەهلی زیممە لە شەڕو جەنگدا ئەوا پێویستە لەگەڵ ئەوانیشدا بجەنگن، ئەوکاتە ئەوجەنگانە لەگەڵ ئەهلی زیمە ناچێتە قاڵب و کەستەکی شکاندنی پەیمانی زیمە لەلایەن موسڵمانانەوە، وەك چۆن ئەوانیش لەپەیمان و زیمەیی خۆیان دەرنەچوون، چونکە کاتێك شەر لەگەڵ موسڵمانە یاخیبوەکانی لەدەسەڵات دەکرێت لەبەر یاخی بوونیانە بۆ ئەوانیش بەهەمان شێوە چونکە لەبابەتی یاخی بوون دا وتراوە دوو تاقمەکە تەنانەت بەناوی بروادرانی یاخیبوو ناویان هاتوە لەقورئاندا کە دەفەرموێت: (وان طائفتان من المؤمنين اقتتلوا)، هەروەها ئیمامی عەلی دەیفەرموو: (براکانمان یاخی بوون لێمان) ئەوانەی لە ئەهلی زیممە پەیوەندیان بەوانەکرد بەوە دەرنەچوون کە ئیتر کۆتاییان بەو پابەندیەیان هێناوە

به حوکمەکانی ئیسلامەوە لە بواری مامەڵەکاندا، هەروەها لەناو داری ئیسلام دا بە خەڵکی دارولئیسلام هەژمار نەکرێن، چونکە ئەوکارەیان – یاخیبون لەگەڵ تاقمێکی یاخی بڕواداران– و– هەرگیز لەپەیمانە پێشونەکەیان و ئەهلی زیمە نایانکاتە دەرەوە، بەڵام جەنگیان بەرامبەر دەکرێت لەبەرامبەر ئەوەی لەژێر چەتری ئەواندان کەیاخی بوون، حوکمیان وەك هەرحوکمێکی یاخیبوی موسڵمانە بۆیە پێویستە بۆ ئەهلی دادگەر کە دەستیان گەیشتە ئەهلی یاخیبوو داوای گەرانەوەیان بۆ ئاشتی و دادگەریان لێ بکەن)[(١)].

هەروەها ئەگەر ئەهلی زیمە راپەرین دژی دەسەڵاتی چەوسێنەرو ستەمکار، ئەوە هەمان حوکمی موسڵمانانیان بۆ دەکرێت کە دژی ستەم و جەور رادەپەرن کە کوشتنیان وەك کوشتنی موسلمان وایە، نابێت بچنە جەنگەوە لە دژیان، ئیبنو تەیمیە دەفەرموێت: (ناکۆکی و جیاوازیەك لەنێوان زانایانی سوننەتدا نییە کە خەوارجەکان دەجەنگان لەگەڵ پێشەوای دادگەر غەلی کوری ئبەو تالیبدا (ر.خ)، بەڵام ئایا دەجەنگان لەگەڵ دەسەڵاتداران و سەرانی ستەمکاردا؟ لە ئیمام مالکەوە هاتوە کە ئەوان نەجەنگاون، بەوشێوەیەش وتی هەرکەسە پەیمان لەگەڵ ئەهلی زیمە بشکێنێت، ئەوا ناجەنگن لەگەڵ سەرانی ستەمدا)[(٢)].

---

[1] المبسوط٦/١٣٨.

[2] الفناوی ٦/١١٦.

## بنەمای نۆیەم: رەخساندنی فەزای دادگەری و گرەنتی یاسایی بۆتاکەکان:

لە گوتاری قورئانی و پێغەمبەرایەتیدا بە بە باشترین شێوەی گرەنتیکراوی دادپەروەرانە مافی تاکەکان و کۆمەڵەکان فەراهەمکرابوو بەنموونەش:

**یەکەم: مافی دادگاییکردن و بەرزکردنەوەی بریار بۆدادگا:**

هیچ کەس رێگری لێنەکراوە لەوەی کە ئەگەر سکاڵاو داوایەکی لەسەر هەرکەس هەیە نەیکات، لەنێوان ئەوو چوونی بۆ دادگا بۆ هەڵگرتنی ستەم لەسەری هیچ کەسێك بەرگریی لێناکات، ئەگەر ئەو سکاڵایەش لەسەر پێشەوا یان پیاوانی دەسەڵات بووبێت، ئەوەش کۆرای لەسەرە، بۆ ئەوبەڵگە برێنەرەوانەی کە لە قورئان و سوننەتدا کە حوکمکردن بەدادگەری لەنێوان خەڵکیان خواستوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وان احكم بينهم بما انزل الله ولا تتبع اهوائهم)[1]. هەروەها دەفەرموێت: (وان حكمت فاحكم بينهم بالقسط)[2]. هەروەها (فاحكم بينهم بما انزل الله)[3].

[1] المائدة ٤٩.

[2] المائدة ٤٢.

[3] المائدة ٤٨

**دووەم: مافی دابینکردنی گرەنتی بۆ تۆمەتبار:**

لەو مافانەش حەرامکردنی سزادان وەك لە وتاری حەجی ماڵئاواییدا لە پێغەمبەرەوە (صلّ الله علیه وسلّم) بە موتەواتری گەیشتوە کەیتیایدا هاتوە: (ئێوە خوێنتان و ماڵتان و ناموستان و پێست و جەستەتان لەسەر یەکتر حەرامە)[١] دیارە بوخاری بەشێکی لەوبوارەدا جوێکردوەتەوە بەناوی پەراوی (پشتی بروادرا پارێزراوە لە زیان و ئازار تەنها لەحەدد و مافدا نەبێت)[٢]. لە فەرمودەیەکی صەحیحی تردا هاتوە (دوو تاقم هەن، لەخەڵکی ناو ئاگرن، ... پیاوێك کە قامچیەکی بەدەستەوەیەو دەدات لەخەڵکی پێی.)[٣].

هەروەها لە عومەر دەگێڕنەوە وتویەتی: (پیاو لەخۆی ئەمین و دڵنیانییە کاتێك ئازارت داو یان ترساندت یان زیندانیت کرد، یان شتێ بخرێتەگەردنی کە ئەنجامی نەدابێت)[٤]. لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: (پیاو لەخۆی ئەمین و دڵنیا نییە کاتێك ئازارت داو یان ترساندت یان زیندانیت کرد)[٥].

---

[1] رواه البخاري ح ٧٠٧٨ وانظر كتاب الحخ باب ١٣٢ الخطبة ايام منى ومسلم ح ١٦٧٩.

[2] رواه البخاري ح٦٧٨٥ الحدودباب ٩.

[3] مسلم خ ٧١٩٤.

[4] الخراج للقاضي ابويوسف ١٧٥ باسناد هحيح عن عمر.

[5] ابن ابي شيبة في المصنف ٤٩٣/٥ رواه البخاري في تاريخ الكبير رقم ٢٣٦٦ باسناد صحيح عن عمر.

**سێیەم: دانان و هەژمارکردنی هەڵگەرانەوەی دانپیانەر لە گفتە پێشینەکەی وەك ئەگەرێك بۆ لادانی لەسزا:**

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) داوای دەکرد لەگفتداری دانپیانەر و پێی دووبارەدەکردەوە بەوەی کە ئەو گوفتەی داویەتی لەسەر ئەو تاوانە گوایە کردوویەتی پێی دەوت هەڵبگەرێتەوە تاوەکو سزای لەسەرنەدات و دووری بخاتەوە لێی، بەڵام مافی خاوەنانی مافەکە لەسەری هەڵناگیرێت ئەگەرچی دانی پیاناوە، بۆنموونە ئەگەر کەسێك دانی نا بەوەی دزی کردوە پاشان هەڵگەرایەوە لە گفتەکەی، ئەوە سزای دزیەکەی لەسەر هەڵدەگیرێت، بەڵام گەڕاندنەوەی ماڵە دزراوەکە کەدانی ناوە پیایدا پێویستە لەسەری بگەرێتەوە بۆ خاوەن ماف[1].

چوارەم: شەریعەتی ئیسلامی یەکەم و دەسپێشخەر بوە لەوەی کە بریاری داوە کە هیچ شتێك تاوان نییە و سزای لەسەر نادرێت ئەگەر دەقێکی لەسەر نەهاتبێت، هیچ کاتێکی دادگا هیچ بریارێکی بەسەردا نادات تاوەکوو لەسەر تۆمەتبار ساغ نەکرێتەوە کە تاوانی ئەنجام داوە، وەك لەفەرمودەدا هاتوە: (حەڵاڵ نییە خوێنی هیچ کەسێك برێژرێت تا سێ شت ساغ نەبێتەوە) لە فەرمودەیەکی تردا (پشتی بروادرا پارێزراوە لە زیان و ئازار تەنها لەحەدد و مافدا نەبێت)[2] لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتوە: سزا نییە لە دە شیلاق زیاتر تەنها لە (حەد ێك دا کەخوای

---

[1] اوانظر الخراج ٧٦.

[2] اخرجه الطبراني من حديث عن عصمة بن مالك وابوالشيخ من حديث عن عائشة، وكلا الحديثين ضعيف ولهما شاهد من حديث ابي امامة كما في فتح الباري ١٢/٨٥.

گەورە دیاریکردوە)[1] نەبێـت. لە عومەرە وە دەگێڕنەوە دەڵێت: (پشتی موسڵمانان پارێزراوە، بۆ کەس حەڵاڵ و ڕەوانییە، مەگەر خۆی پشتی ڕووت بکات بەتاوانێکی حەد)[2].

(سزا حدودیەکان، سزایەکی دیاریکراون بەدەق بۆ هەندێ تاوانی دیاریکراو لەڕووی وەصفیەوە، هیچ زیادکردنێك بۆ سەریان نییە، وەك ئیبنو عەبدولبیڕ دەڵێت: (نەبوونی دەقێك لەسەر تاوانێك بەحوجە هەژمارە لەسەرئەوەی (تەمێکردن– التعزیر)ی بەگوێدانەدرابوو لە ڕووی ژمارەو هەروەها ئازارپێگەیاندنی، کەسایەتی و ناموسی موسڵمان و خوێنی قەدەغەو یاساغن بەهەموو شێوەیەك تا ئەوکاتە نەبێت کە یەقین و دڵنیاییەك هەبێت، وەك ئەوەی لەپێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) ریوایەتکراوە دەفەرموێت: (هیچ یەکێك زیاتر لە قامچی زیاتری لێنادرێت تا حەدێك لەحدودەکان کەخوای گەورە دیاریکردوە بەسەریدا ساغ نەبێتەوە)[3].

ئیمامی شافیعی دەڵێت: ئەحکامەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلّ الله علیه وسلّم) بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە هەرگیز حاکم حوکم لەسەر گومان نابێت بدات، ئەگەرچی بەڵگەی نزیکی بەردەست بێت، بۆیە حوکم نادرێت تائەو کاتە نەبێت کەخوای گەورە فەرمانی کردوە بەرۆشنکردنەوەی داواکار نەبێت، یان لەلایەن

[1] صخیخ البهاري رقم ٦٤٥٧ و مسلم ؤقم ١٧٠٨.

[2] رواه عبدالرزاق في المصنف ٤١٣/٧ باسناد حسن صحیح.

[3] التمهید ٣٢٩/٥.

ئەنجامدەریەوە خۆی دان بنێت بەتاوانەکەدا، هەروەها ئەوەی حوکم دەدات زیاتر لەسەر ئەوبەڵگە خراوەڕوانە کاردەکات و روخساریانەیە، هەورەها حوکمدان لەسەر ئەوەی لەبەرچاو خراوە و لەسەر ئەوە دەدرێت و لەسەریەتی)[1].

**پێنجەم: چاودێریکردنی زیندانیان و فەراهەمکردنی پێداویستیەکانیان.**

پێویستە لەسەر بەیتولمال کە پێداویستیە سەرەکیەکانی ژیانیان لەخواردن و خۆراك و پێداویستی ژیان لە تەندروستی و ئاوهەوای و ژینگەی تەندروست و چارەسەرو هەرشتێك لەو ژیانی زیندانییەیەدا پێویستیان لەسەر دەسەڵات و بەیتولماله بۆیان خەرج بکات[2].

شەشەم: دیاریکردنی ماوەی زیندانیکردن

پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) هیچ کەسی زیندانی نەکردوە لەسەر تۆمەت یەکجار نەبێت کە شەوو رۆژێك کەسێکی زیندانیکرد، کە پێعەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (زیندان)ی نەبوو، هەروەها خەلیفەی راشیدین بەهەمان شێوە، ئیبنو قەیم لە ئیبنو تەیمیەوە هێناویەتی و دەڵێت: (ئەحمەد دەڵێت پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیه وسلّم) لەسەر تۆمەتێك، کەسێکی زیندانی کرد ئەحمەد وتی: ئەوەش بۆ ئەوەبوو کە بۆ حاکم رۆشن بێتەوە کارەکەی، لە (جامع الخلال) هاتوە کەپێغەمبەر

---

[1] الام للشافعي ٤٩٢/٧.

[2] الخراج ١٧٦ وانظر الحرية ابو الطوفان ص٢٣٥.

(صلّ الله عليه وسلّم) كه كەسێكی شەوو ڕۆژێك زیندانیكردوە لەسەر تۆمەتێك، كۆڕایی لەسەر نەماكانی هەیەو هەروەها پێشەوایانیش كۆكن لەسەر ئەم ڕاستیە.. زیندانی شەرعی بریتی نییە لە زیندانیكردنی لەشوێنێكی تەنگەلان و تەسك، بەڵكو ئەوەیە كەبەرگیری لێبكرێت ئەو مرۆڤە كە ڕەفتار بۆ خۆی ئەنجام نەدات، یاخود بەوەكالەتی كەسێك كە بتوانێت پابەندی بكات و ئامادەی بكات، ئەوە زیندانی بوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیەوسلّم) و ئەبوبەكردا،.. لەبەر ئەوە زانایان مشتومڕیانە لەسەر ئەوەی ئایا پێشەوا دەكرێت زیندان دابنێت و خەڵك زیندانی بكات دەبن بەدوو بەشەوە: ئەوانەی دەڵێن نەخێر نابێت زیندان دابنرێت، دەڵێن پێغەمبەری خوا زیندانی نەبووە، خەلیفەی دوای ئەویش ئەبوبەكر نەیبوە، بەڵكو بەرگیری لێكراوە لەشوێنێكدا كەكەسێك تیایدا پارێزەری بوە – واتە ڕەبتی كەفیل كراوە– پاشان جیاوازیان لەسەر ئەندازەی زیندانییە كە عیە لەسەر تۆمەتەكەی، زۆبەیری دەڵێت بە مانگ دیاری دەكرێ، ماوەردی دەڵێت ئەندازە نەكراوە)[1].

دیارە زیاترین هەڵبژێراوە كە ئەوەش ئەوەیە كە مەزهەبی مالك لەسەری ڕۆیشتوە، كە پێی وایە سێ تا چوار ڕۆژ زیندانی بكرێت، بەڵام لەوە زیاتر نەكرێت. لە دەقی شەرعناساندا هاتووە كە ئەوەی كە بەرپرسیارێتی لێپێچینەوەی تاوانە (والي الجرائم) كە بەرامبەر داواكار و لێكۆڵەری گشتی لە سەردەمی نوێدا– ئەو لە دەسەڵاتیدایە كە دادوەر

[1] الطرق الحكمية في السياسة الشرعية ١٠١–١٠٢.

ئەوەی نییە وەك هاتوە لە (التبصرة): (خێراکردنی زیندانی تۆمەتبار– واتە ئەوەی گومانی تاوانی لەسەرە و ناسراوە بە تۆمەتبار، دیارە هەموو تۆمەتبارێك مەرج نییە لە ئەهلی تاوان بێت– بۆ خستنەڕوو داوای بەری بوون– واتە زیندانی لەسەر زیمەی لێکۆڵینەوەیە– ماوەکەی یەك مانگ یان بەپێی ئەوەی کە دادوەر تەماشەی دۆخەکەی دەکات)[1].

سەبارەت بەداخوازی خوێن دەڵێت: (ئەوەی سکاڵای لەسەرکراوە تۆمەتبار بوو ئەوا بۆ ماوەی ١٥ڕۆژ بۆ مانگێك زیندانی بکرێت، بەڵام ئەگەر تۆمەتبار نەبوو بەتاونێك دووڕۆژ یان بەو دەورەدا)[2].

هیچ کەسێك لەسەر پرسی قەرز یان لەسەر مافی دارایی ناگیرێت ئەگەر تەنگەتاو و دەست تەنگ بوو، بەدەقی قورئان کەدەفەرموێت: (فان کان ذوا عسرة فنظرة الی میسرة)[3].

ئیبنو قەییم دەڵێت: ئەوەی ئاماژەی بۆبکات لە قورئان و سوننەت و ڕێسا شەرعیەکان، کە زیندانی ناکرێت لەسەر ئەو بابەتە، مەگەر لەکاتی دەرکەوتنی ئاماژەو پاساوێك کە موماتەڵە و کاری فریوی دواخستنی هەیە، ئەوکات زیندانی وەك سزایەك وایە، ئەوکات ڕێگا پێویستەکانی بۆ دەگیرێتەبەر کاتێك لە هۆکارەکانیان کۆڵیەوە، پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیە وسلّم) فەرموویەتی سەبارەت بەو کەسە موفلیس و بێ دراوەی کەتوانای دانەوەی قەرزی نەبوە (ئەوەی دەستان کەوت لێی کە هەیەتی

---

1 تبضرة الحكام ٢/١٤٩–١٥٠.

2 تبضرة الاحكام ٢/١٥١

3 البقرة ٢٨٠.

وەری بگرن بۆ ئێوە لەوە زیاتر شتی تر تان بۆ نییە) ئەمەش ڕۆشنە کە بۆیان نییە زیندانی بکەن و یان پابەندی شتێکی بکەن کە لەتوانایدا نەبێـت، پێغەمبەری خوا (صلّ الله علیە وسلّم) بەدرێژایی دەسەڵاتی لەسەر قەرزاری کەسی زیندانی نەکرد، نە ئەبوبەکر و نە عومەر و نە عوسمان و نە عەلی، ئیمام عەلی دەفەرموێت لەوبارەوە: کەس لەسەر قەرزاری زیندانی ناکرێت چونکە ئەوە ستەمە، ئەوەش حوکم و بریارێکە کە کۆرای جەماوەری ئومەتی لەسەرە[1].

[1] الطرق الحطمية ٣٦-٦٣ بتصرف واختيار.